

# کاریگەرییەکانی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان بۆ سەر کوردستان

ڕەسوڵ ئیبراهیم ڕەسوڵ

# کاریگەرییەکانی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان لەسەر کوردستان

## لەماوەی نێوان هەردوو سەدەی(٤-٨ک/١٠-١٤ز) دا

## (توێژینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە)

# کاریگەرییەکانی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان لەسەر کوردستان

## لەماوەی نێوان هەردوو سەدەی(٤- ٨ک/١٠- ١٤ز) دا

## (توێژینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە)

ڕەسوڵ ئیبراهیم ڕەسوڵ

سلێمانی
٢٠١٣

# کاریگەرییەکانی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان لەسەر کوردستان
## لەماوەی نێوان هەردوو سەدەی(٤- ٨ک/١٠- ١٤ز) دا
### (توێژینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە)


❖ نووسەر: ڕەسوڵ ئیبراهیم ڕەسوڵ
❖ بابەت: لێکۆڵینەوە
❖ پیتچنی: نووسەر
❖ هەڵەچنی: چۆمان عادل
❖ نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
❖ نەخشەسازیی ناوەوە: بەختیار ئەورەحمان
❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
❖ قەبارەی کتێب: ٢٣×٣٣
❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٦٣)
❖ تیراژ : (٥٠٠) دانە
❖ چاپ: چاپخانەی لەریا
❖ نرخ: (٤٠٠٠) دینار
❖ ژمارەی سپاردنی (١٥١٠)ی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

# پێشکەش

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:

* گیانی فریشتە ئاسای دایکم، کە بە میهری ئەو پێم گرت وکـۆی خۆشیەکانی ژیانیشم بە پاڕانەوەکانی ئەو دەزانم.

* بە هاوسەری بەڕێزم و سێ سۆمای چاوانم (ڕەوێن ، ڕێنوار ، ڕاز ).

* بەو کەسانەی کە ئەفلاتون وتەنی: (هـاوڕێ ی زۆرم هـەن، بـەڵام بەشێکی کەمیان برامن)

بە هەموو ئەوانەی کە بەبراو خۆشەویست ودڵسۆزی خۆمیان دەزانم.

## سەرنج:

لەبنچینەدا ئەم کتێبە نامەیەکی ماستەرە، پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆلیـــژی ئـــەدەبیات/زانکـــۆی ســـەلاحەددین کـــراوە، لەبەرواری(٩/١٠/٢٠١٠ز) بە سەرپەرشتی بەرێز(پ.ی.د.قادر محمد حسن)، بـەڵام ئـەوەی جـێ ی ئاماژەیـە لێـرەدا دوو بابـەتی بـۆ زیادکراوە.

# پێشەکی

ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە بەشێکی مێژوو پەیوەندی بە ململانێ جۆراوجۆرەکان و شەڕو لەشکرکێشیەوە هەیە، وەك بەیەکدادانی چەکدارانە لە نێوان دەوڵەتانداو ئامرازێکن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان هێزە سیاسیەکان و تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و ئاواتی ڕامیاری یان هەرێمی[1]، وەك دیاردەیەکی هەمیشە ئامادەیی ناو مێژوو تەنها پێکدادانێکی سەربازی نییە و دەکرێت لێکدانەوەی جیاجیای بۆ بکرێت و لە کایە جیاوازەکانی دیدا شوێنی زیاتری بۆ تەرخان بکرێت، چونکە لە داوێنی هەر شەڕو لەشکرکێشیەکدا دەکرێت کاریگەری و شوێنەواری جیاوازی لەسەر تاك و کۆمەڵگە و پێکهاتەی سیاسی و بارودۆخی ئابووری لێبکەوێتەوە، وەبارودۆخێك بێتە ئاراوە کە لە سروشتی پێش خۆی جیاوازبێت.

گومانیشی تێدانیە کە شەڕ بۆخۆی لە سەرێنی زەمینەیەکی تایبەتدا هەڵدەگیرسێت و لەداوێنیشیدا ئایندەیەك پەیدا دەبێت، بەوەش ئەڵقەیەکی زنجیرەیی مێژووی پێکدەهێنێت کە پەیوەندی ڕابردوو و داهاتووی خۆی هەیە، ڕاستەقینەیی سەنگ و بەهاو کاریگەری و پێگەشی لە ڕاڤەکردن و تێڕوانینی ئەوانەوە بەدیار دەکەوێت[2]، زیاتر لەوەش هەندێ توێژەر شەڕ بەباوکی داهێنانەکان دادەنێن، کە

---

[1] وهبه الزحيلي، اثار الحرب في الفقه الاسلامي دراسة مقارنة ،دار الفكر، ط٢، (دمشق:١٩٩٨)، ص٣٥.

[2] محەمەدئەمین عەلی عەبدوڵلا ،شەڕی گۆگامێلا(٣٣١پ.ز)، توێژینەوەیەکی مێژوویییە لە هۆکارو دەرئەنجامەکانی، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی،(سلێمانی:٢٠١٠ز)، ل١٤.

بەهۆیەوە بەربەستی بەردەم تێکەڵاوبوونی ژیارەکان دەشکێت و مەیدانێکی فراوانتریان لەبەردەمدا دەکرێتەوە[٣]، زۆربەی ژیارە جیاوازەکانیش بەهۆی شەڕەوە لە مێژوودا ئاوێتەی یەك بوون.

هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی و سروشتی دەوڵەمەندی کوردستانیش وای کردووە بێتە جێگای چاوتێبڕینی هێزە داگیرکەرەکان، وەك ئەوەش مێژوویەکی دوور و درێژمان لەگەڵ پرۆسەی لەشکرکێشی هێزی بێگانەدا هەیە، چ ئەوانەی بەتایبەت ئەنجامدراون یان لە میانەی هێرشکردنە سەر جیهانی ئیسلامی کوردستانیشیان وەك بەشێك لەو جیهانە گرتۆتەوە، شوێنەواری زۆرێك لەو لەشکرکێشیانەش ئەوەندە دیارو بەرچاوون کە دەهێنێ و گرینگە بۆ وانە لێوەرگرتن و لەبەرچاوگرتنی خاڵە بەهێزو لاوازەکانیان، لە جیاتی ئەوەی کە وەك باوە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی تردا بەکورتی ئاماژەیان پێبکرێت، دەشێ گۆشەی تایبەتی شیکارکردنیان بۆ تەرخان بکرێت و وەك بابەتی سەربەخۆ لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکرێت، زەمینەی سەرهەڵدان و دەرهاویشتە جۆراوجۆرەکانیان شرۆڤە بکرێت.

لەو میانەیەشدا ڕەنگە ماوەی نێوان سەدەکانی (٤-٨ك/١٠-١٤ز) قۆناغێکی هەستیار بێت لە مێژووی کورددا، بەهۆی زۆری پرۆسەی ئەو لەشکرکێشیانەی کراونەتە سەرکوردستان (ناوچەکوردنشینەکان) لەلایەن هێزە موسوڵمان و ناموسوڵمانەکانەوە ئەمەش وەك پرۆسەیەکی درێژخایەن دێنە بەرچاو، وە دیمەنێکی پڕ لە بەربەرەکانی لە ڕابردووی خۆیدا هەڵگرتووەو ئاییندەیەکیشیان هێنایە بوون کە جوگرافیای زۆر چەمکیان ئاوێتەی گۆڕان کرد، بە جۆرێك کە تا ئێستاشی لەگەڵدابێت جێی سەرنجی توێژەران و پسپۆڕانی ئەو بوارەیە، بۆیە دەکرێت، لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا کاریگەری و شوێنەوارەکانی بخرێنە ڕوو، ئەوەی ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا

---

[٣] دیورانت ،دروس التاریخ، ترجمة علی شلش،دار الجمیل، (القاهرة:١٩٩٩م)، ص١٥٥.

لێی دەدوێین کاریگەری لەشکرکێشی ئەو هێزە موسڵمانانەیە کە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە پەلاماری کوردستانیان داوە، جگە لەو هێزانەش هێزی ناموسڵمانی زۆریش هەبوون کە لە خانەی شەڕ(دار الحرب)ەوە هێرشیان کردۆتە سەر شارە کوردنشینەکانی ناوچە کەوشەنەکان، بەڵام ئێمە جگە لە مەغۆلەکان وەك هێزێکی ناموسڵمانی ڕۆژهەڵاتی باسکردنی ئەوانی دیمان لەبەر چاو نەگرتووە، لەشکرکێشی ئەوانیش لەبەرئەوەی کەوتۆتە چوارچێوەی ماوەی لێکۆڵینەوە و دواتر لە ماوەیەکی تاڕادەیەك کەمدا بەشێکی زۆر لە مەغۆلەکان موسڵمان بوون، لەبەرئەو شوێنەوارە گرنگانەش کە لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکان بەجێیان هێشتووە، کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە هەندێ لە شوێنەوارەکانی بۆ نموونە وەك کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان لەگەڵ هێزە موسڵمانەکان بەدی ناکرێت، هەرچەندە ڕادەی کاریگەرییەکان دەکرێت کەمتر بووبێت، بەڵام کرداری هەمان شێوەیان ئەنجام داوە، ئەوەش ئەمە دەسەلمێنێ کە هاوئایینی یان مەزهەبی نەکراوەتە بنەمای هەڵسوکەوتی باش یان خراپ بەرامبەر بە کورد، بەڵکو داگیرکەرەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی گشتی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ کورد کردووە.

لێرەشدا هەڵبژاردنی بابەتەکە بۆ توێژینەوەو بایەخەکەی دەردەکەوێت، بە تایبەت کە لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە لەم جۆرە بابەتانە وەك پێویست لایان لێ نەکراوەتەوە، هیچ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت لەم بارەیەوە نییە، هەرچەندە ئەوە بەو مانایە نایە کە ئەو ماوەیەی ئێمە بۆ لێکۆڵینەوە دیاریمان کردووە توێژەرانی پێش ئێمە لە مێژووی سیاسییان نەکۆڵیبێتەوە، بەڵکو چەند لێکۆڵینەوەیەکی گرنگ لەم بارەیەوە نووسراون، هەر بۆیەشە بەشێك لەو توێژینەوانە بۆ ئێمە بوونە ڕێنیشاندەرو زۆریش ئاماژەیان پێدراوە، ئەوە سەرباری ئارەزوومان بۆ لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرە، کە زۆرتر تەرخانە بۆ باسکردنی ئەودیوی لەشکرکێشیەکان و ڕەنگدانەوەیان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی.

هەرچی ئامانجی توێژینەوەکەشە ئـەوە بـە ئـەنجام گەیانـدنی لێکۆڵینەوەیـەکی ورد و ئەکادیمیانەیە لەسەر کاریگەری و شوێنەوارەکانی لەشکرکێشییەکان، بە پێـی توانـاو بێ لایەنانـە بـە بـەکارهێنانی میتـۆدی لێکۆڵینـەوەی زانـستی و بـە هیـوای پەنـد لێـوەرگرتن و پڕکردنـەوەی کـەلێنێك لـە میـژووی کـورددا، وە دەروازەیـەك بێـت بـۆ لێکۆڵینەوەی بە پێزترو هاندەرێکیش بێت بۆ لێکۆڵەرەوانی بواری مێژووی کـورد، کـە ئاوڕی زیاتر لە قۆناغەکانی دی مێژوودا لەو بـوارە بدەنـەوە، ئـەویش بەشـیکردنەوەی کاریگەرییـە جیاوازەکـانی هـەر لەشکرکێـشییەك و خـستنە ڕووی لایەنـە بـاش و خراپەکانیان، چونکە دەکرێت دەربارەی ڕەوشی ژیانی خەڵك لە ژێـر سـایەی دەسـەلاتی هێزە بێگانەکان و پرۆسەی داگیرکاریدا کاریگەری و ڕەهەندەکانی ڕای جیاواز هـەبێت، کە زۆر جار رووخانی مینشینەکان و تالانکـاری و کوشـتنی خـەڵك و...هتـد. زۆر زەق کراونەتـەوە و ڕووی نـەرێنی هەنـدێ لـە لەشکرکێـشییەکان خراوەتـە ڕوو، بـەلام بـە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە ناکرێت ڕووی ئەرێنیشیان لەسەر کایـە جۆربـەجۆرەکانی کۆمەڵگا لەبەر چاو نەگرین، بە واتایـەکی دی ئەگـەر کـورد لـە لایەنێکـەوە زیـانی پێکەوتبێت، ئەوا لـە لایـەنێکی دیـدا دەشـێت سـوودمەند بووبێـت، بـەلام ئەمـەش بێهەڵسەنگاندنی وردو دروست ناکرێت، چونکە زۆرجار هێزی داگیرکەر بۆ چاوبەستەیی و تەکتیکی چەسپاندنی دەسەلاتی کاری لەم جۆرە دەکات، کە ئێمەی کورد پێی نـامۆ نین و بەردەوام بەسەرماندا ئەزمون کراوە، بۆیە دەبێ لە تـاوتوێکردنی وەهـا پرسـێکدا ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە تا چەند ئەو شوێن دانانە وەك پێویـست لـە ئاسـتی خواسـتی خەڵکی کوردستاندا بووەو تا کوێ ئەو تەرزە بیرکردنەوەو ڕەفتارە چۆتە قـالبی ئاکـار و سوودبەخش بووە؟ دەرخستنی مەترسی ئەگەری چـەندبارەبوونەوەی شـالاوی داگیرکـاری لەو جۆرەو لە داهاتوودا و خستنەڕووی ئەو میکانیزمانەش کە دەستپێوەگرتن و دەسـت لێبەردانیان ئەگەری دووبارەبوونەوەیان دیاری دەکەن بەهەردوو لایەنەکەیـەوە (بـاش و خراپ) بە ئامانجی سوود لێوەرگتنیان و دووبارە نەکردنەوەی ئەزمونە تاڵەکان.

گومانیشی تێدانیە کە ئەنجامدانی کاری لێکۆڵینەوەی لەم جۆرە بێکێشەو گرفت نییە، بە تایبەت بۆ دیاردەیەکی لەو جۆرە کە لێکۆڵینەوەی هاوشێوەی لەمێژووی کورددا تارادەیەك دەگمەنە، ئەرکی ئێمەی زیاتر گران کردووە، هەرچی گرفتی سەرەکی بەردەم ئەو هەوڵە یاریکردووە، خۆی لە کەمی زانیاری سەرچاوەکاندا بینیوەتەوە، دەربارەی شوێنەواری لەشکرکێشیەکانی بۆسەر کوردستان بە تایبەتی کە زۆر بە دەگمەن ئاماژەیان بەم بوارە داوە، چونکە وەك باوە سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامی ئەوەندەی بونەتە تۆماری شەڕ و ژیاننامەی کەسایەتیەکان، ئەوەندە لایان لەبوارەکانی دی نەداوەتەوە، بە تایبەت لایەنە کەلتوری و فەرهەنگیەکان، بۆیە سەرباری ئەرك و ماندووبوونێکی زۆر بە خوێندنەوەی دەقەکان و گەڕان بە دوای شوێنەوارێکی لەو جۆرە کە ئەمە بۆخۆی دڵگەرمی بە توێژەر دەدات، ناچار بووین زۆرجار لە سێبەری ڕووداوەکاندا زانیاری هەڵێنجین و یانیش پەنا بەرینە بەر شیکردنەوەی سەرچاوە ناسەرەکیەکان، کە بەشێکیان لەمەڕ پاشماوەکانی هێزەکانەوە زانیارییان وەرگرتووە، وەپەیوەستبوون بەقەبارەی دیاریکراوی نامەکە، بۆ ئێمە گرفتێکی تر بووە، چونکە ناچار بووین چەند لایەنێك کە پێشتر لە نەخشەی باسەکەدا بوون و پێویست بوو باسیان لێوە بکرێت لاماندان، وەك کاردانەوەی کورد و گۆڕانکارییە کارگێڕیەکان و چەند بابەتێکی دی، کە دەبوایە وەك تەوەرەیەکی سەربەخۆ باسیان لێوەبکرێت، لە چوارچێوەی تەوەرەکانی تردا ڕێکخراون، بۆیە دەکرێت هەندێ لایەن بەدرێژی باس نەکرابن و بە قوڵی شۆڕنەبووینەوە ناویان.

توێژینەوەکەش لەو پێشەکییەو سێ بەش و بەرئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی نامەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی پێکهاتووە، کە هەر بەشەش دابەشکراوە بەسەر سێ باسی جیاوازدا، بەم شێوەیە:

بەشی یەکەم/ پێکهاتووە لە سێ باس، کە یەکەمی تەرخان کراوە بۆ دەرخستنی گرنگی پێگەی جوگرافی کوردستان وەك هۆکارێکی کارا لە ناو هۆکارەکانی دیدا بۆ

سەرنجڕاکێشانی هێزەکان و ناساندنی ئەو هێزانەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە لە ماوەی لێکۆڵینەوەدا لەشکرکێشییان کردۆتە سەر کوردستان، بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەران و ئاشنابوون پێیان، لە لێکۆڵینەوەکەشدا لەسەر ئەو بنەمایەی کە هێزی دەرەکی بوون ئایین نەکراوەتە بنەمای جیاکردنەوەیان و هەموویان بە هێزی داگیرکەر ناوزەد کراون، جگە لە مەغۆڵەکان کە بە نموونە وەك هێزێکی نا موسوڵمان هەر بەو شێوەیە باسیان لێوە کراوە. لە باسی دووەمیاندا ئەو گۆڕانکارییە سیاسیانە خراونەتە ڕوو کە وەك بەرەنجامی لەشکرکێشییەکان و پراکتیزەکردنی دیدی سیاسییان چەند دیاردەیەك سەریان هەڵداوە کە وەك ترادسیۆنێکی سیاسی دێنە بەر چاو و یان سەپاندنی هەندێکی تریان کە وەك مۆدێلێك بەسەر کورددا ئەزمون کران. باسی سێیەمیش وێڕای بە کورتی ئاماژەکردن بۆ پێکهاتەو تەکنیك و هێزی سەربازی و هێزەکان کاریگەری و شوێنەوارە سەربازییەکان لەسەر میرنشینە کوردییەکان و لایەنەکانی دی خەڵکی کوردستان ڕوون کراوەتەوە.

بەشی دووەمیش کە تەرخان کراوە بۆ کاریگەری و شوێنەوارە کۆمەڵایەتی و کەلتورییەکان، ئەویش لە سێ باس پێکهاتووە، باسێکی بۆ شوێنەوارە کۆمەڵایەتییەکان تەرخان کراوە، کە تیایدا وێڕای دەرخستنی زەرەرو زیانە گیانییەکان و پیادەکردنی ساسیەتی کوشتن و بڕین و بەرەنجامە خراپەکانی لەسەر پێکهاتەی ڕەگەزی و دیاردەی کۆچ و دزەکردنی ڕەگەزی بێگانی بۆ کوردستان و نیشتەجێبوونیان و گۆڕینی دیمۆگرافیای هەندێ لە شارەکان، لە داوێنیشیدا تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی و دەرخستنی هەندێ شوێنەوار لەسەر کۆمەڵگەی کوردی باسیان لێوە کراوە، کە دەکرا هەریەك لەمانە زیاتر لەسەریان دوابایین، بەڵام بۆ دەرنەچوون لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکە هەریەکەیان بە چەند نموونەیەك ئاماژەیان پێکراوە. باسی دووەمیشی، بۆ شوێنەوارە کەلتوری و ڕۆشنبیرییەکان تایبەت کراوە، کە سەرباری دەرخستنی سیاسەتی هێزەکان لەسەر ئەم لایەنەو شوێنەوارەکانیان لەسەر کەلتورو زمانی کوردی

که تاکو ئەمڕۆش بەزەقی هەست بە شوێنەواری ئەم جۆرە کارتێکردنانە دەکرێت، وە کاریگەرییان لەسەر ڕەوتی زانست و دەرخستنی لایەنە باش و خراپەکانیان بەتایبەت کاریگەرییەکانی هەریەك لە سەلجوقیەکان و مەغۆلەکان لەم بارەیەوە زۆر بەدیارکەوتوون. باسی سێیەمیشی تایبەت کراوە بۆ شوێنەوارە ئایینی و مەزهەبیەکان، ئەوەی ئاشکراشە ئەو قۆناغەی مێژووی ئیسلامی ململانێیەکی سەختی ئایینی و مەزهەبی بە خۆیەوە بینیوە، بەغدا وەك گەورەترین مەڵبەندی ململانێکان دەرکەوتووە، کاریگەری ئەو ڕووداوانەش لە سەر کوردستان زۆر جار ڕەنگیان داوەتەوە، ئەوە سەرباری سەرهەڵدانی چەندین بیرۆکەی خراپ و دەرکەوتنی ڕێبازی سۆفیزمی کوردی.

هەرچی بەشی سێیەمیشە، شوێنەوارە ئابووریەکانی لە خۆگرتوە، کە لە سێ باسی جیاوازدا تاوتوێ لەسەر هەرسێ کەرتەکەی ژێرخانی ئابووری کوردستان کراوە، لە باسی یەکەمدا شوێنەوارەکان لەسەر کشتوکاڵ و، لە دووەمیاندا لەسەر بازرگانی بە هەردوو جۆرەکەی و لە باسی سێیەمیشیاندا سەرباری شوێنەوارەکان لەسەر پیشەگەری هەندێ لایەنی تر خراونەتە ڕوو.

ئەوەی جێگای سەرنجە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە کە بە گشتی جەخت لەسەر ئەنجام و شوێنەوارە نزیکەکان کراوەتەوەو کەمتر شۆڕبوونەوەی قووڵ بە نێو ئەنجامە دوورمەوداکان بە پێویست زانراوە، لە لایەکی تریش سەبارەت بە هێزەکان کاریگەری ئەوانە زیاتر دەرکەوتووە کە ماوەیەکی زیاتر دەسەڵاتی سیاسییان بەدەست بووە، وەك بوەیهیەکان و سەلجوقیەکان و مەغۆلەکان هەر بۆیەشە ئەوانە زۆرترین کاریگەرییان هەبووە، دەرخستنی ڕادەی کاریگەرییەکان و دەرکەوتنی دیاردەکان زیاتر لە هەرێمەکانی چیاکان و جزیرە کە ماوەیەك سنووری قەڵەمڕەوی میرنشینە کوردیەکانی حسنویی و عەنازی و مەڕوانی بوون، دەرکەوتوون، بەهۆی گرنگی پێگەی سیاسی و ئابوورییان بەبەراورد لەگەڵ هەرێمەکانی ئازرییجان و ئاران و ئەرمینیا، بۆیە دەبینین

نموونه‌کان زیاتر له‌سه‌ر دوو هه‌رێمه‌که‌ی پێشتر هێنراونه‌ته‌وه، ئه‌گه‌رچی پێمان وایه له‌ هه‌موو ئه‌و کاریگه‌رییانه‌دا تا ڕاده‌یه‌کی زۆر هاوچوونیه‌کێك هه‌یه، که‌ ده‌کرێت بکرێنه‌ نموونه‌ بۆ ناوچه‌ کوردنشینه‌کانی دیش، چونکه‌ ئه‌و زه‌مه‌نه‌ی مێژووی کورد زه‌مه‌نی دووباره‌ بوونه‌وه‌ی یه‌ك دیمه‌ن بووه‌.

## شیکردنەوەی سەرچاوەکان:

بۆ ئەنجامدانی ئەو توێژینەوەیەش کە زیاتر هەوڵدراوە هەمەلایەنە لێی بڕوانرێت سوود لە سەرچاوەی جۆراوجۆر وەرگیراوە، لە نێویشیاندا هەندێ سەرچاوەو لێوەرگیراو هەن کە زیاتر لە هەموان بوونەتە جێی پشت پێبەستن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکە بە بنەما گیراون، بۆیە هەڵوێستەکردن و شیکردنەوەی هەندێکیان بەنموونە بە پێویست زانراوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## یەکەم/ سەرچاوەکان:

### أ/ مێژووی گشتی:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەك سروشتی هەر لێکۆڵینەوەیەك پشت بە چەند سەرچاوەیەکی مێژوویی گشتی بەستراوە، ئەوانەی پەیڕەوی سیستەمی ساڵ و ساڵیان کردووە لە تۆمارکرنی ڕووداوەکان یان هەر شێوازێکی دی، بەگشتیش ئەو سەرچاوانە ئەوەندەی پرژاونەتە سەر مێژووی سیاسی و سەربازی ئەوەندە لایان لە دیاردە کۆمەڵایەتیەکان نەداوەتەوە، دیارە تۆمارکردنی ئەو گۆڕانکاریە سیاسیانەی جیهانی ئیسلامی و سەرهەڵدانی چەند هێزێکی سیاسی جیاجیا وای کردووە هەژمونی ڕووداوە سیاسی و سەربازیەکان زاڵبێت بەسەر ئەو جۆرە مێژووەدا، بەمەش تایبەتمەندیەکانی تری شاردۆتەوە، بۆیە کارێکی گرانە بۆ توێژەر زانیاری دەربارەی لایەنەکانی دی بەرجەستە بکات، لە دیارترین ئەو سەرچاوانەش کتێبی (تجارب الأمم)ی (مسكويه)(م.لە٤٢١ك/١٠٣٠ز) کە سەرباری ئەوەی خۆی هاوسەردەمی ڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی بوەیهی و هەندێ لە میرنشینە کوردیەکانە، زانیاری گرنگی لە

بارەیانەوە تۆمار کردووە، لە دامێنی ڕووداوەکانیشدا زۆر جار باسی ئـابووری خـستۆتە ڕوو کە بۆ ئێمە جێگای پشت پێبەستن بوون و سوودی زۆریان لێوەرگیراوە.

کتێبــی (تــاریخ آمــد ومیافــارقین)ی (الفــارقی) (م.لــە٥٧٢ك/١١٧٦ز) کــە سەرچــاوەیەکی گرنگــە لەســەر مێــژووی میرنــشینی مــەڕوانی هــەر لــە ســەرەتای دامەزراندنیەوە تا ڕووخانی، گرنگییەکەشی لەوەدایە کە خۆی خەڵکی شاری میافارقین بووە، ســەباری باســکردنی مێــژووی سیاســی میرنــشینەکەو پەیوەندییــەکانی لەگــەڵ هێزەکــانی دی لەســەر بــارودۆخی ئــابووریش زانیــاری دەگمــەنی باســکردووە کــە لــە سەرچاوەکانی دیدا بەدی ناکرێت، بۆیە بۆ ئێمە بایەخی زۆریان هەبووە، بەتایبــەت لــە باسی شوێنەوارە ئابوورییەکاندا.

هەرچــی کتێبــی(المنــتظم في تــاریخ الملــوك والأمــم)ی (ابــن الجــوزی) (م.لە٥٩٧ك/١٢٠٠ز)یشە ئەوا زانیاری گرنگی تۆمار کردووە لەسەر بارودۆخی گشتی بەتایبەت لەسەر ئەو کارە تێکدەرانەی کە هێزەکان لە میانەی لەشکرکێشیەکانیاندا ئەنجامیان داوە، وە تۆمارکردنی زانیاری لە سەر بارودۆخی ئابووری گرانی و قات و قڕی نرخی کاڵاکان هەرچەندە لە هەندێك لە گێڕانەوەکانیدا زیادەڕەوی تێدایە، بەڵام ئەمانە لە بایەخی زانستی سەرچاوەکە کــەم ناکەنــەوەو ئێمــە ســوودی زۆرمــان لــێ بینیــوە. هەروەها کتێبی (راحة الـصدور وآیــة الـسرور)ی (الراونـدی)(م.لـە٦٠٣ك/١٢٠٦ز) یەکێکی ترە لەو سەرچاوانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتی پێبەستراوە، بە تایبەت لە باسکردنی سەلجوقیەکان و هێرش و پەلامارەکانیان بۆ ســەر ناوچــە کوردنــشینەکان و شــەڕە ناوخۆییــەکانیان، هەرچــەندە زیــادەڕۆیی زۆری کــردووە لــە پێداهەڵــدانی سوڵتانەکان، هەندێ لە شوێنەوارەکانی لەشکرکێشی خوارزمیەکانی بــۆ ســەر ناوچــە کوردنشینەکان خستۆتەڕوو کە بایەخێکی تایبەتیان هەبووە بۆ ئەم توێژینەوەیە.

ڕەنگە کتێبی (الکامل فی التاریخ)ی (ابن الأثیر)(م.لە ٦٣٠ك/١٢٣٢ز) گرنگترین سەرچاوەیەك بێت کــە پــشت بــە زانیاریــەکانی بەســتراوەو هاوســەردەمی زۆرێــك لــە

ڕووداوەکان بووە، ئەو زانیاریانەی ئەو تۆمـاری کـردوون لـە سـەر کـوردو هێـرش و پەلاماری هێزەکـان و ئـەو کارەسـاتانەی خولقاندوویانـە لـە سەرچـاوەی دیـدا بـەدی نەکراون، ئەگەرچی بەشی زۆری بۆ مێژووی سیاسی تەرخان کـراوە، بـەڵام بـە بـەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی دیدا تا ڕادەیەکی زۆر سوود لە زانیاریەکانی وەرگـیراوەو ئامـاژەی پێکراوە، وەك پشتڕاستکردنەوەی زانیاری سەرچاوەکانی دی بە پێویست زانراوە ئامـاژەی پێبکرێ، بەڵام ئەم مێژوونووسەش کەمتر لای لە شوێنەوارە کەلتوری و فەرهەنگیەکان کردۆتەوە کە ئەم جۆرە زانیاریانە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر پێویست بوون.

هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت بە سەرچاوەی فارسـیش بەسـتراوە، لەوانـە هـەردوو کتێبـی (نزهـة القلـوب و تـاريخ گزیـده)ی (حمـدالله مـستوفی القـزوینی) (م.لـە ٧٥٠ك/١٣٤٩ز) کە بەتایبـەت کتێبـی یەکـەمیان مێـژوونووس بـە پێـی هەرێمـە جوگرافیەکان باسی ڕووداوەکانی کردووەو بۆ یەکەمجاریش بە نـاوی هـەرێمی ویلایـەتی کوردستان زانیاری لەسەر کورد تۆمار کردووە، ئەوە سەرباری ئاماژەکردن بە بارودۆخی ئابووری و ئاواکاری و هەندێ لایەنی دی سوودی لێوەرگیراوە، هەرچی کتێبی دووەمیشە زیاتر بۆ وەرگرتنی زانیارییە مێژوویەکان و شرۆڤەکردنیان گەڕاوینەوە سەری، ئەمانـەو چەندین سەرچاوەی دی کە لە لیستی سەرچاوەکاندا هەن.

## ب/ سەرچاوە جوگرافی و گەشتنامەکان:

هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت بە سەرچاوەی شارناس و وڵاتناسەکان بەسـتراوە کـە زانیاری گرنگ و بە بایەخیان لە خۆگرتووە، بەتایبەت لـە بـارەی بـارودۆخی ئـابووری ناوچە کوردنشینەکان و ڕێگاکانی بازرگانی، وە لە وەرگرتنی زانیاری مێژوویی سیاسی و ژیانی کۆمەڵایەتی زۆر جـار بـۆ ئێمـە سـوودبەخش بـوون، لەوانـە کتێبـی(صـورة الأرض)ی (ابن حوقل)(م.لە٣٦٧ك/٩٧٧ز) کە سەرچاوەیەکی بەپێزو دەوڵەمەنـدە بـە

زانیاری لەسەر هەرێمە کوردیەکان و دووری نێوان شارەکان و بارودۆخی ئابووریـیان، وردبین و ڕاستگۆ بووە لە گواستنەوەی زانیاریـیەکان، لەو سەرچاوە جوگرافیانەیە کە زۆر جار لە لایەنەکانی تریش سوودی لێوەرگیراوە.

کتێبی(أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم)ی (المقدسی)(م.لە ٣٧٥ك/٩٨٥ز) لەو سەرچاوانەیە کە بایەخی زیاتری بە بواری کۆمەڵایەتی داوە لە پێکهاتەی دانیشتوانی شارەکان و ئایین و مەزهەب و خوو و نەریتیان، ئەوە سەرباری خستنەڕووی باری ئاووهەواو ژینگەو جۆری بەروبووم و داهاتی هەرێمەکان، کە بە گشتی لەمبارەیەوە کەڵکی زۆریـان لێوەرگیراوە، وە کتێبی (معجم البلدان)ی (یاقوت الحموی)(م.لە ٦٢٦ك/١٢٢٩ز) کە سەرچاوەیەکی پڕبایەخ و دەگمەن و وردبین بووە لە دەرخستنی بنچینەی ناوی شارەکان و مێژوویان، بۆیە بە تایبەت بۆ ناساندنی شارەکان زیاتر پشت بەم سەرچاوەیە بەستراوە.

هەرچی گەشتنامەکانیشن، ئەوانیش بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر سوودبەخش بوون، لەوانەش کتێبی (سفرنامە)ی (ناصر خسرو) (م.لە ٤٨١ك/١٠٨٨ز) کە سەرباری ئەوەی زانیاری زۆری لە هەرێمەکانی ئازربیجان و جزیرە باسکردووە لەمەڕ سەردانی بۆ ئەو شوێنانە، وە باسی لە هەریەك لە میر (وهسوزان و نصر الدولة) کردووە کە هاوسەردەمی خۆی بوون. هەرچی کتێبی (رحلة ابن بطوطة)ی (ابن بطوطة)(م. لە ٧٧٩ك/١٣٧٧ز)شە کە هەرچەندە گەشتەکەی کەوتۆتە دوای ماوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە، بەڵام زانیاری گرنگی لەسەر ئەو شارە کوردیانە تێدایە کە لە میانەی گەشتەکەیدا سەردانی کردوون، بۆیە لەوەرگرتنی زانیاری لەسەر ئەو گۆڕانکاریانەی بە تایبەت بەسەر بوژاندنەوەی بازرگانی و ئاواکاریدا هاتوون لە سەردەمی ئیلخانیەکاندا، پشتمان پێبەستووەو بۆ ئێمە سوودمەند بوون.

## ج/سەرچاوە ژیاننامەکان:

ئەوانەی کە بایەخیان بەتۆمارکردنی ژیاننامەی کەسایەتی و میر و سولّتانەکان داوە، کە بەتایبەت بۆناساندنیان پشتیان پێبەستراوە، سەرباری ئەوەی زۆر جار زانیاری گرنگیشیان لێوەرگیراوە کە لە سەرچاوەی دیدا بەدی نەکراوە، کە لە سۆنگەی باسکردنی ژیاننامەی کەسایەتیەکان باسی کاریگەریان کەم تا کورتێك کراوە، لەوانەش کتێبی (وفیات الاعیان)ی (ابن خلکان) (م.لە ٦٨١ك/١٢٨٢ز)، یەکێکە لەوانەی کە زانیاری گرنگی لەپاڵ ژیاننامەی کەسایەتیەکاندا لەسەر کارو لایەنە گشتیەکانی دی خستۆتە ڕوو زۆرجار پشتمان پێبەستووە، وە کتێبی (العبر فی خبر من غبر)ی (الذهبي) (م.لە ٧٤٨ك/١٣٤٧ز) کتێبی (الوافی بالوفیات)ی (الصفدي) (م.لە ٧٦٤ك/١٣٦٢ز) و کتێبی (فوات الوفیات)ی (الکتبی) (م.لە ٧٦٤ك/١٣٦٢ز)، ئەو دوو سەرچاوەی دوایش لەوانەن کە لەوەرگرتنی زانیاری جۆراوجۆر سودیان لێوەرگیراوە، ئەمانەو چەندین سەرچاوەی جۆربەجۆری دی.

## دووەم/سەرچاوە ناسەرەکیەکان (المراجع):

لە زانیاریەکانی ئەو جۆرە کتێبانەش بەهرەمەندبووین بەتایبەت ئەوانەی شرۆڤەو شیکاری وردی ڕووداوەکانیان کردووە، بۆیە بۆ چەند دانەیەکیان زۆر گەڕاوینەوە، کە زۆرجار پشتیان بەزانیاری گرنگی سەرچاوەی بێگانە بەستوە لەڕاگواستنی زانیاریەکان کە بۆ ئێمە بەردەست نەبوون، لەوانەش کتێبی (شهریاران گمنام)ی (احمد کسروی)، کە زانیاری پڕبایەخی لە سەر میرنشینی ڕەوادی و شەدادی وپەیوەندیەکانیان لەگەڵ هێزەکانی دیدا باسکردووە، بەتایبەت زانیاریەکانی لە باسکردنی شالاّوی هۆزەکانی غوز بۆسەر شارە کوردیەکان، وە کتێبی (سلاجقه ایران والعراق)هی (عبدالنعیم

حسنين)، كە سەرباری باسكردنی مێژووی سیاسی سـەلجوقیەكان زانیـاری گرینگیـشی لەسەر لایەنی شارستانی و ئابووری باسـكردووە، كـە ئێمـە لێیـان بەهرەمەنـدبووین، وەكتێبی (السلاجقە)ی (تامارا رایس)و (المغول فی التاریخ)ی (عباس اقبال)، كـە لـە تۆماركرنی زانیاریەكانیانـدا پـشتیان بـە پاشمـاوەی شارسـتانی هێزەكـان بەسـتووە و شرۆڤەكاری گونجاویشیـان بۆ ڕووداوەكان كردووە، وە هەریەك لە كتێبەكانی (العـراق فی عهد المغول الایلخانین)ی (جعفر حسین خـصباك) و (شـارەزوور و لوڕسـتانی بـاكور)ی (حسام الـدین نەقـشبەندی)و (الامـارات الارتقیـە)ی (عمادالـدین خلیـل)و (كـورد وسەلجوقیەكان)ی (نیشتمان بەشیر)... چەندان كتێبی دی، كە هەر یەك لەمانە سـودی تایبەتی خۆی بۆ ئەم لێكۆڵینەوەیە هەبووە، ئەوە سـەرباری چـەند كتێبێكـی فارسـی لەوانەش (تاریخ ادبیات ایران)ی (ذبیح الله صفا)و (تاریخ میانە ایران)ی (آن لمـبتن)و (تاریخ دە هزار سالەی ایران)ی (عبدالعظیم رضایی) و چەندانی دی.

## سێیەم/ نامە زانكۆیە بڵاونەكراوەكان:

هـەروەك پێـشتر ئاماژەمانـدا چـەند نامەیـەكی زانكـۆی ئـەكادیمی (ماسـتەر و دكتوراە) لەسەر مێژووی سیاسی و ژیـانی ئـابووری كـورد لـەو مـاوەی سـەدەی (٤-٨ك/١٠-١٤ز)ی كە ماوەی ئەم لێكۆڵینەوەیەشە نووسـراون، بۆیـە بەلەبەرچـاوگرتنی ئەو خزمەتەی بە مێژووی كوردیان كردووە رێز لەو ئەركە زانستیانە گیاوە، بەتایبـەت لە ڕووداوە سیاسی و كۆمەلایەتی و ئابووریەكاندا گەڕاوینەوە سەریان و خزمـەتی ئـەو توێژینەوەیەشیان كردووە، وەك ئەمانەتێكی زانستیش ئاماژە بە شیكردنەوەكانیان دراوە و هەندێ جاریش تێبینی تایبەتیان لەسەر وتراوە، لەوانـەش (اذربیجـان) كـە نامـەی دكتوراە ی (حسام الدین النقشبندی)ە، وە ماستەرنامەی (الكوردفی العصر العباسـی حتی مجیء البویهین)ی (زرار صدیق توفیق) و ماستەرنامەی (الامـارات الكردیـة فـی

العهد البويهين)ی (قادر محمد حسن) و نامەی دکتـورای (التجـارة والـنظم المالیـة)ی (آکو برهان محمد) و چەند نامەیەکی دی, کـە لـە لیـستی سەرچـاوەکاندا ئاماژەیـان پێدراوە.

# بەشی یەکەم:
# لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان و شوێنەوارە سیاسی و سەربازییەکان

## باسی یەکەم/
کورتەیەك دەربارەی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان بۆ سەر کوردستان لە ماوەی نێوان هەردوو سەدەی (٤-٨ك/١٠-١٤ز)دا

## باسی دووەم/
شوێنەوارە سیاسیەکان

## باسی سێیەم/
شوێنەوارە سەربازیەکان

## باسی یەکەم:
## کورتەیەك دەربارەی لەشکرکێشی هێزە بیانییەکان بۆ سەر کوردستان لە ماوەی نێوان هەردوو سەدەی (٤-٨ك/١٠-١٤ز)دا

### دەروازە:

ئەنجامدانی هەر لەشکر کێشییەك و هەڵگیرساندنی هەر شەڕێك زەمینەسازی و هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە، وەك دیاردەیەکی هەمیشە ئامادەی ناو مێژوو تەنها پێکدادانێکی سەربازیی نییەو دەکرێت لە پێناو ئامانجی گەورە پیادە بکرێ، ئەو لەشکرکێشییانەش کە لەلایەن هێزە دەرەکیەکانەوە کراونەتە سەر کوردستان، کە جێی مەبەستی ئەو باسەی ئێمەیە لەماوەی نێوان سەدەکانی (٤-٨ك/١٠-١٤ز) زادەی هەلومەرجی تایبەتن و هۆکارو پاڵنەری خۆیان هەبووە، لەبەرئەوەش کە لەو پێوەندەدا هۆو پێگەی جوگرافی کاریگەرتر خۆی دەنوێنێ، هەڵدەگرێ قسەی زیاتری لەسەر بکرێت.

کوردستان بەهۆی پێگە جوگرافیەکەی و هەڵکەوتنی لە ناوەڕاستی شارستانیەتە کۆنەکان، وەك شوێنێکی گرنگ و بەبایەخ دەرکەوتووەو لە هەموو قۆناغە جیاوازەکانی مێژووشدا ئەو گرنگییەی خۆی پاراستووەو وەکو بڕبڕە وابووە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سەرباری سامانی زۆر و زەبەندی[٤]، پردێکیش بووە بۆ بەیەکگەیاندن و بەیەکەوە

---

[٤] کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، چاپخانەی الأدیب البغدادیة، (بغداد:١٩٨٥)، بەشی یەکەم، ل٩.

**بەستنەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا[٥]، بە واتایەکی دی هەرێمە کوردنشینەکان بەشێکی گرنگ بوون لەو هەرێمە گەورەیەی کە بەدڵی دونیا (جیهانی ناسراوی ئەوکات) ناونراوە[٦].**

**وڵاتی کوردان لەلایەن شارناس و گەڕیدە موسڵمانەکان زۆر باسی لێوەکراوەو بەپێی دابەشکردنەکانیان لە هەرێمی چوارەم دانراوە[٧]، لەناو ئەو هەرێمەشدا کە بۆ (شەش) بەش دابەشکراوە، لە بەشی شەشەمدا جێی گرتووە[٨]، (المسعودی)یش گرنگییەکەی لەبەرچاو گرتووەو وەك بەپیتترین هەرێمەکان ناوی بردووە[٩]، بەلای توێژەرە نوێیەکانیشەوە باشترین و گونجاوترین هەرێم بووە بۆ سەرهەڵدان و گەشەکردنی شارستانی و بەرزی ئاستی بژێوی و ژیانی ئابووری[١٠]، بەتایبەت، کە هەلومەرجی**

---

[٥] شاكر خصباك، الأكراد (دراسة جغرافية اثنوغرافية)، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الأولى، (بيروت:٢٠٠٥)، ص٦٧.

[٦] العمري، مسالك الأبصار في ممالك الأمصار، إصدارات المجموعة الثقافي، (أبوظبي: ٢٠٠٣م)، ج٣، ص١٩٨.

[٧] وڵاتناس و گەڕیدەی موسڵمانەکان هەرێمەکانی جیهانی زانراوی ئەوکاتەیان دابەش کردووە بەسەر حەوت هەرێمدا کە بە (الأقاليم السبعة) ناسرابوون، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ابن رسته، الأعلاق النفيسة، دار أحياء التراث العربي، (بيروت:د.ت)، ص٩٤؛ المقدسي، أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى، (بيروت:٢٠٠٣)، ص ص٧٢- ٧٧؛ الادريسي، نزهة المشتاق في إختراق الآفاق، مكتبة الثقافة الدينية، (القاهرة:٢٠٠٢)، مج٢، ص ٦٦٤؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، الطبعة الثانية، (بيروت:١٩٩٥م)، ج١، ص٢٥.

[٨] الإدريسي، نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٤.

[٩] التنبيه والإشراف، مطبعة بريل، (ليدن:١٨٩٣م)، ص٣٥.

[١٠] حكيم احمد خوشناو، الكرد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة المسلمين (٢٣٢-٦٢٦هـ/٨٤٦-١١٢٩م)، دار الزمان، (دمشق:٢٠٠٩م)، ص ١٠٠.

ئاووهەواو ژینگە سرووشتیەکەی لەو هەرێمـەدا بـۆ کـشتوکاڵ زۆر گونجـاو بـووە[11]، ئەمـەش وای کردووە سەرچاوەکانی داهات و سامانی زۆر بێت، کـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی داهاتی دەوڵـەت لـە ڕێگـەکانی بـاج و خەراجـەوە کـە لـە ناوچـەکەدا کۆدەکرایـەوە لەپەرەسەندندا بێت، وە بۆتە فاکتەرێکی سەرنج ڕاکێشیش بۆ هێزەکان کە لە هـەوڵی دەستبەسەرداگرتنی سەرچاوەکانی ئەو داهاتەدا بن.

لەلایەکی تریشەوە کوردستان ڕێگەوبانی بازرگانی جیاجیای پێـدا تێپـەڕیوە، کـە جیهانی ئیسلامی و شارو شارۆچکەکانیان بەیەکەوە بەستۆتەوە[12]، بۆ نموونە هەرێمی جزیرە[13]، وەك پردی پەیوەندی نێوان عێراق و شام وابووە[14]، لـە ناویـشیاندا ڕێگـای

---

[11] المسعودي، التنبيه ولاشراف، ص٣٥؛ مؤلف مجهول، حدود العالم مـن المشرق الى المغـرب، دار الثقافـة للنشر، (القاهرة:١٩٩٩م)، ص ص ١٠٦–١٠٧.

[12] بۆ زانیاری لەسەر ڕێگاکان دووری نێوان شارەکان بڕوانە: ابن رسته، الاعلاق النفيسـة، ص ص١٥٠ – ١٥٣؛ قدامة بن جعفر، الخراج وصناعة الكتابة (ملحق بابن خرداذبـة)، مطبعـة بريـل، (ليـدن:١٨٨٩م)، ص٢٢٦، ص ص٢٢٨-٢٢٩؛ اكو برهان محمد، التجارة والنظم المالية في كوردستان (من قرن ٤-٧هـ/١٠-١٣م)، اطروحـة دكتـوراه غـير منـشورة، مقدمـة الى مجلس كليـة العلـوم الإجتماعيـة جامعـة كويـه، (كويه:٢٠٠٧م)، ص ٤٥ وما بعدها.

[13] هەرێمی جزیرە (جزيره الفراتيه- أقور): یەکێکە لە هەرێمە کوردنشینەکان بە گـشتی بـە ناوچـەکانی نێوان دیجلەو فورات گوتراوە، لە باکوورەوە لەناوچە کەوشـەنەکانی دەوڵـەتی بیزەنتیـەوە درێژدەبێتـەوە تـا تکریت و هیت لـە باشـوورەوە (میافـارقین، نـصيبين، ئامـەد، مـاردین، جزیـرەی ئـیبن عومـەر، سـنجار، موصل، هەولێر...) لە گرنگترین شارەکانی ئەو هەرێمەن، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مؤلـف مجهـول، حـدود العالم، ص١١٧؛ المقدسي، أحسن التقاسيم، ص١٢٤؛ابو الفداء، تقويم البلـدان، دار الطباعـة الـسلطانية، (بـاريس:١٨٤٠م)، ص٢٧٣؛ لـسترنج، بلـدان الخلافـة الـشرقية، مؤسـسة الرسـالة، (بـيروت: ١٩٨٥م)، ص١١٤، وەبڕوانە پاشکۆ (نەخشە)ی ژمارە(١)، ل١٤٧.

[14] المقدسي، احسن التقاسيم، ص١٢٤؛ عبدالله ناصر بن سـليمان الحـارثي، الأوضـاع الحـضارية في إقلـيم الجزيرة فراتية في القرنين السادس والسابع الهجري، دار العربية للموسوعات، (بيروت:٢٠٠٧م) ، ص٢٥.

خۆراسانی گەورەکە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا باس لە گرنگییەکەی و دووری نێوان شارەکانی کراوە[15]، هەمووشیان لە ڕووی بازرگانییەوە بە سوود بوون و بەمەش لە لایەك بوونە هۆیەك بۆ کێش کردنی لەشکری بێگانە بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنیان و قۆرخکردنی باجی کاروانە بازرگانیەکان، هەمیش هۆکارێك بوون بۆ گەیاندنی لەشکرەکانیان بەرەو ناوچەکانی تر بەتایبەتیش بەغدای پایتەختی خەلافەتی عەباسی، بەمەش کوردستان بۆتە دەروازەیەك بۆ تەراتێنی هێزەکان و مەیدانێکیش بۆ شەڕو ململانێی نێوانیان[16]، هەڵکەوتەی بەشێك لە ناوچەکانی کوردستانیش وەکو سنوری جیاکەرەوەی نێوان جیهانی ئیسلامی (دارالسلام) و جیهانی بێباوەڕان (دارالکفر) یان (دار الحرب) کە لە مێژووی ئیسلامیدا ئەم ناوچانە بە (الثغور)[17]ناسراون وای کردووە کەبەردەوام لەبەردەم مەترسی دەرەکی دابن[18]، وەك قەڵایەکی پتەویش ڕۆڵی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پەلامارانەی دەبینی کە لە لایەن هێزە نامو سڵمانەکانەوە لە (دار الکفر)ەوە دەکرانە سەر ناوچەکە، بەتایبەتیش بەشی باکورو

---

[15] بۆ نموونە بڕوانە: قدامة بن جعفر، کتاب الخراج، ص٢٢٦؛ الادریسي، نزهة المشتاق، مج٢،ص ٦٦٦؛ لسترنج بلدان الخلافة الشرقية، ص٨٥؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: قحطان الحديثي، طريق خراسان، مجلة كلية الأداب، جامعة البصرة، عدد(٢٢)، ١٩٩١م، ص٥.

[16] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات لەسەدەی حەڤدەوە تاسەرەتای سەدەی نۆزدە، رشاد میران لەڕوسی یەوە کردوویەتی بە کوردی، (هەولێر: ١٩٩٧ز)،ل١٤؛ لازاریف، چەند کێشەیەکی دیموگرافی و مێژوویی و سیاسی و پەیوەندی ئابووری کۆمەڵایەتی کورد، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە کاوێس قەفتان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق دەستەی کورد، بەرگی ١٦ و ١٧، (بغداد:١٩٨٧ز)، ل٣٨٠.

[17] الثغور: کۆی وشەی (ثغر)ە بە نزیکترین دەروازەی خاکی موسڵمانان لە خاکی بێباوەڕانەوە دەگوترێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: توفيق سلطان اليوزبكي، الثغور ودورها العسكري والحضاري، مجلة آداب الرافدين، جامعة الموصل، عدد(١٠)، مارت/١٩٧٩م، ص٩.

[18] قادر محمد حسن، الامارات الكردية في العهد البويهي (٣٣٤-٤٤٧هـ/٩٤٥- ١٠٥٥م)، رسالة ماجستر غيرمنشورة، مقدمة الى مجلس كلية آداب جامعة صلاح الدين، ( أربيل:١٩٩٩م)، ص٥٦.

خۆرئـاوای کـە بـەولاتی پـڕ لـە کـەلێن و کەلەبـەر نـاو دەبـراو خـەلکی ناوچـەکەو موسـلمانانی تـریش بـەرگریان تێـدا دەکـرد، بۆیـە بەقـەلای پێـشەوەی ئیـسلام ناسرابوون[١٩]، ئەمانەش وای کردووە هەلومەرجی سەربازی و سیاسـی بەشـێکی زۆری ئەم ناوچە سنووریانە جێگیر نەبێ[٢٠].

لێرەدا لەوە تێدەگەین کە هەلکەوتەی جوگرافیا کاریگەرییەکی زۆر دەکاتـە سـەر ڕووداوە مێژوییـەکان، بـەجۆرێك بـەلای هەنـدێ لـە توێـژەران شـوێن (جوگرافیـا) دروستکەرو شانۆی ڕووداوەکانـە بـەکۆی پێکهاتـە سروشـتیەکانیەوە کـە پەیوەنـدی تەواوکاری و یـەکانگیریان بەیەکـەوە هەیـە[٢١]، بـەلام ئەمـە هۆکـاری هـەموو ئـەو بارودۆخە نییە کە لەو ماوەیەدا بەسەر کوردستاندا هـاتووە، بـەلکو لەگەلێـدا چـەند فاکتەرێکی دی هەبوون کە پەیوەندییان بە خودی هێزەکانەوە هـەبووە، کـە خـۆی لـە خاسیەت و تایبەتمەندیی کۆمەلایەتی ئەوان و ئـەو ژینگـە سرووشـتییەی کـە تیایـدا ژیاون دەبینییەوە، بەتایبەت کە ژیانی سـەرەتایی و کـۆچ و ڕەو و جـەنجالی گـوزەرانی دانیشتوان و سەختی پەیداکردنی بژێوی و خۆراك و گەڕان بەدوای لـەوەڕگاو خواسـتی دەستبەسەرداگرتن و خۆسەپاندن کە لە هۆکارەکانی شەڕن[٢٢]، لـە سـیما دیارەکـانی هەندێ لەو هێزانە بووە غوزەکان و مەغۆلەکان نموونەی دیاری ئەو بارودۆخەن.

فاکتەری سیاسی و سەربازی پالنەرێکی تری لەشکرکێشییەکان بـوو کـە لـە دوو لایەنەوە کاریگەری هەبووە، لەلایەك لاوازی دەسەلاتی سیاسی و سەربازی خەلیفـەکانی

---

(١٩) قدامة بن جعفر، الخراج، ص ص ٢٥٣- ٢٥٤؛ بلەج شێرکۆ، کێشەی کورد مێژینـەو ئێـستای کـورد، چاپخانەی رزائی، چاپی دووەم، (تەورێز : ١٩٩٠)، ل٢٥.

(٢٠) ابن حوقل، صورة الأرض، دار مكتبة الحياة، (بيروت:١٩٧٩م)، ص ٢٠١.

(٢١) بڕوانە: ديورانت، دروس التاريخ، ص٤١؛ هاشم يحى الملاح، المفصل في فلسفة التاريخ، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٧م)، ص٣٩.

(٢٢) ديورانت، دروس التاريخ،ص١٥٦.

**عەبباسی کە پێشتر دەسەڵاتداری ناوچە کوردیەکان بوون، لە بەرامبەر چارەسەرکردنی کێشەکان و زاڵبوونی ڕەگەزی (تورك) بەسەر دەسەڵاتی خەلیفەو کەم توانایی دەوڵەت لە دانان و لابردنی بەئارەزووی خۆیان و بەرگرتنی لە خواستی جیابوونەوەی هەرێمەکان لە جەستەی دەوڵەت کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پەرەسەندندابوون[٢٣]، لەلایەکی تریش خۆی لە ئامانجەکانی ئەو هێزانە بۆ گەیشتن بە پایتەخت و فراوانخوازی و کۆنترۆڵکردنی ناوچەی زیاتر لە جیهانی ئیسلامیدا دەبینییەوە، زۆر جاریش خودی خەلیفە هۆکاری هاتنی لەشکری ئەو هێزانە بوو لەپێناو و بەئومێدی گەڕانەوەی شکۆمەندیی و هەژموونی لە دەستچووی و ڕزگاربوون لەو بارودۆخە خراپەی کە لەسەر دەستی هێزێکی دی تێی کەوتبوو[٢٤]، ئیتر ئەمانەو چەند هۆکارێکی دی بوونە هۆی ئەوەی کە جیهانی ئیسلامی بە گشتی و کوردستانیش بەتایبەت لەماوەی سەدەکانی (٤-٨ك/ ١٠-١٤ز) ڕووبەڕووی چەند لە شکرکێشییەکی دەرەکی ببێتەوە، کە کاریگەری و شوێنەواری گەورەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری یان لە دوای خۆیان بەجێ هێشتووە، لە میانەی لێکۆڵینەوەکەماندا هەوڵ دەدەین لە دیارترینیان بدوێین.**

---

[٢٣] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: ابن الجوزي، المنتظم في تاريخ الملوك والأمم، مطبعة دائرة المعارف العثمانية، (حيدر آباد:١٣٥٧هـ)،ج٦، ص٢٨٦؛ محمد الخضري، الدولة العباسية، دار المعرفة، الطبعة السابعة، (بيروت:٢٠٠٥م)، ص٢١٥؛ عبدالجبارناجي وآخرون، الدولة العربية الإسلامية في العصر العباسي، مركز الأسكندرية للكتاب، ٢٠٠٦؛ حسن منيمنة، تاريخ الدولة البويهية ( ٣٣٣-٤٤٧هـ/٩٤٥-١٠٥٥م)، الدار الجامعية، (بيروت:١٩٨٧م)، ص ص ٤٧ — ٨٠.

[٢٤] بۆ نموونە داواکاریی خەلیفە (القائم بأمرالله) ( ٤٢٢-٤٦٧ك/ ١٠٣٠ -١٠٧٤) لەسەرکردەی سەلجوقی (طغرلبك) بۆهاتنە ناو بەغداو ناردنی نوێنەری خۆی ساڵی (٤٣٢ك/ ١٠٤٠ز) بۆ شاری (ڕەی) بۆ گەیاندنی ئەم داوایەی خەلیفە پێی. بڕوانە: الراوندي، راحة الصدور وآية السرور، (عين الشمس:١٩٦٠)، ص ص ١٦٨ — ١٦٩.

بەم شێوەیە ئەو بارودۆخەی کە لەئەنجامی لاوازیی دەسەڵاتی ناوەنـدی عەبباسـی هاتبووە ئاراوە بەتایبەت لـە هەرێمـەکانی ڕۆژهەڵاتـدا هـەلی گونجـاوی ڕەخسـاند بـۆ دەرکەوتن و سـەرهەڵدانی چـەند بنەماڵەیـەك (هێزێـك)کـە توانییـان دەسـەڵاتێکی خۆجێیی بۆ خۆیان درووست بکەن و دواتریش چاویان بڕیبە ناوچـەکانی دەوروبـەریان و ئامانجی لەشکرکێـشی و فراوانخـوازی وای لـێ کـردن تەنانـەت هەڕەشـە لـە گرتنـی پایتەختی خەلافەتیش بکەن[٢٥]،کە لەم باسەدا بە پوختی لێیان دەدوێین.

## یەکەم/ (زەیاریەکان)[٢٦]:

زەیاریەکان نموونەیەکی دیار بوون لەو هێزە سیاسیانەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی کە لە چارەگی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینیدا لە ناوچەکە دەرکـەوتن و سەرەتا لە سوپای (سامانیەکان)[٢٧]دا خزمەتیان دەکرد، بەهۆی ئەو ڕۆڵـەی گێڕایـان

---

[٢٥] بۆ نموونە بڕوانە: عبدالمنعم سلامة، في تاريخ الدول الإسلامية المشرقية المستقلة عن الخلافة العباسـية، (الأسكندرية: ٢٠٠٥م).

[٢٦] (زەیاریەکان): بنەماڵەیەکی دەیلەمی بـوون دوای هەرەسـهێنانی میرنـشینی عەلـەوی لـە جورجـان و گیرستان سودیان لە بۆشایی سیاسی و کارگێڕی ناوچـەکە وەرگـرت و سـەرکەوتوو بـوون لـە دامەزرانـدنی میرنشینێکی بنەماڵەیی بەسەرکردایەتی (مرداویج کوڕی زەیار) کە ناوەکەشیان هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لـە (٣١٦ك- ٤٣٣ك/ ٩٢٨-١٠٤١ز) فـەرمانڕەواییان کـرد و لەسـەر دەسـتی سـەلجوقیەکان کۆتـایی بەدەسەڵاتیان هات. بڕوانە: ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، الطبعـة الثالثـة، (بـيروت: ٢٠٠٦م)، ج٤، ص ٥٠٨؛ عبدالعظيم رضايى، تاريخ ده هزار ساله ايران، (تهران: ١٣٨١ش)، جلد ٢، ص٣٨٧.

[٢٧] (سـامانیەکان) بنەماڵەیـەکی فـارس بـوون بـە سـەرکردایەتی (نـصر کـوڕی احمـدی سـامانی) وەك میرنشینەکانی تری ناوچەکە سوودیان لە بارودۆخەکە وەرگرت و لەناوچەکانی ئەو دیو ڕووبار و بلخ سمرقند بناغەی میرنشینێکیان داناو فەرمانڕەواییان لە ساڵی ( ٢١٦-٣٨٩ك/٨٧٥-٩٩٩ز) درێـژەی کێـشا، بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانـە: النرشـخي، تـاريخ بخـاری، دار المعـارف، الطبعـة الثالثـة، (القـاهرة:د.ت)،

پێگەی جەماوەرییان زیادی کرد و لە سامانییەکان جیابوونەوەو لە سەر دەستی سەرکردەی دیاریان مرداویج (٣١٦-٣٢٣ك/ ٩٢٨ - ٩٣٤ز)، کە بەنیازی زیندووکردنەوەی دەوڵەتداری فارس و کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایی عەرەب دەستی بە فراوانخوازی کرد لە ناوچەکەدا[٢٨]، ئەوەبوو ساڵی (٣١٩ك/٩٣١ز) بەسەرکردایەتی کوڕی خوشکەکەی[٢٩] لەشکرێکی نارد بەمەبەستی داگیرکردنی شاری همدان، بەڵام لە گرتنی شارەکەدا سەرکەوتوو نەبوو، تا دواتر خۆی بەلەشکرێکەوە هات و پەلاماری شاری همدانی دا و توانی داگیری بکات[٣٠]، وەدرێژەی بەپرۆسەکەی داو هەر لەوچوارچێوەیەدا پەلاماری شارەکانی ڕۆژ ئاوای هەرێمی چیاکانیشی دا[٣١]، دەستی

---

ص٩٠،ص١١١" طردیزي، تاریخ طردیزي، ضابخانة ارمغان، (طهران:١٣٦٣ه.ش)، ص٣١٩؛ حسن کریم الجاف، الوجیز في تاریخ ایران، الطبعة الثانیة، (اربیل: ٢٠٠٨م)، ج٢،ص ص ٣٢- ٤٥.

[٢٨] لەم بارەیەوە گوتوویەتی: (( انا ارید دولة العجم وابطل دولة العرب)) بڕوانە: الأزدي، تاریخ الموصل، دار الکتب العلمیة، (بیروت:٢٠٠٦م)، ج٢، ص٢٤١؛ الصولي، أخبار الراضي بالله والمتقي لله، دار المسیرة، (بیروت:١٩٧٩م)، ص٦٢؛ السیوطي، تاریخ الخلفاء، دار الأرقم، (بیروت: د.ت)، ص ٣٠٦؛ حسن ابراهیم حسن، تاریخ الإسلام السیاسي والدیني والثقافي الإجتماعي، ( بیروت: ١٩٦٥م) ج٣، ص٢٦؛ عبدالعظیم رضایی طنجینیة تاریخ ایران، انشارات اطلس، ضاث أول، (تهران: ١٣٧٨)، ج١٠، ص ٨٨٦.

[٢٩] لە سەرچاوەکاندا ناوی نەهاتووە هەر بە( ابن اخته) هاتووە بۆنموونە بڕوانە: ابن الأثیر، الکامل من تاریخ ، دار الکتاب العربي ،(بیروت: ٢٠٠٦م) ، ج٦، ص٧٥٨ " ابن خلدون، العبر، ج٤، ص ٥٠٨.

[٣٠] المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار المعرفة، الطبعة الأولى، (بیروت: ٢٠٠٥م)، مج ٢، ج٤، ص٣٣٩؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٥٠٨؛ عبدالمنعم سلامة في تاریخ الدول الإسلامیة، ص٣١٢.

[٣١] هەرێمی چیاکان و بەتایبەتی ڕۆژئاوای هەرێمەکە یەکێکە لە هەرێمە کوردنشینەکان: کە بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و بەشێکی باشووری کوردستانی ئەمڕۆی دەگرتەوە، وە گرنگترین شارەکانی (همدان، الدینور، قرمیسین(کرماشان)، نهاوند، سیروان، حلوان...)،، بڕوانە: قدامة بن جعفر، الخراج، ص٢٢٦؛ ابن حوقل، صورة الأرض، ٣٠٤؛ وەبڕوانە نەخشەی ژمارە(١)، ل١٤٧.

بەسەر هەریەك لەشارەکانی (کنگور و مرج قلعە وبروجرد و قرمیسین تا سنووری حلوان)دا گرت[٣٢]، خەلیفە (المقتدر) (٢٩٥-٣٢٠ك/ ٩٠٧- ٩٣٢ز) بەناچاری قبووڵی بارودۆخەکەی کرد، وە دانی بەدەسەڵاتی مرداویج دانا لەبەرامبەر بێبەش نەکردنی خەلیفە لە باجی ساڵانەی ناوچەکە[٣٣].

دوای ئەوەی مرداویج لەسەر دەستی سەربازێکی بەڕەگەز تورکی خۆی ساڵی (٣٢٣ك/٩٣٤ز) کوژرا[٣٤]، وشمکیر (٣٢٣-٣٥٧ك/٩٣٤-٩٦٧ز)ی برای جێی گرتەوەو درێژەی دا بەداگیرکردنی ناوچە کوردنشینەکان و بۆ ئەم مەبەستەش رووی کردە هەرێمەکانی ئازەربیجان[٣٥] و ئاران[٣٦]و لە ساڵی (٣٢٦ك/٩٣٧ز)

---

[٣٢] المسعودي، مروج الذهب، مج٢، ج٤،ص ٣٤٠؛ النويري، نهاية الأرب في فنون الأدب، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٤م) ج٢٦، ص٧؛ زرار صديق توفيق، الكورد في العصر العباسي حتى مجئ البويهيين (١٣٢-٣٣٤هـ/٧٤٩-٩٤٦م)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية آداب جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩٤م)، ص١٥٣.

[٣٣] ابن الأثير، الكامل ، ج٦، ص٧٦٠؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٥٠٨.

[٣٤] الصولي، أخبار الراضي، ص٦٢؛ عبدالعظيم رضايي، گنجينه تاريخ ايران، ج١٠، ص٩١٩؛ عزيز بيات، تاريخ ايران ازآغاز تاسلسله ی پهلوی، انتشارات جهاد، (تهران:١٣٨٤ش)، ص٢٧٥.

[٣٥] ئازربیجان: هەرێمێکی تری کوردنشینە شارەکانی (تبریز، مراغه، أشنه(شنۆ)، اورمیه، سلماس...) لە دیارترین شارەکانی ئەو هەرێمەن، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ابن حوقل، صورة الأرض، ص٢٨٥؛ مؤلف مجهول، حدود العالم، ص ١٩٩؛ حسام الدين النقشبندي، آذربيجان (٤٢٠-٦٥٤ه/١٠٢٩-١٢٥٦م)، أطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية آداب جامعة بغداد، (بغداد:١٩٨٤م)، ص٣٤.

[٣٦] ئاران و ئەرمینیا: دوو هەرێمی تری کوردنشین بوون کە هەندێ لە وڵات ناسان لەگەڵ هەرێمی ئازربیجاندا باسیان کردوون بە ناوی هەرێمی (رحاب- سێبەر) لە گرنگترین شارەکانیان ( برذعە، گنجە، تفلیس، کنگورن بیلقان، شیروان، باب الابواب، ملازگرد، بدلس، خلاط، ارجیش...) بڕوانە: ابن حوقل، صورة الأرض، ص٢٨٥؛ المقدسي، أحسن التقاسيم، ص ٢٨١؛ كوثر اسماعيل حسين، حياة الإقتصادية والإجتماعية في اقليم آذربيجان وآران، ص١٥، وشەی (ئاران) هەر لە بنچینەدا ناوێکی کوردییەو بە

بەسەرکردایەتی سەرکردەیەکی سەربازی خۆی بەناوی (لشکری) سوپایەکی نارد بۆ داگیرکردنی ناوچەکەو لەگەڵ هێزی سەربازی (دیسم کوری ابراهیم کوردی)[٣٧] ڕووبەڕووی یەکبوونەوەو سەرئەنجام دیسم شکستی هێناو لشکریش دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت[٣٨].

لە ڕاستیدا زەیاریەکان تاکە هێزی باڵادەستی ناوچەکە نەبوون، بەڵکو سامانییەکانیش بۆ هەمان مەبەست هەر لەسەرەتای سەدەی (٤ك/١٠ز) لە هەوڵداندا بوون، لەبەرئەوە ناوچەکە بوو بە مەیدانێك بۆ ململانێی نێوانیان، (ابو علی کوڕی محتاج) سەرکردایەتی هێزێکی سامانیەکانی کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فراوانخوازیەکانی و شکیری زەیاری و سەرکەوتووش بوو لەدەستبەسەرداگرتنی شارەکانی (نهاوندو الدینور تا حلوان)[٣٩].

لە لایەکی ترەوە هەرێمی ئازربیجان ئارامی بەخۆیەوە نەبینی دوای ئەوەی کە دیسم بەهاوکاری وشمکیر ئەنجارەیان دژی لشکری وەستایەوە و توانی دەست بەسەر ناوچەکەدا

---

مانای گەرمەسێر یان زستانە هەوار دێت، هەژار، هەنبانە بۆرینە (فرهنگ کوردی –فارسی)، چاپ سروش، چاپ سێیەم، (تهران:١٣٨١ش)، ل٣.

[٣٧] دوای کوژرانی (یوسف بن ابی الساج) والی ئازربیجان سالی (٣١٤ك/٩٢٧ز) دیسم کەوەك کەسایەتییەکی دیار و بەرپرس لەخزمەتی ابی الساج دا بوو، دەستی بەسەر هەرێمەکەدا گرت تا سالی (٣٤٥ك/٩٥٦ز) بەدەستی دەیلەمیەکان دەکوژرێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مسکویه، تجارب الأمم وتعاقب الهمم، دار الکتب العلمیة، (بیروت:٢٠٠٣م)، ج٥، ص ص٢٤٩ -٢٥٢؛ قادر محمد حسن، الإمارات الکوردیة، ص ص١٢ -٢٢.

[٣٨] مسکویه، تجارب الأمم، ج٥،ص٢٢١؛ محمدامین زکی، تاریخ الدول والامارات الکردیة فی العهد الاسلامی، دارالشؤن الثقافة، طبعة الثانیة، (بغداد:٢٠٠٦)،ص ص٧٦-٧٧؛ حسین حوزنی موکریان(سەرجەمی بەرهەمی)، دەزگای ئاراس، (هەولێر:٢٠٠٧)،ب ٢،ل١٨٠.

[٣٩] بڕوانە: النرشخی،تاریخ بخاری،ص١٣٧ومابعدها؛ابن الأثیر،الکامل، ج٧، ص ١٠٩.

بگرێتەوە [٤٠]، بەڵام دەرکەوتنی (مرزبان کوری مسافری دیلمی) وەکو سەرکردەیەکی سەربازی و بەپاڵپشتی دەیلەمیەکان مەترسی لەسەر دیسم درووست کرد، سەرئەنجامیش لە ڕووبەڕووبوونەوەیاندا شکست دەهێنێ و مرزبان دەست بەسەر ناوچەکانی ئازربیجاندا دەگرێت [٤١]، ئەو ململانێ سەربازییەی ناوچەکە زەمینەسازییەکی باش بوو بۆ دەرکەوتنی بنەماڵەیەکی تر لەسەر شانۆی سیاسی کە بە نۆرەی خۆیان کاریگەریی گەورەیان کردە سەر نەك هەر ناوچە کوردنشینەکان، بەڵکو جیهانی ئیسلامی بەگشتی و نەخشەی سیاسی ناوچەکەش بە جۆرێکی دی گۆڕا، ئەوانیش بوەیهییەکان بوون.

---

[٤٠] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص ص ٢٢٢ — ٢٢٣؛ احمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية الكردية (٢٩٣-٦٥٦هـ/٩٠٥-١٢٥٨م)، مطبعة وزارة التربية،الطبعة الثانية، (اربيل: ٢٠٠٦م) ، ص٨١.

[٤١] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٠٢٥؛ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص ١٠٩؛ كوثر اسماعيل حسين، الحياة الإقتصادية والإجتماعية في اقليم آزربيجان واران خلال القرنين (٤-٥هـ/١٠-١١م)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية اداب جامعة صلاح الدين (اربيل: ٢٠٠٢م) ص ٣٢.

## دووەم/ بوەیهیەکان[٤٢]:

مێژووی دەرکەوتنی ڕۆڵی سەربازی بنەماڵەی بوەیهی بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە لەژێر دەسەڵاتی (ماکان بن کاکی)[٤٣]دا بوون و بەشێك لە سوپای ئەویان پێك دەهێنا[٤٤]، بەڵام دوای دەرکەوتنی مرداویج و هەڵگیرسانی شەڕو ململانێ لەگەڵ (ماکان)دا، لە بەرامبەردا شکاو سێ کوڕەکانی بوەیهیش (علی و حسن وأحمد)[٤٥] بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا بینیوە کە پەیوەندی بە مرداویجەوە بکەن، دوای چوونە

---

[٤٢] (بوەیهی)یەکان: بنەماڵەیەکی دەیلەمی بوون نیشتەجێی ناوچەکانی دیلم و طبرستان وجیلان بوون لە سەدەی (٣ك/٩ز)دا موسڵمان بوون و لەسەر ئایینزای شیعەی زیدیە، توانیان ساڵی (٣٣٤ك /٩٤٥ز) بغدا بگرن و هەژموونیان بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا تاساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) درێژە بکێشێ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ابن الاثیر، الکامل ،ج٧،ص٥؛ النویري، نهایة الأرب، ج٢٦-٢٧، ص ٩٣؛ حسن منیمنة، تاریخ الدولة البویهیة؛ خاشع المعاضدي و رشید عبدالله الجمیلي، تاریخ الدویلات العربیة والإسلامیة (في المشرق والمغرب)، (بغداد:١٩٨٠)،ص٥٥؛ ستانلي لین پول، الدول الاسلامیة، مکتبة دراسات الاسلامیة، (دمشق:١٩٧٣م)، قسم الاول، ص٢٨٣.

[٤٣] سەرکردەیەکی دەیلەمی بوو ساڵی (٣٢٤ك/ ٩٣٦ز) دەستی بەسەر جورجاندا گرت تا ساڵی (٣٢٩ك/٩٤٠ز) لەسەر دەستی سەرکردەی سامانی (ابوعلی محتاج)دا دەکوژرێت، ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٥٦، و ص٩٢؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٥١٦.

[٤٤] مؤلف مجهول، العیون والحدائق في أخبار الحقائق، (دمشق:١٩٧٢م)، ج٤، ق١، ص٢٧٠؛ ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٧.

[٤٥] دوای دەستبەسەرداگرتنی بەغدا ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) نازناوی (عماد الدولة) بە (علی) برا گەورەیان و (رکن الدولة) بە(حسن)ی ناوەنجی و (معز الدولة) بە (أحمد)ی برا بچووکیان دەبەخشرێت و ئیتر بەو نازناوە ناسراون، الأزدي، تاریخ الموصل، ج٢، ص٢٧٧ " گردیزی، زین اخبار، ص٢٠٠؛ الهمذاني، تکملة تاریخ الطبري، دار المعارف (القاهرة:١٩٧٧م)، ص٣٥٤؛ فریدون اسلام نیا، نیگاهی بتأریخ ایران بعد از اسلام، انتشارات حسینی اصل، (ارومیە:١٣٨٣هـ)، ص٥٢.

پاڵیشی لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکاندا پشتی پێ بەستن[٤٦]، دوای کوژرانی مرداویجیش هەلی گونجاویان بۆ هەڵکەوت کە دەسەڵاتیان بەسەر چەند ناوچەیەکی هەرێمی چیاکاندا بسەپێنن[٤٧]، دواجاریش تەرازووی هێز لەبەرژەوەندی ئەواندا کەوتەوەو توانییان ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) دەست بەسەر بەغدا دا بگرن[٤٨].

مێژووی لەشکرکێشی بوەیهییش بۆ سەر ناوچە کوردیەکان و مەسەلەی دەستگرتنیان بەسەریاندا، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مرداویج کاتێك بڕیاری لە سەر دامەزراندنی (علی کوڕی بویه)دا لەسەر شاری کرج کە دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی همدانەوە[٤٩]، کە سەرکەوتوو بوو لە ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی ناوچەکە بەلای خۆیاندا، بەماوەیەکی کەم، بەهۆی ئەو سیاسەتەی پەیڕەویان کرد[٥٠]، ئەم هەلەشیان سوود لێ وەرگرت بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکانی هەرێمی چیاکاندا[٥١]،

---

[٤٦] مؤلف مجهول، العيون والحدائق ، ج٤، ق١، ص ص ٢٧١ -٢٧٢؛ النويري، نهاية الأرب، ج٢٦، ص ص٩٤-٩٥؛ ابراهيم عبدالمنعم سلامة في تاريخ الدولة الإسلامية، ص٣١٦؛ ريچارد فراى، عصر زيرين فرهنگ ايران، چاپخانه سروش، (تهران:١٣٦٣ش)، ص٢٢٦.

[٤٧] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٣٢٤؛ العمرى، مسالك الابصار فى ممالك الامصار، مجمع الثقافى، (ابوظبى:٢٠٠٥م)، ج٢٦، ص ص١١٧-١١٨؛ خاشع المعاضدي، تاريخ الدويلات العربية والإسلامية، ص٥٨.

[٤٨] الأزدي، تاريخ الموصل، ج٢، ص ٢٧٧؛مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٢٧٥؛ ايليا برشينايا، تاريخ ايليا برشينايا، مجمع اللغة السريانية، (بغداد:١٩٧٥م)، ص١٩٢؛ الهمذاني، تكملة تاريخ الطبري، ص٣٥٣.

[٤٩] ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٥١١؛ ستانلي لين پول، الدول الاسلامية، ق١، ص٢٨٣.

[٥٠] اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقضان، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧م)، ج٢، ص٢٤٥، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حسن منيمنة، تاريخ الدولة البويهية، ١٦٩ وما بعدها.

[٥١] مؤلف مجهول، العيون والحدائق، ج٤،ق١، ص٢٨٤؛ شوقي ضيف، عصر الدول والإمارات، دار المعارف، الطبعة الرابعة، (القاهرة:١٩٩٦م)، ص٢٣٣.

هەر بەسوود وەرگرتن لە پێگەی جەماوەرییان سنووری دەسەڵاتیان بەشێك لە شارەكانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاكانیشی گرتەوە تا سنووری حلـوان[٥٢]، دوای ئـەو فراوانخوازییـە سێ كوڕانی بوەیهی سنووری ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتیان لە نێوان خۆیاندا دابەش كرد، بەم جۆرە (عماد الدولة- علی) وڵاتی فارس و (روكن الدوله -حسن) اصفهان و (معز الدولة- أحمد)یش كرمان و ئەهوازی بەركەوت[٥٣]، بەڵام، دەركەوتنەوەی جارێكی تری سامانیەكان لە ناوچەكەدا وەكو ركەبەری بوەیهیەكان ئارامی هەرێمەكەی تێكدایـەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی كە سەركردەی هێزی سامانی (منصور كـوڕی قـراتكین) سـاڵی (٣٣٩ك/٩٥٠ز) هێرشی كـردە سـەر هـەرێمی چیاكان دەسـتی بەسـەر بەشـێكیدا گرت[٥٤]، (معز الدولة)یش بـۆ بـەرگرتن لـە فراوانخـوازی سـامانیەكان و گرتنـەوەی ناوچەكە (سبكتكین الحاج)[٥٥]ی سەركردەی ڕاسپارد بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، ئەویش تـا قرمیسین (كرماشان) و همدانی داگیر كردەوە[٥٦]، بەم شێوەیە ئەو بەشـەی كوردسـتان بوو بە مەیدانێك بۆ ململانێی نێوان هێزەكان، لەلایەكی تریشەوە پەیوەندیی برایـەتی نێوان بوەیهیەكان لە ناو خۆیان هەروا بە ئاسایی و بەهێزیی نەمایەوە بەتایبـەت دوای

---

[٥٢] ابن الجوزي، المنتظم، ج٦، ص٢٧١؛ حسام الـدین علـی غالـب نەقـشبەندی، شـارەزوور و لوڕسـتانی باكوور لە سەدەكانی ناوەڕاستدا، چاپخانەی حەمدی،( سلێمانی: ٢٠٠٨ز)، ل٢٠٢.

[٥٣] ابن الأثیر، الكامل، ج٧، ص٥٣؛ نیشتمان بشیر محمد، الأحوال الـسیاسیة والإجتماعیـة والإقتـصادیة لغربي الأقلیم الجبال، رسالة ماجستیر غیر المنشورة، مقدمة الی مجلس كلیـة آداب جامعـة صـلاح الـدین، (اربیل: ١٩٩٤م)، ص٥٠.

[٥٤] مـسكویه، تجـارب الامـم، ج٥،ص٢٩٤؛ حـسام الـدین نەقـشبەندی، شـارەزوور و لوڕسـتانی بـاكوور، ل٢٠٢.

[٥٥] بەرەگەزتورك و سەركردەیەكی معز الدولەی بـوەیهی بـوو سـاڵی٣٦٤ك/٩٧٤ز مـردووە، بڕوانـە: ابـن الجوزی، المنتظم، ج٧، ص ص٧٦-٧٧.

[٥٦] مـسكویه، تجـارب الامـم، ج٥، ص٢٩٥؛ ابـن الأثـیر، الكامـل، ج٧، ص ١٩٠؛ محمـدامین زكـی، خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان، چاپخانەی دار السلامی، (بغداد:١٩٣١ز)، ج١، ل١٣١.

مردنی (معز الدولة) لـه سـاڵی (٣٥٦ك/٩٦٦ز)[٥٧]، ئیـدی لەسـەر فراوانخـوازی و چاوتێبڕینی ماڵ و موڵکی یەکتری شەڕی نێوانیـان دەسـتی پێکـرد، کـە تـا کۆتـایی فەرمانڕەواییان درێژەی کێشا، کەبێ گومان بەشێك لە ناوچە کوردنشینەکان مەیـدانی شەڕەکانی نێوانیان بوو، تێوەگلان و بێلایەن نەبوونی کوردیش لـە ململانێـی نـاوخۆی بوەیهییەکاندا کاریگەرییەکانی بۆ سەر کورد زیاتر کرد.

## سێیەم/ غوز[٥٨] وسەلجوقیەکان[٥٩]:

خەلافەتی عەبباسی لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٥ك/١١ز) بەقۆناغێکی نالەباردا گوزەری کرد، ناسارامی سیاسـی و ململانێـی نێـوان میرانـی بـوەیهی و گرفتـاربوونی خەلیفەکانی عەبباسی بەدەستیانەوە لـە سـیما دیارەکـانی ئـەو قۆناغـە بـوون، لـەو

---

[٥٧] ابن الجوزي، المنتظم، ج٧، ص٣٨؛النويري، نهاية الأرب،ج ٢٦-٢٧، ص ١١٠؛ الذهبي،تاريخ الاسلام (حوادث٣٥١-٣٨٠ه)، دار الكاتب العربي، (بيروت:٢٠٠٣م)، ص١٣٦؛ فاضل الخالدي، الحيـاة الـسياسية ونظم الحكم في العراق (خلال القرن الخامس الهجري)، دار الأديب، (بغداد: ١٩٦٩م)، ص٣١ وما بعدها.

[٥٨] غوز بەو هۆزەشوانکارە تورکانە دەگوترێت کـە لـە ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای چین و کـەنارەکانی دەریـای قەزوین لە لەوەڕگەدا دەگەڕان و ژیانیان لەسەر کۆچ و ڕەو بەند بوو، (غـوز) یـان (تـەموقوز) بـەمانای(نـۆ) دێت لە زمانی تورکیدا کە لە ژمارەی هۆزەکانیانەوە هاتووە، سەلجوقیەکانیش بنەماڵەیەك بوون لەو نۆ هۆزە، گردیزی، زین اخبار، صـس٥٦٧؛ الحسيني، زبدة التواريخ، ص٢٣.

[٥٩] سەلجوقیەکان: بنەماڵەیەك بوون لە نۆ هۆزەکانی غوز کە نیشتەجێی دەشتەکانی تورکستان و ئەو دیو زێ بوون، موسڵمانی سونی مەزهەب بوون، ناوەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ باپیرە گەورەیان (سلجوق بن دقـاق یان تقاق)، بڕوانە: گردیزی، زین اخبار،ص٤١٠؛ الراوندي، راحة الـصدور، ص١٤٧؛ حـسين أمـين، تـاريخ العراق في العصر السلجوقي، مطبعة الإرشاد، (بغداد: ١٩٦٥م)، ص٤٥؛ سعيد عبالفتـاح عـشور، تـاريخ العلاقات بين الشرق والغرب في عصور الوسطى، دار النهضـة العربية، (بيروت:٢٠٠٣م) ، ص٣٥.

هەلومەرجەدا رۆژهەڵاتی ئیسلامی ڕووبەڕووی چەند شەپۆلێکی یەك لە دوای یەکی هێرشی ژمارەیەك هۆزی ڕۆژهەڵات بۆوە، کە بە غوز ناسرابوون، دواتریش بەناوی تورکمان ناویان دەرکرد[٦٠]، پەلامارو هێرشی ئەو هۆزانە بۆ سەر جیهانی ئیسلامی بەڕووداوێکی گەورەو ترسناك دەژمێررێت، لەبەر ئەو شوێنەوارە جۆربەجۆرانەی لەسەر ناوچەکە بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی بەجێیان هێشت، ئەگەرچی مێژوونووسان کۆك نین لەسەر بەرواری یەکەمین کۆچی ئەوان، بەڵام هاوڕان لەسەر دەرکەوتنیان لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٥ك/١١ز)[٦١]، یەکەم شەپۆلی غوز ناوچەکانی ئازربیجان لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی میرنشینی ڕەوادی کوردی (٣٣٧-٤٦٣ك/٩٤٨-١٠٧١ز) گرتەوە، میر وهسوزانی ڕەوادی (٤١٦-٤٥٠ك/١٠٢٥-١٠٥٨ز) بەئامانجی دوورخستنەوەی مەترسییان لەسەر ناوچەکە دەرگای بەڕوودا کردنەوە[٦٢]، ڕەنگە سیاسەتی (محمودی کوڕی سبکتکین) (٣٨٨-٤٢١ك/٩٩٨-١٠٣٠ز) سوڵتانی دەوڵەتی غەزنەوی هۆکارێکی ڕاستەوخۆبووبێ بۆ کۆچی ئەو پۆلە غوزە، چونکە ژمارەیان زۆر زیادی کردبوو، دەشێ لەسەر چارەنووسی دەوڵەتەکەی بەمەترسی زانیبێ و لێیان ترساو[٦٣] بۆیە (ارسلان ی کوڕی تقاق)ی سەرکردەیانی بەند کردو کەوتە

[٦٠] کارل بروکلمان، تاریخ الشعوب الإسلامية، دار العلم للملايين، الطبعة الخامسة، (بيروت:د.ت)، ص٢٧٢.

[٦١] ابن الأثير، الكامل،ج٧، ص٧١٨؛ أحمد كسروى، شهرياران گمنام، چاپ پيروز، چاپ دومين، ١٣٣٥ش، ج٢، ص١٨٠.

[٦٢] ابن الأثير ، الكامل ، ج٧، ص٧١٨؛ نیشتمان بەشیر محەمەد، کوردو سەلجوقیەکان (٤٢٠-٥٢١ك/١٠٢٩-١١٢٧ز)، دەزگای موکریانی، چاپی دووەم، (هەولێر:٢٠٠٦ز)، ل٧٧.

[٦٣] اليزدي، العراضة في الحكاية السلجوقية، (بغداد: ١٩٧٩م) ص٢٥.

ڕاوەدوونانی هۆزەکانی غوزیش ئەوانیش بە ناچاری خۆراسانیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە قوڵایی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، کە ژمارەیان دوو هەزار خێوەت دەبوو[٦٤].

هێشتا کاریگەری و تەوژمی ئەو بارە خراپەی ئەو شەپۆلە لەسەر ناوچەکە هەر مابوو، کە شەپۆلی دووەم بەرەو ناوچەی هەرێمی چیاکان و هەمان ناوچەی تازرییجان دەستی پێکرد، ئەویش دوای ئەو پەلامارەی لەلایەن (تاج فراش)ی سەرکردەی سەربازی سوڵتان (مسعودی غەزنەوی) (٤٢١-٤٣٢ك/١٠٣٠-١٠٤٠ز) کرایە سەریان[٦٥]، سەرباری توندوتیژی غەزنەویەکان بەرامبەریان، گیرۆدەبوونی هۆزە غوزەکان بەدەست ڕێژەی زۆری دانیشتوان و بێ ئیویی ژینگەکەیان لە فەراهەمکردنی بژێوی ڕۆژانەیان، بەردەوامی بە شەپۆلی کۆچەکانیان دا ، بەتایبەت ئەگەر بزانین تالانکاری و دەستبەسەرداگرتن نەریتێکی کۆمەڵایەتی ئەوان بوو، لەلایەکی تریش خێرو بێری هەرێمی چیاکان و هەرێمی جزیرەیان لەبەر چاوبوو، لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو کە ئەو هەرێمە کوردییانە تووشی کۆچە چاوەڕوان کراوەکانی ئەوان بن و بکەونە بەر تالانکارییان[٦٦]، بەگشتی لەماوەی کەمتر لە (٢٥) ساڵ واتە لە (٤١٠ - ٤٣٥ك/١٠١٩-١٠٤٣ز) ناوچەکانی کوردستان زیاتر لەچوارجار باری شالاوی

---

[٦٤] الراوندي، راحة الصدور ،ص ص١٤٨ – ١٤٩؛عبدالله رازي، تاريخ كامل ايران، چاپ اقبال، چاپ ١٦، (تهران:١٣٧٩ش)، ص١٩٥.

[٦٥] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٧١٦.

[٦٦] بڕوانە: مؤلف، مجهول، حدود العالم، ص ٦٩؛ ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص ص ٧٢١ – ٧٢٥؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص ٣١٢؛ بارتولد، تاريخ الترك في آسيا الوسطى، ترجمة أحمد سعيد سليمان، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة:١٩٩٦م)، ص١١٩؛ كرڤان محمد أحمد آميدي، الكرد في كتابات المؤرخ ابن الأثير الجزري، دار سپيرێز، (دهوك:٢٠٠٦م)، ص١٨٢.

ئەوانیان تاقیکردەوە[٦٧]، ئەگەرچی نەیانتوانی دەسەلاتی سیاسی لەناوچەکە بگرنە دەست، بەلکو ئامانجی ئەو شالاوانە زیاتر بەهۆی پالنەری ئابووری بۆ دادۆشینی خێرو بێری ولاتەکە بوو، بەلام سەرەتایەکیش بوو بۆ سەرهەلدان و دەرکەوتنی سەلجوقیەکان.

دەرکەوتنی سەلجوقیەکان لەسەر شانۆی سیاسی ناوچەکە بە قۆناغێکی گرنگی مێژوویی دادەنرێت، بەسوود وەرگرتن لە بارودۆخی ناوچەکانی ئەو دیوو ڕووبار و خۆراسان و ئازربیجان دەسەلاتی سیاسی خۆیان پەرە پێدا[٦٨]، ئەمەش وای لە سولتان (مسعودی غەزنەوی) کرد لەو پەرەسەندنەیان هەلوێست وەربگرێت و ڕووبەڕوویان بێتەوە، سەرئەنجامیش لە شەڕێکی یەکلاکەرەوە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە کە ئەویش شەڕی (داندانقان) بوو سالی (٤٣١ك/١٠٣٩ز) کە بە سەرکەوتنی سەلجوقیەکان کۆتایی هات[٦٩]، ئەم شەڕە بەدوا بازنەی ململانێی نێوانیان دادەنرێت بەهۆی ئەو ئەنجامانەی کە لێی کەوتنەوە، دەسەلاتی غەزنەوی بەرەو پوکانەوە چوو، سەلجوقیەکانیش بەسەرکردایەتی طغرل بك توانییان دەست بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا بگرن و هەژموونیان زیادی کرد[٧٠]، هەرێمە کوردیەکانیش

---

[٦٧] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٧١٨؛ حسام الدین النقشبندي، آذربیجان، ص١٥٣.

[٦٨] ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٧٨٤؛ الیزدي، العراضة في حکایة السلجوقیة، ص٣٨.

[٦٩] گردیزی، زین اخبار، ص٤٣٧؛ الیزدي، العراضة، ص ص٣٣–٣٥؛ عبدالنعیم محمد حسنین، سلاجقة ایران والعراق، الطبعة الثانیة، مکتبة النهضة المصریة، (القاهرة:١٩٧٠م)، ص٢٩؛ عبدالعظیم رضایی، گنجینه تاریخ ایران، جلد یازدهم، ص١٨٦.

[٧٠] الراوندي، راحة الصدور، ص١٦٠؛ الیزدي، العراضة في حکایة السلجوقیة، ص ص٣٦-٣٧؛ عبدالنعیم محمد حسنین، سلاجقة ایران والعراق، ص٢٩، آربري ، تاریخ اسلام، ترجمة أحمد آرام، انتشارات امیر کبیر، چاپ پنجم، (تهران:١٣٨٥، ص٢١١؛حسن الجاف، الوجیز، ج٢،ص١٢٩؛ محمد صالح الزیباري، سلاجقة الروم في آسیا الصغری، دار دجلة، (عمان:٢٠٠٧م)، ص٥١.

بەشێك بوون لەبەرنامەی کاری داهاتووی، بۆیە بە سەرکردایەتی ابراهیم ینـالی دایـك برای، ساڵی (٤٣٤ك/ ١٠٤٢ز) لەشکرکێشی کرایە سەر هەرێمی چیاکان و دەستی بەسـەر چـەند شـارێکدا گـرت[٧١] ، ئـەو سـەرکەوتنانەی وای لـە خەلیفـە (القـائم بأمرالله)(٤٢٢-٤٦٧ك/١٠٣٠-١٠٧٤ز) کرد داوای هاتنە ناوەوەی بەغدا لـە طغـرل بك بکات[٧٢] ، بەڵام سەرقاڵیی بە جەنگەکان و فراوانخوازیـەکانی لـە ڕۆژهـەڵات ئـەم داوایەی خەلیفەی دواخست.

لە ڕاستیدا ویستی فراوانخوازی طغرل بك وابوو کە دەست بگرێت بەسـەر هـەموو جیهانی ئیسلامی دا، بۆ ئەو مەبەستەش داوای لە ابـراهیم ینـال کـرد درێـژە بـەکارە سـەربازییەکانی بـدات بـەرەو ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای هـەرێمی چـیاکانیش، ئـەوەبوو ساڵی(٤٣٧ك/١٠٤٦ز) شارەکانی قرمیسین و حلوانی داگـیر کـرد[٧٣] ، لەشکرکێـشی سەلجوقیەکان هەرێمـەکانی ئازربیجـان ئـاران و ئـەرمینیاو جزیرەشـی گرتـەوە، دوای تەواوکردنی پرۆسەی دەستبەسەرداگرتنی ڕۆژهـەڵاتی ئیـسلامی و داگیرکردنـی بەشـی زۆری ناوچە کوردنشینەکان، ویستی بەدەم داواکاری خەلیفە (القائم بامرالله)وە بـچێت کە ئەوکات لە بارودۆخێکی خراپدا بوو، بەهۆی سـەرهەڵدانی بزووتنـەوە یاخییەکـەی (بساسیری)[٧٤] ، بۆ ئەو مەبەستەش بە لەشـکرێکی گـەورەوە بـە کوردسـتاندا بـەرەو

---

[٧١] الراوندي، راحة الصدور، ص١٦٨؛ حسام الدين نەقشبەندی، شارەزوور، ل ٣٣٧.

[٧٢] الأصـفهاني، تـاريخ دولـة ال سـلجوق، دار الكتـب العلميـة، (بـيروت: ٢٠٠٤م) ص١٨٧؛ اليـزدي، العراضـة، ص٣٨؛ خليـل ابـراهيم الـسامرائي، تـاريخ الدولـة العربيـة الإسـلامية في العـصر العباسـي، (الموصل:١٩٨٨م) ص ٢١٢.

[٧٣] الأصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص١٨٦؛ المقريزي، السلوك، ج١، ص١٣٩.

[٧٤] ابوالحـارث ارسـلان البـساسيري ( م.لـە ٤٥٠ك/١٠٥٨ز) بەڕەگـەز تـورك بـوو، ماوەیـەك لێپرسـراوی حامیەی بەغدا بوو، بەڵام دواتـر پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ خەلیفـە بـەرەو ئـاڵۆزی چـوو، دەسـتی کـرد بـە بانگەوازی بۆ شیعەگەرایی سەرکردایەتی جوڵانەوەیەکی گەورەی کرد کە نزیکەی چوار ساڵی خایاند دواتـر

بەغدا کەوتە ڕێ و لە (ڕەمەزانی٤٤٧ك/١٠٥٥ز) دەستی بەسەردا گرت و کۆتایی هێنا بە حوکمی بنەماڵەی بوەیهی[٧٥]، بە داگیرکردنی بەغدا پرۆسەی هێرشکردنە سەر کوردستان کۆتایی نەهات، بەڵکو تا سەردەمی دوای طغرل بك یش درێژەی کێشا، بەتایبەت لە سەردەمی الب ارسلان (٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٢-١٠٧٢ز) دا، کە گۆڕانێکی ڕیشەیی بەسەر سیستەمی فەرمانڕەوایی سەلجوقی دا هات، کاتێك کە بڕیاری لەسەر پەیڕەوکردنی دەسەڵاتی ناوەندیی دا، بەئامانجی دەستگرتن بەسەر هەموو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لەناویشیدا ناوچە کوردییەکان[٧٦]، ئەمەش کاریگەری کردە سەر چارەنووسی میرنیشینە کوردییەکان.

بارودۆخی ناوچەکانی کوردستان لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا ئارامی بە خۆیەوە نەبینی بەهۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی و کێ بڕکێی بنەماڵەیی کە بەتایبەت دوای مردنی ملکشاه (٤٦٥-٤٨٥ك/١٠٧٢-١٠٩٢ز) دەستی پێکرد[٧٧]، کاتێك کە

---

لەسەر دەستی سەلجوقیەکان جوڵانەوەکەی دامرکایەوەو بۆخۆشی کوژرا، الحسيني، زبدة التواريخ، دار اقرا، الطبعة الثانية، (بيروت:١٩٨٦)، ص٥٩؛ ابن العديم، بغية الطلب في تاريخ حلب، مطبعة الجمعية التاريخية التركية، (انقرة:١٩٧٦م)، ص١؛المقريزي، اتعاظ الحنفا بأخبار الأئمة الفاطمين الخلفا، مطبعة الاهرام، (القاهرة:١٩٧١)، ج٢، ص٢٣٢؛ صالح رمضان حسن، مقاومة الخلافة العباسية للنفوذ السلجوقي، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة الموصل، (الموصل:١٩٧١)، ص٥٢.

[٧٥] ابن الجوزي، المنتظم، ج٨،ص١٦٣" الذهبي، دول الإسلام، الطبعة الأولى، (بيروت:١٩٩٩م)، ج١، ص٣٨٤؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهر في ملوك المصر والقاهرة، المؤسسة المصرية العامة، (القاهرة:د.ت)، ج٥، ص٥٧؛ حسن أمين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٥٨.

[٧٦] بڕوانە: الراوندي، راحة الصدور، ص ص١٨٦ ، ١٨٨، ١٩٤.

[٧٧] ابن القلانسي، ذيل تاريخ دمشق، مطبعة الآباء اليسوعيين، (بيروت: ١٩٠٨) ، ص١٢٢؛ البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٨١؛ أحمد كمال الدين الحلمي، السلاجقة في التاريخ والحضارة، دار البحوث العلمية، الطبعة الأولى، (الكويت: ١٩٧٥م)، ص٤٥.

تورکان خاتوون (م.له ٤٨٥ك/١٠٩٢ز) خێزانی ملکشاه ویستی محمودی تەمەن چوار ساڵەی کوڕی بکرێتە جێنشینی باوکی لەبری برکیاروق (٤٨٥- ٤٩٨ك/١٠٩٢-١١٠٤ز)ی براگەورەی[٧٨]، بیرۆکەی لەسەر تەخت دانیشتنی محمودیش بەلای زۆرێك لە سەرکردە سەربازیەکان و خەڵکانی تریش قبوڵ نەکرا، سەرئەنجام شەڕی نێوانیان دەستی پێکردو بەسەرکەوتنی (برکیاروق) کۆتایی هات[٧٩]، دواتریش برکیاروق خۆی لەبەردەم شەڕی محمد (٤٩٨-٥١١ك/ ١٠٩٢-١١١٧ز)ی برای[٨٠]، وە(تاج الدولة تتش)ی مامی دا بینیەوە، کوردستان مەیدانی زۆر لەو شەڕو ململانێیانە بوو[٨١]، درێژەکێشانی شەڕی ناوخۆی سوڵتانەکانی سەلجوقی تا ئەو ڕادەیە کاریگەر بوو، کەخەلیفەی عەبباسییش تێوە گلاو نەیتوان بێلایەن بێت[٨٢]، بەهەرحاڵ ناکۆکی

---

[٧٨] الاصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٢٣٦؛ كرماني، سلجوقيان وغز دركرمان، چاپ گلرنگ يكتا، (تهران: ١٣٨٦ش) ، ص٢٥٨؛ القرماني، أخبار الدول والآثار الأول في التاريخ، عالم الكتب، (بيروت: د.ت)، ص٢٧٣.

[٧٩] البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٨١؛ ابوالفداء، مختصر في أخبار البشر، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى، (بيروت: ١٩٩٧م)، ج٢، ص٣٠.

[٨٠] ابن القلانسي، ذيل تاريخ دمشق، ص١٣٧؛ كرماني، سلجوقيان و غزدر كرمان ، ص٢٦٤؛ ابوالفداء، مختصر في أخبار البشر، ج٢، ص٣٠.

[٨١] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص٣٦٩؛ ابن واصل، مفرج الكروب فى اخبار بنى أيوب، مطبعة جامعة فؤاد الاول، ١٩٥٣،ص ص٢٤ - ٢٥؛ عبدالنعيم حسنين، سلاجقة ايران والعراق، ص٨٥؛ صالح رمضان حسن، مقاومة الخلافة العباسية، ص٨٠.

[٨٢] بۆنموونە خەلیفە (مسترشد باللە) (٥١٢-٥٢٩ك/١١١٨-١١٣٥ز) بۆ شەڕی سوڵتان (مسعود) لەبەغداوە بەسوپایەکەوە بەڕێ کەوت بەرەو همدان سەرەنجام بەدیل دەگیرێت و لە بەندیخانەیەك لە نزیك همدان ساڵی (٥٢٩ك/١١٣٥ز) غافڵ کوژ دەکرێت. ابن الأثير، التاريخ الباهر في الدولة الأتابكية، مكتبة المثنى، ( بغداد: ١٩٦٣م)، ص ص ٤٨-٤٩؛ ابن دحية ، كتاب النبراس في تاريخ خلفاء بنى العباس،

بنەماڵـەی سـەلجوقی لەسـەر دەسـەڵات و لاوازی دەسـەڵاتی خەلیفـە و تـەنها بـەناو هێـشتنەوەی زەمینـەسـازییەکی گونجـاو بـوو بـۆ دەرکـەوتنی هێزێکـی تـر بـەناوی (خوارزمیەکان)[٨٣]، ئەوانیش بـەنۆرەی خۆیـان کەوتنـە ململانـێ و کێبڕکـێ لەسـەر دەسـەڵات لەگـەڵ (ئەتابکیـەکان)[٨٤]، کـە وەك سیـستەمێکی نـوێی کـارگێڕی سـەلجوقیەکان لـە سـەدەی (٦ك/١٢ز) لەزۆربـەی ناوچـەکانی جیهـانی ئیـسلامی دەرکەوتبوون[٨٥].

## چوارەم/ خوارزمیەکان:

خوارزمیەکان بەسوود وەرگرتن لە بارودۆخی خراپی دەسـەڵاتی سـەلجوقی توانییـان شێوە سەربەخۆیی خۆیان ڕابگەیەنن و پاشانیش کەوتنە پەلهاویشتن و پاوانخوازی بـەرەو ناوچـەکانی دەوروبـەریان لەوانـەش ناوچـە کوردییـەکان، بەتایبـەت لـە سـەردەمی

مطبعة المعارف، (بغداد: ١٩٤٦م)، ص١٥١؛ الكتبى، فوات الوفيات، دار صادر، ( بيروت : د.ت)، مج ٣، ص١٨١.

[٨٣] بەناوی هەرێمی (خوارزم)ی ئەودیو ڕووبار ناسراون، بەشێك بوون لە ئەتابکیەکانی سەلجوقی و لەگەڵ لاوازبوونی سەلجوقیـەکان سـەربەخۆییان لە دەسەڵاتیان ڕاگەیاند و حوکمڕانییان لـە(٤٧٠ -٦٢٨ك/١٠٧٧-١٢٣٠ز) درێژەی کێشاو لەسەر دەستی مەغۆل کۆتایی بەدەسەڵاتیان هات بۆ زانیاری بروانە: نافع توفيـق العبود، الدولة الخوارزمية، (بغداد: ١٩٧٨م)؛ ستانلى لين پول, الدول الاسلامية، ق١، ص٣٧٨.

[٨٤] ئەتابك: وشەیەکی تورکی یە(ئەتا) بەمانای (باوك) (بك) بەمانای (میر) دێت واتە (باوکـە میر یـان پـەروەردەکاری مـیر)، کـە سـەلجوقیەکان کەسـێکیان دادەنـا بـۆ سەرپەرشـتیکردنی منداڵـەکانیان وەکـو بەڕێوەبەری هەرێمـەکان، القلقـشندي، صبح الأعـشى وصـناعة الإنـشاء، دار الكتـب العلميـة، (بيروت: ١٩٨٧م)، ج٤ ، ص١٨؛ العمرى،مسلك الابصار، ج٢٦،ص٢٧٣" حسن الباشـا، الالقـاب الاسـلامية فـى التاريخ والوثائق والاثار، مكتبة النهضة المصرية، ( القاهرة: ١٩٥٧م)،ص١٢٢.

[٨٥] حسين امين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٢٠٩؛ عزيز بيات، تاريخ ايران، ص٣١٢.

(علاءالدين خوارزم شاه)دا(٥٩٦-٦١٧ك/١١٩٩-١٢٢٠ز) فراوانخوازى زۆريان بەخۆوە بينى[٨٦]، بەمەشەوە نەوەستاو وەك نەريتى هێزەكانى پێشووتر هەوڵيدا دەست بەسەر بەغدا دا بگرێت[٨٧]، بە هەوڵدانيش بۆ جێبەجێكردنى ئەو پرۆژەيەى جيهانى ئيسلامى تووشى بارێكى ناهەموار كرد، بەتايبەتيش كوردستان كە وەك هەميشە كەوتۆتە بەر شاڵاو و لەشكركێشى هێزەكان لەكاتى تێپەڕبوونياندا بەرەو بەغدا، بەم شێوەيە شارەكانى هەرێمى چياكان و رۆژئاواى هەرێمەكە كەوتنە بەر لەشكركێشى خوارزميەكان هەر لە همدانەوە تا حلوان[٨٨]، لەسەردەمى سوڵتان (جلال الدين منكبرتى) (٦١٧-٦٢٨ك/١٢٢٠-١٢٣٠ز)يشدا شاڵاوێكى نوێ لە پرۆسەى داگيركردنى كوردستان دەستى پێكردو رەنگە شارى خلاط باشترين وێنەى قوربانيى لەشكركێشييەكەى بووبێت[٨٩]، خراپى بارى ئابوورى و هەڵپەى دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانى خەڵكداو تاڵانكارى پاڵنەرى كاريگەرى خوارزميەكان بوو، بۆ لەشكركێشى كردنە سەر شارەكانى كوردستان بەگشتى و خلاط بەتايبەتى، لەبەر ئەوەش ئەو شارە بوو بە مەيدانى ململانێى نێوان ئەوان و دەسەڵاتى بنەماڵەى

---

[٨٦] ابن الأثير، الكامل،ج١٠، ص٣٤٣ ؛ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، دار الكتب العلمية ، (بيروت: ١٩٩٦م)، ج٢، ص١٣٨؛ حسن الجاف، الوجيز، ج٢، ص١٨٧.

[٨٧] ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص٢٩٩؛ ابوشامه، نزهة المقلتين في سيرة الدولتين العلائية والجلالية، دار التكوين، (دمشق: ٢٠٠٨م)، ص٩ ؛ القزويني، لب التواريخ، ص١١٦؛ فؤادعبدالمعطي الصياد، المغول في التاريخ، دارالنهضة العربية، (بيروت: د.ت)، ج١، ص٦٩.

[٨٨] ابن الأثير، الكامل،ج١٠، ص ص ٢٩٩- ٣٠٠؛ ابو الفداء، مختصر اخبار البشر، ج٢، ص٢١١؛ ادريس حسن الدوسكي، همدان من الفتح الإسلامي الى سقوطها بيد المغول، دار سپيريز، الطبعة الأولى، (دهوك: ٢٠٠٦م) ص ١٣٢.

[٨٩] بۆ زانيارى زياتر بروانە: حكيم عبدالرحمن البابيرى، مدينة خلاط (٤٩٣-٦٤١هـ/١١٠٠-١٢٤٣م)، دار سپيريز، الطبعة الأولى، (دهوك: ٢٠٠٥م).

**ئەیيوبی، بۆیە شارەکە لەماوەی سالآتی (٦٢٣-٦٢٨ك/١٢٢٦-١٢٣٠ز) (پێنج) جـار دووچاری هێرشی خوارزمیەکان بۆتەوە[٩٠]، سولْتان جلال الدین منکبرتی بەردەوام بـوو لەسەر سیاسەتە فراوانخوازییەکەی و هـەر لـەو چوارچـێوەیەدا پـەلاماری ناوچـەکانی کوردستانی دا تا شاری دقوقا[٩١]، بەم شێوەیە کوردستان بوو بە مەیـدانی تـەراتێنی هێزەکانی خـوارزمی و هـەرجارەی بـە بیانوویـەك و هـەر ڕۆژە لـە شـارێك کوشـتارو کاولکارییان ئەنجام دەدا، تا تواناو لێهاتوویی خۆی و سوپا سەرکوتکەرەکەی لە شەڕی موسڵمانان و بۆ بەدیهێنانی مەرامە تایبەتییەکانی بە هەدەردا[٩٢]، بەمەش خـاڵێکی لاوازیان دەدایە دەسـت دوژمنـە گەورەکـەیان تـا بەسـەریاندا زاڵ بـبن و کۆتـایی بـە حوکمڕانیشیان بهێنن، ئەو دوژمنە سەرسەختەش مەغۆلەکان بوون.**

## پێنجەم/ مەغۆلەکان:

**هەواڵی بلاوبوونەوەی ئەوان وەك شـەپۆلێکی تـری مایـەی تـرس و دڵـە ڕاوکـێ و تۆقاندن لە کاتێکدا بوو کە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئیـسلامی بەگـشتی و کوردسـتان**

---

[٩٠] النويري، نهاية الأرب، ج٢٦-٢٧، ص١٩٢؛ الذهبی، العبر في خبر من غبر، مطبعة حكومة الكويت، (الكويت: ١٩٦٣م)، ج٥، ص١٠٧؛ اليافعي، مراة الجنان وعبرة اليقضان، (بيروت: ١٩٩٧م) ج٤، ص٥٢، حكيم البابيري، مدينة خلاط، ص١٥٦؛ ئومید بەهرامی نیا، مێژووی کوردەکانی جزیرە، پرۆژەی تیشك، (سلێمانی: ٢٠٠٩ز) ل٢١١.

[٩١] ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص ص ٣٨٨-٣٨٩؛ الحموی، التاريخ المنصوری، مطبعة الحجاز بدمشق، (دمشق: ١٩٨١م)ص١٠٩؛ ابوشامة، تراجم رجال القرنين (٦-٧هـ)، دارالجيل، (بيروت: ١٩٧٤م)، ص١٤٤.

[٩٢] نافع التوفيق العبود، الدولة الخوارزمية، ص١٦٧.

بەتایبەتی هێشتا پشتی چەماوەیان لە ژێر باری گرانی هێرش و تاڵانکارییەکانی خوارزمیەکان ڕاست نەکردبۆوە.

(جنگیزخان)[٩٣]( ٥٤٩-٦٢٤ك/ ١١٥٤- ١٢٢٦ز) کە هۆزەکانی مەغۆلی یەکخست و بەسەر نەیارەکانیدا لەچین سەرکەوت[٩٤]، بناغەی دەوڵەتەکەی دانا و یاسایەکی دەرکرد کە بە (الیاسا) یان (یاسق) ناسراوە، بۆ بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتەکەی[٩٥]، ئینجا دەستی کرد بە لەشکرکێشی و فراوانخوازی بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی و ناوچەکانی تریش لە باکور و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی مەیدانخوازیدا بەئامانجی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی مەیدان فراوانی جیهانی، خۆشی بەکردار دەستی بەم پرۆسەیە کردو توانی دەست بگرێت بەسەر چین و ئێران و جۆرجیاو قفقاسیاو ڕوسیاو تا ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، پاشانیش جێنشینەکانی درێژەیان بە پرۆسەکەدا[٩٦].

جنگیزخان شکۆمەندی و داگیرکردنی جیهانی مەبەست بوو، هۆزە مەغۆلەکانیش سەروەت و سامان و تاڵانکاری، وێناکردنی جیهانی ئیسلامیش وەك ناوچەیەکی خاوەن

---

[٩٣] ناوی (تموجین)ەو جنگیزخان نازناویەتی کە ناوێکی چینییە لە وشەی (شەنگ سز)ەوە هاتووە کە بەمانای (کوڕی ئاسمان)دێت، القلقشندي، صبح الأعشی، ج٤/ ص ص ٣٠٩-٣١٠ ؛ علاء محمود خليل، المغول في الموصل والجزيرة، رسالة ماجستر غير المنشورة، مقدمة الى مجلس كلية اداب جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٥م)، ص٤٤ هوامش الرقم (٢).

[٩٤] شوێنی نیشتەجێبوونی ئەوان ئەمڕۆ بە (مەنغۆلیا) ناسراوە، کارل بروکلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ص٣٨١.

[٩٥] الجويني، تاريخ فاتح العالم جهانگشای، ترجمه محمدالتونجي، دار الملاح، (د.م: ١٩٨٥م)، ج١، ص ص ٦٠ – ٦٥؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج١،ص ص٣٠٢-٣٠٣؛ محمد سهيل طقوش، تاريخ المغول العظام والألخانيين، دار النفائس، (بيروت: ٢٠٠٧م)، ص٣٦.

[٩٦] جعفر حسين خصباك، العراق في عهد المغول الألخانيين، الطبعة الأولى، (بغداد: ١٩٦٨م) ، ص١.

سامان و دەوڵەمەند و خراپی بارودۆخی ئابووری مەغۆل و کێشەی جەنجاڵی گوزەرانی دانیشتوان، ئەو دووخواستەی پێشتر بەیەکەوە گرێ داو دانیشتوان ئامادەباشی تەواویان ڕاگەیاند بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی سەرۆکەکەیان، بەتایبەت ئەوان زۆر پەیوەست بوون بە یاساو فەرمانی سەرۆکەکانیان و ژیانیشیان لەسەر تالآنکاری بەند بوو[97]، ئەو بارودۆخەی کە خوارزمیەکانیش بەسەر ناوچەکەیاندا هێنابوو یارمەتیدەری باش بوو بۆ مەغۆل کە بە ئاسانی ئامانجە سەربازییەکانیان قۆناغ بەقۆناغ جێبەجێ بکەن بێ ئەوەی هیچ بەربەستێکی ئەوتۆیان بێتە ڕێ[98]، یەکەم دەروازەی گەیشتنیشیان بە سنوورەکانی جیهانی ئیسلامی دەوڵەتی خوارزمی بوو[99]، دوای زنجیرە شەڕێك جلال الدین منکبرتی لە بەردەم مەغۆلدا شکستی هێناو دەوڵەتەکەو هێزە سەربازیەکەشی لەبەریەك هەڵوەشا[100]، خۆشی بەتەنها مایەوەو ڕای کرد بەرەو چیاکانی شاری میافارقین و لەسەر دەستی کوردێك ساڵی(٦٢٨ك/١٢٣٠ز)کوژرا[101]، بەمەش یەکەم

---

[97] الجويني، تاريخ جهانگشاي، ج١، ص٦٠" عباس اقبال، تاريخ المغول منذ حملة جنگيزخان حتى قيام الدولة التيمورية، دار مجمع الثقافى، (ابوظبي: ٢٠٠٠م)،ص١١٤؛ عباس العزاوي، تاريخ العراق بين الاحتلالين، مطبعة بغداد، (بغداد: ١٩٣٥م)، ج١، ص١٠٦.

[98] ابن عرب شاه، فاكهة الخلفاء ومفاكهة الظرفاء، طبع فى دير الاباالدومنكين، (الموصل: ١٨٦٩م)، ص٤٩٨.

[99] بۆ زانیاری دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە بڕوانە: عباس اقبال، تاريخ المغول، ص٤٩ وما بعدها؛ فؤادالمعطى الصياد، المغول، ص ٢٤٩-٢٥٤.

[100] بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: حافظ احمد حمدي، الدولة الخوارزمية والمغول غزو جنگيز خان للعالم الإسلامي، دار الفكر العربى، (القاهرة: ١٩٤٩م)، ص١٣٥؛ عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ص ١٢٦-١٣٠.

[101] ابن العبرى، تاريخ الزمان، دار المشرق، (بيروت: ١٩٨٦)،ص٢٧٧؛ النويرى، نهاية الارب، ج٢٧، ص٢٠٤؛ بن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص ١٥٣؛ نافع توفق العبود، الدولة الخوارزمية، ص١٦٧"

بەربەستی بەردەم سوپای مەغۆل شکا, ئەوانیش بەردەوامییاندا بە لەشکرکێشیەکەیان بەرەو ناوچەکانی دی.

هەرچی لەشکرکێشی مەغۆلیشە بۆ سەر کوردستان دەکرێ بەسەر دوو قۆناغدا دابەش بکرێت، قۆناغی یەکەم، لەشکرکێشییەکانی بەر لە ڕووخانی خەلافەتی عەبباسی و گرتنی بەغدا، سەرەتای ئەم قۆناغەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٦١٧ك/ ١٢٢٠ز) کە بەشاڵاوەکانیان بۆ سەر همدان[١٠٢] وە دواتر بۆ مەراغەو ئازربیجان و ئاران دەستی پێکرد و لە ساڵی (٦١٨ك/ ١٢١ز) بۆ سەرهەمان ناوچە هێرشەکەیان دووبارە بۆوە[١٠٣]، هەر ئەم لەشکرەی مەغۆل دواتر پەلاماری موسڵ و دەوروبەریان داو لە ساڵی (٦٢١ك/١٢٢٤ز) ئەم جۆرە پەلامارانەی بۆ هەمان شوێنەکانی پێشوو چەند بارە بوونەوە، وەك نەریتی خۆشیان کوشتارو کاولکاری زۆریان لە بەرامبەر دانیشتوانی ناوچەکان ئەنجامدا[١٠٤]، لە ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز) پۆلێکی تری مەغۆل پەلاماری مراغەو دیاربکر و گنجەو نصیبین و تا سنووری دقوقا و هەولێردا[١٠٥]، ناوچەکانی

---

عباس اقبال وباقر عاقلی، تاریخ ایران بس از اسلام، چاپ سعدی، چاپ سوم، (تهران: ١٣٨٣ش)، ص٣٢٧.

[١٠٢] النسوی، سیرة الجلال الدین منکبرتی، دار الفکر، (القاهرة: ١٩٥٣)، ص١٤٣.

[١٠٣] ابن الأثیر، الکامل، ج١٠، ص٣٤٥؛ الدیاربکری، تاریخ الخمیس فی احوال انفیس نفیس، مؤسسة الشعبان، (بیروت: د.ت)، مج٢، ص٣٦٩؛ ادریس محمد الدوسکي، همدان، ص ١٣٩.

[١٠٤] الیافعي، مرأة الجنان، ج٤، ص٣٨؛ ابن کثیر، البدایة والنهایة، دار الغد الجدید، الطبعة الأولی، (القاهرة: ٢٠٠٧م)، مج٦، ج١٢، ص١٩٥؛ ادریس الدوسکي، همدان، ص١٤٠.

[١٠٥] ابن الأثیر، الکامل، ج١٠،ص٤٤٨-٤٥٠ ؛ عبدالله العلیاوي، کوردستان في عهد المغول، (السلیمانیة: ٢٠٠٥م)، ١١٩؛ علی عادل حسین، أربل فی الفترة (٦٣٠-٨٧٤ه/١٢٣٣-١٤٦٩م) دراسة سیاسیة حضاریة، اطروحة دکتوراه غیر المنشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب جامعة صلاح الدین، (اربیل: ٢٠٠٦م)، ص٥٠.

هەرێمی چیاکان و شارەزووریش بێبەش نەبوون لە شالاوەکانی مەغۆل و لە سالّی (٦٢٩ک/ ١٢٣١ز) شالاوەکانیان ئەم ناوچانەشی گرتەوە[١٠٦]، ئەم قۆناغە بە شالاوەکانیان بۆ سەر هەولێر سالّی ( ٦٣٣-٦٣٤ک/ ١٢٣٥- ١٢٣٦ز) درێژەی کێشا[١٠٧]، سەرباری پەلامارەکانیان بۆ سەر لوڕستان و ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کە وەکو دەروازە وابوون بۆ هێرشکردنە سەر بەغدا[١٠٨]، ئەوان لەم قۆناغەدا سەرباری کوشتن و کاولکاری توانییان زانیاری زۆریش لە بارەی ئاستی توانای سەربازی خەلافەت و نهێنی و هونەری بەرگری شارو قەلاّکان و باقی ئەو شتە سەربازییانەی دی کە لە کاتی هەر لەشکرکێشییەکدا هێزێکی داگیرکەر پێویستیەتی کۆیکەنەوە[١٠٩]، لەبەرئەوە دەتوانین ئەم قۆناغە ناو بنێین بە قۆناغی کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی و هەوالگری و ڕێ خۆش کردن بۆ داگیرکردنی پایتەخت.

---

[١٠٦] ابن الفوطي، الحوادث الجامعة وتجارب النافعة، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٣م) ، ص٣٨؛ الذهبي، العبر، ج٥، ص١١٣ ؛ عبدالله العلياوي، كوردستان في عهد المغول، ص١٢٢.

[١٠٧] ابن الفوطي، الحوادث الجامعة، ص٨٠؛ سامي بن خماس الصقار، امارة أربل في العصر العباسي ومؤرخها ابن المستوفي، دار الشواف، (رياض: ١٩٩٢م)، ص٣٦؛ عبدالحليم عبدالله العزاوي، دور الكرد في مقاومة الغزو المغولي (٦٥٦هـ/١٢٥٨م)، رسالة ماجستير غير المنشورة، مقدمة الى مجلس كلية آداب جامعة بغداد، (بغداد: ٢٠٠٧م)، ص١٨٠.

[١٠٨] نصيرالدين طوسى، كتاب كيفيت وقعه بغداد (أوذيل نصيرالدين طوسى) ملحق باكتاب جهانگشاى، چاپ پيك ايران، چاپ سوم، (تهران: ١٣٨٢ش)، ج٣، ص ص٢٨٢-٢٨٣؛ الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٢٣٧؛ الكتبي، عيون التواريخ، دار الرشيد، (بغداد: ١٩٨٠م)، ج٢٠، ص١٣٢؛ حمدالله مستوفى، تاريخ گزيده، انتشارات امير كبير، (تهران: ١٣٨١ش)، ص٥٨٩.

[١٠٩] ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص ص ٤٥١- ٤٥٢؛ الرهاوي مجهول، تاريخ الرهاوي، مطبعة شفيق، (بغداد: ١٩٨٦م)، ج٢، ص٢٢٦.

قۆناغی دووەمی شالاوی لەشکرکێشی مەغۆل دوای داگیرکردنی بەغدا[١١٠]، ڕووخانی خەلافەتی عەبباسی لە (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) بۆ سەر کوردستان دەستی پێکرد، هەرچی سیما دیارەکانی ئەم قۆناغەشە خۆی لە شکاندنی بەربەستەکان و گرتنی قەڵاو ئابلۆقەدان و کۆمەڵکوژی و شێوازە دڕندەکانی ئازاردان و جەنگی دەروونی و سەپاندنی دەسەڵاتی زۆرداری بەسەر شارو هەرێمەکاندا دەنوێنێ، لە ڕووی کارگێڕیشەوە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی کورد دەستی پێکرد.

هۆلاکۆ دوای داگیرکردنی بەغدا بۆ تەواوکردنی نەخشە سەربازییەکەی تێکۆشا[١١١]، بۆ ئەم مەبەستەش گەڕایەوە بەلای کوردستاندا و ئەو شارو ناوچانەی لارێ نەبوون و ملکەچیی خۆیان ڕانەگەیاندبوو کرانە ئامانجی سوپای مەغۆل، بۆ ئەو مەبەستە سوپایەکی بەسەرکردایەتی (ارقیتونویان) ساڵی( ٦٥٦ك/١٢٥٨ز) بۆ داگیرکردنی هەولێر نارد، ئابلۆقەی قەڵا درا، بەڵام لەبەر بەرگری دانیشتوانی نەتوانرا بگیرێت تا بە پێشنیاری سەرداری موسڵ (بدرالدین لؤلؤ) (٦٠٦-٦٥٧ك/١٢٠٩-١٢٥٨ز) پرۆسەی داگیرکردنی شارەکە دواخرا بۆ وەرزی هاوین، ئەوە بوو دواتر

---

[١١٠] بۆ زانیاری لە سەر چۆنیەتی داگیرکردنی بەغدا بڕوانە: نصیرالدین طوسی، کتاب کیفیت وقعة بغداد، ج٣،ص٢٨٠؛ الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١، ص٢٦٧؛ ابن الفوطي، الحوادث الجامعة ، ص٢٣١؛ ابن كثير، البداية والنهاية، مج ٦، ج١٢، ص ٢٧٢؛ ابن تغري بردي، النجوم الظاهرة، ج٧، ص٤٩؛ جعفر خصباك، العراق في العهد مغول الألخانيين، ص١؛ سلمان التكريتيى، بغداد مدينة السلام وغزو المغول،مكتبة الشرق الجديد، (بغدا: ١٩٨٨م)، ص٢٣٨.

[١١١] بۆ نەخشە سەربازیەکانی مەغۆل بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج١، ص١٤٩؛ محمد فقى امين، الغزو المغولي لديار الاسلام، دار الاوائل، (دمشق: ٢٠٠٧م) ، ص٦٣ وما بعدها.

داگیرکرا[١١٢]، هەر لەو ساڵەدا شارەکانی دی هەرێمی جزیرە، لەوانەش (دیاربکر و ماردین و میافارقین...) کەوتنەوە بەر شاڵاوی مەرگهێنی مەغۆل و ڕووبەڕووی دڕندانەترین شێوەکانی کوشتن و لەناوبردن بوونەوە[١١٣]، بەلێورد بوونەوە و سەرنجدان لە بارودۆخی ناوچەکانی کوردستان دوای داگیرکردنی بەغدا دەبینین زۆربەی لەشکرکێشییەکانی مەغۆل ناوچەکانی هەرێمی جزیرەی گرتۆتەوە، چ ئەوانەی بەتایبەت کرانە سەر شارو قەڵا نەگیراوەکان وەك ئاماژەماندا، یان ئەوانەی لە چوارچێوەی هێرشەکانیان بۆ داگیرکردنی وڵاتی شام بەو ناوچانەدا تێپەڕین[١١٤]، بەم شێوەیە بۆ ماوەی زیاتر لە (٤٠) ساڵ واتە لە (٦١٧-٦٥٨ك/ ١٢٢٠-١٢٦٠ز) کوردستان زۆرترین حاڵەتی لەشکرکێشی مەغۆلی بە خۆوە بینی و شارو شارۆچکە نەما نەکەوێتە بەر شاڵاوەکانی مەغۆل.

---

(١١٢) الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١،ص٢٩٨؛ اليونيني،ذيل مرآة الزمان،مج٢،ج١،ص٩١؛عباس العزاوي، اربل في مختلف العصور، طبع في شركة الخنساء، (بغداد: ٢٠٠١م)، ص٧٨؛ على عادل حسين، أربل،ص٧٨.

(١١٣) لەم بارەیەوە بڕوانە: الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص٣١٩ وما بعدها؛ ابن الفوطي، حوادث الجامعة، ص٢٤٤؛ ابن دقماق، نزهة الأنام في تاريخ الاسلام، المكتبة العصرية, (بيروت: د.ت)،ص٢٤٠، ص٢٥٩؛ علاء محمود خليل، ص ٧١ وما بعدها.

(١١٤) هاوسنووری شارەکانی هەرێمی جزیرە لەگەڵ شام و بەستنەوەی شارەکانی شام بە ڕۆژهەڵاتەوە بەهۆی ڕێگا گرنگەکانی جزیرە هێرشەکانی مەغۆل بۆ ئەم شارانە چەند بارە کردەوە، بۆ ڕێگاکان بڕوانە: قدامة بن جعفر، الخراج، ص ص٢٣٨-٢٣٩؛ سوادي عبد محمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية في بلاد الجزيرة الفراتية، دار الشؤون الثقافية العامة، (بغداد: ١٩٨٩م)، ص٣٠٣.

## باسی دووەم/ شوێنەوارە سیاسییەکان:

ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی سەربازی ڕووتەوە نەڕوانینە ئەو لەشکرکێشییانەی کراونەتە سەر کوردستان و جیهانی ئیسلامی، وردترو شیکاریانەتر بۆیان بڕوانین، دەبینین ئەو بارودۆخە سیاسییەی لە دەرەنجامیان کەوتۆتەوە هیچی کەمتر نەبووە لە دەرەنجامی سەربازییەکان، بەهاتنە کایەو سەرهەڵدانی هەندێ دیاردەو مۆدێلی سیاسی کە پێشتر بوونیان نەبووە، یان باو سەندنەوەی هەندێکی تریان کە سەردەمێك بوو فەرامۆش کرابوون، سەرهەڵدانی زۆرێك لەو دیاردەو تڕادسیۆنانەش لە جۆری پەیوەندیی هێزەکان بە خەلافەتی عەبباسییەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەشێکیشیان هەڵقوڵاو و زادەی هەلومەرج و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی پێکهاتەی هێزەکان بوون، کە بوونەتە بنەمای بیری سیاسییان، بە پراکتیزەکردنیشیان بارودۆخێکی نوێ هاتۆتە ئاراوە، کە هەندێ جار بۆ کورد سوودبەخش و هەندێ جاریش کارەساتیان خوڵقاندووە، کە زیاتر جێگای مەبەستی ئێمەن باسیان بکەین.

## یەکەم/ سەرهەڵدانی میرنشینە کوردییەکان:

دەرکەوتنی (بوەیهییەکان) لەسەر شانۆی سیاسی ڕووداوەکان و دەستگرتنیان بەسەر (بەغدا)دا لە ساڵی (٣٣٤ك / ٩٤٥ز) وەرچەرخانێکی نوێی مێژوویی بوو، ئەگەرچی کوردو نەتەوەکانی تر سوودیان لەو بارودۆخەی کە هاتە ئاراوە وەرگرت، بەڵام بۆ دەوڵەتی عەبباسی بوونە مایەی لەدەستچوونی دەسەڵات و تەنها بە ناو هێشتنەوەی، بەکردنی ئارەزووی میری (بوەیهییەکان) بە بنەمای لابردن و گۆڕین و هێشتنەوەی

خەلیفە لە پایەی خۆی، لە شکۆمەندی و ڕێزی خەلیفەیان کەم کردەوە[115]، هاومـافی لە خوێندنەوەی وتار و پاڕانەوی تایبەت لەپاڵ ناوی خەلیفـەدا لەسـەر مینبـەرەکان و لێدانی (تەپڵ) لە کاتی نوێژەکاندا لەبەر دەرگای ماڵی میرەکانیاندا بۆ یەکەمجار بوونە دیاردەیەکی ئایینی و سیاسی کە پێشتر جگـە لـە خەلیفـە ئـەو مافـە بەکەسـی تـر نەدرابوو[116]، بەمەش زیاتر لە دەسەڵاتی خەلیفەیان کەم کردەوە کە ناوی میرەکانیـان لەپاڵ ناوی خەلیفەدا لەسەر پارە نەخشکرد، هەر وەك (القلقشندي) ئامـاژەی کـردووە: ((معـز الدولـه و براکـانی لـە یەکەمـەکانن کـە ئـەم مافـەیان بۆخۆیـان بـەڕەوا بینیوە))[117]، پێداگریشیان کرد لە ناچارکردنی خەلیفە لە بەخشینی نازناوی گـەورە پێیـان، بەنموونـە (عـضد الدولـة)(٣٦٧ -٣٧٢ك)/ ٩٧٧ -٩٨٢ز) کـە نازنـاوی (شاهنشاه)ی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو[118]، هەندێ جاریش بە(تاج الدولة یان تـاج الملـة)

---

[115] الأزدي، تـاريخ الموصـل، ج٢، ص ص٢٧٧ -٢٧٨؛ مـسكويه ،تجـارب الأمـم، ج٥، ص ٢٧٦؛ ابـن الجوزي، المنتظم، ج٦، ص ٣٤٣؛ القلقشندي، مآثر الإنافة، ج١، ص٣٠٤.

[116] مـسكويه ،تجـارب الأمـم،ج٥، ص٤٤٣؛هـلال الـصابي، رسـوم دار الخلافـة، (بغـداد: ١٩٦٤)، ص١١٣؛ابن تغري بردى، النجوم الزهرة، ج٤، ص١٤٢؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ، مـج٢، ج٣، ص٦٥.

[117] صبح الأعشى،ج٣،ص٤٤٣؛ هەروەها بڕوانە: مآثر الإنافة في معالم الخلافـة، عـالم الكتـب،(بـيروت: ١٩٦٤)،ج١،ص٣٠٠؛ المقريزي،النقودالإسلامية، (النجف: ١٩٦٧)، ص٢٠٧؛ الزبيدي،العراق من العهـد البويهي،ص٣٨.

[118] ابو الهجاء، تاريخ ابن ابى الهجاء،ص١٧٧؛الأربلي،خلاصة الذهب المسبوك، ص٢٥٩؛ فـراى، عـصر زرين فرنهنگ ايران، ص٢٢٧.

ناوبراوه[119] ، ویستیی ئەمە لە کردارەکانیشیدا ڕەنگ بداتەوە، بۆیە زیاد لە میەکانی دی لەهەوڵی گێڕانەوەی هەژموونی دەسەڵاتی بنەماڵەی بوەیهیدا بوو[120] .

زیادەڕۆیی کردنی میەکان لە هەڵبژاردنی نازناو لەو سیفەتانەی کە تەنها بە (خوای گەورە)وە تایبەت بوون[121] ، شەریعەتزانانی والیکرد نکۆڵی لە بەخشینی ئەو جۆرە نازناوانە بکەن و بە نادرووست و نەگونجاو لەگەڵ دەقە شەرعیەکاندا لەقەڵەمیان بدەن[122] ، لەو نێوەندەدا (الماوردي)[123]لە دیارترینی ئەوانە بوو، کە لەبەر مەترسی لەدەستدانی خەلافەت و لە سنوور دەرچوونی بوەیهیەکان بە پشتبەستن بە تێکستە شەرعیەکان و ڕووداوە مێژووییەکانی پێشینانی ئیسلام کۆمەڵێك یاساو ڕێسای دارشت کە ڕێگری بکات لە بەسووك سەیرکردنی خەلافەت و گیان بەبەردا

---

(119) هلال الصابي، رسوم دار الخلافة، ص٨٠، ص١٣١.

(120) ابن العمراني،الأنباء في تاريخ الخلفاء،ص١٨١؛ابوالفداء، مختصر،ج١،ص٤٦١؛حسن منيمنة،الدولة البويهية،ص١٣٥.

(121) بۆنموونە (جلال الدوله) (مردووە لە ٤٣٥ك/١٠٤٣ز) نازناوی شای شایان (ملك الملوك) و (ملك العزيز) بۆ یەکەمجار، ابو نصر خسرو فيروز (٤٤٠ -٤٤٧ك/١٠٤٨- ١٠٥٥ز) نازناوی (ملك الرحيم)ی پێ بەخشرا، ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٧٨٦، ج٨، ص٧٠؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، مج٢، ج٣، ص٢٤٤؛ ادم متز، الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري، دار الكتاب العربي، طبعة الرابعة، (بيروت: ١٩٦٧)، مج١، ٢٦١ ؛ بدرى محمد فهد، العامة ببغداد في القرن الخامس الهجري، مطبعة الإرشاد، (بغداد: ١٩٦٧م)، ص٣١٢.

(122) فوزي امين يحيى، نظام السلطة في الدولة العباسية، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية اداب جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٤م)، ص١٠٨.

(123) ناوی ابو علی حسن کوڕی محمد (٣٦٤-٤٥٠ك/ ٩٧٤- ١٠٥٨ز) لە بصرە لەدایك بووە، لە ناودارترین شەرع ناسە شافیعیەکانی سەردەمی بوەیهی بووە، چەندین دانراوی زانستی و ئایینی هەبووە، لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە،الماوردي، الأحكام السلطانية، مقدمة المحقق، ص٢٠.

کردنەوەی[١٢٤]، بەتایبەتیش تەنها شتێك كە مـابوو بـە بنەماڵـەی عەبباسـی بكـەن هەوڵدانیان بوو بۆ گواستنەوەی سەڵتەنەت لە ئەوانەوە بۆ بنەماڵەی بـوەیهی، ویـسترا لە ڕێگەی هاوسەرگیری سیاسییەوە ئـەو ئامانجـەش بهێنرێتـە دی[١٢٥]، بـەم شـێوەیە خەلیفەی عەبباسی جگە لە پاشكۆیەتی میرانی بوەیهی هیچی تری بۆ نەمایـەوە، لـە ڕاستیدا مێـژووی ئـەم پاشـكۆیەتیەش دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (٣٣٤ك/ ٩٤٥ز) و سەرەتای دەستگرتنی بوەیهیەكان بەسەر بەغدا دا، گومانیشی تێدانییە كە خەلیفەكان خۆیان هۆكارێكی كارای ئەو بارودۆخە بوون كە بەسەریان هات[١٢٦].

ئـەوەی لـەو نێوەنـدەدا دەمانـەوێت ڕوونـتر قـسەی لـە بـارەوە بكـەین كاریگـەری و ڕەنگدانەوەی شوێنەواری پراكتیزەكردنی ئەو سیاسەتە بوو لەسەر كۆمەڵگەی كـوردی، یەكەم جاریش ئەوە لـە لاوازبـوونی دەسـەڵاتی سیاسـی خەلافـەتی عەبباسـیدا، هـەر لەسەردەمی بوەیهیەكاندا بەدی كرا، وەك ئامـاژەمـان پێـدا، كـوردیش لـەو مـاوەیـەدا (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٥-١٠٥٥ز) سوودی وەرگرت و توانی پەرە بەدەسەڵاتی خۆی بدات، لەوە تێپەڕی كە هەر تەنها دەسەڵاتی لەچوار چێوەی قـەڵاداری و سـەرداریەتی كردنـی خێڵـدا بمێنێتـەوە[١٢٧]، بەمانایـەكی دی سـەرۆك خێڵـەكان لـەو قۆناغـەدا پـەرەیان بەدەسەڵاتی خێڵەكی خۆیانداو توانییان بیگۆڕن بۆ دەسەڵاتی سیاسی، كـە لـە شـێوەی

---

[١٢٤] الماوردي،قوانين الوزارة وسياسة الملوك،دار الطليعة،(بيروت: ١٩٧٩م)،مقدمة محقق، ص٧٧؛ أمير حسن صديقي، الخلافة والملكة في ايران في العصر الوسيط، ص٤٨.

[١٢٥] بڕوانـە: مـسكويه،تجارب الأمـم،ج٥،ص٤٥٢؛ابـن الأثير،الكامـل،ج٧،ص٣٧٤؛ خليـل ابـراهيم السامرائي، تاريخ الدولة العربية، ص١٥٧.

[١٢٦] ابن واصل، مفرج الكروب،ج١، ص٥١؛ حسن ابراهيم حسن، تاريخ الإسلام، ج٣، ص٢٥٠.

[١٢٧] زرار صديق، چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی كورد، ل١٦.

میرنشیندا بەرجەستە بوو[١٢٨]، هەمیشەش لە مێـژووی دامەزرانـدنی میرنـشینەکاندا خێڵێك بۆتە بنەما[١٢٩]، لەبەرئەوە دەتوانرێت پرۆسەی گەشـەکردنی ئیتنیکییـان کـە خۆی لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتی میرنشینە سەربەخۆکاندا بینییـەوە، بـەجۆرێك بـە ترادسیۆنی سیاسی دابنرێت[١٣٠]، بەتایبـەت کـە هـەر یـەك لـەو میرنـشینانە وەکـو دەوڵەتێکی بچووکی خۆجێیی، خاوەنی هێزی چەکداری بوون، تا ئەو کاتـەش کـە دوور بوون لە دەستتێوەردانی دەرەکی، توانیبوویان سـنووری قەڵـەمڕەویان فـراوان بکـەن و پارێزگاریشیان لێکرد[١٣١]، جگە لەوەش بۆ یەکەمجار ئەو شێوە دەسـەڵاتە خۆجێییانـەی کورد بە دەوڵەتۆکە وەك (دولە بنی مـروان و بنـی حـسنويە) نـاوبراون[١٣٢]، تـا ئـەو ڕادەیەش جێی خۆیان کردۆتەوە، کە کەسێکی وەك (رکن الدولە)ی بـوەیهی مانـەوەی دەوڵەتەکەی بەدەوڵەتی کوردانەوە پەیوەست کردووە[١٣٣].

سەرهەڵدانی هـەر میرنـشینێك هەلومـەرجی تایبـەتی خـۆی هـەبووە، مـەرج نییـە سەرهەڵدانیان پەیوەست بووبێت بە پەیڕەویکردنی سیستەمی نامەرکەزی بوەیهیەکان، چونکە ئەوان هـەر لـەدوای دەستبەسـەرداگرتنی (بەغـدا)، هـەوڵێکی زۆریانـدا بـۆ داگیرکردنی ناوچە کوردنشینەکان، وە ڕێگرتن لە ئەگەری سـەرهەڵدان و گەشـەکردنی

---

[١٢٨] لازاريـف والاخـرون، تـاريخ كوردسـتان، دار سـپيريز، (دهـوك: ٢٠٠٦م)، ص٥٠؛ کـامران عـەزیز، هۆکارەکانی سەرهەڵدان و، ٤٩.

[١٢٩] ڤاسیلیە ڤا، کوردستانی خوارروو، ل٢٠٦.

[١٣٠] ڕشاد میران، ڕەوشـتی ئـایینی و نەتـەوەیی لـە کوردسـتاندا، چاپی دووەم، (کوردسـتان: ٢٠٠٠ز)، ل٥٠.

[١٣١] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارروو، ل٢٠٢.

[١٣٢] بۆنموونـە بڕوانـە: ابـن الأثـير، الكامـل،ج٧،ص٤٣٥؛العمري،مـسالك الابـصار،ج٢٦،ص١٨٢؛ ابـن خلدون، العبر،ج٤، ص٣٧٨، ص٦١٥.

[١٣٣] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٣٧٧؛ کامران عەزیز، هۆکارەکانی سەرهەڵدان و...، ل٧٥.

هــەر دەســەڵاتێکی خــۆجێیی، لــەم پێناوەشــدا لەشکرکێــشی زۆریــان کردۆتــە سەرکوردستان[١٣٤] ، بەڵام لەم هەنگاوەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، چــونکە گەشــەکردنی میرنشینەکان لەو قۆناغەدا هاوشێوەی میرنشینەکانی دی جیهانی ئیــسلامی بــووە بــە ئەمری واقع (دیفاکتۆ)، ئەمەش مانای وایە کە سەرۆك خێڵ و بنەماڵــە کوردییــەکان (یان کورد) خۆیان ئەوەیان لەباردا هەبووە، کــە لــە ســنووری ناوچــەکانیاندا پیــادەی دەسەڵاتی خۆیان بکەن، سیستەمێکی کارگێڕی دامەزرێنن بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباریــان، خەلیفــەی عەبباســیش دانــی پێــدا نــاون، بەمــەش ســیفەتی یاســاییان وەرگرتووە، ئەم جۆرە میرنشینانەش لە مێژووی ئیسلامیدا بە میرنــشینی زاڵبــوو یــان دەست بەسەردا گیراو(الإستلاء) ناسراون[١٣٥].

لــە ســەردەمی سەلجوقیەکانیــشدا (٤٤٧-٥٩٠ك/١٠٥٥-١١٩٤ز) خەلیفــەکانی عەبباسی دەسەڵاتی لەدەست چوویان بۆ نەگەڕایەوەو زیاتر لەوەش خەلیفەیان کردە ژێر دەستەی حاکمی سیاسی( عمید-راگر)[١٣٦]کانیــان، چــونکە ســوڵتانەکانی ســەلجوقی ڕاستەخۆ کاروبارەکانیان لە بەغدا بەڕێوە نەدەبرد، بەڵکو کارەکانیان بە نوێنەرەکانیان سپاردبوو، لە بوەیهیەکانیش مامەڵەیان لەگەڵ خەلیفەکان توندتر بوو[١٣٧] ، ئەوان لــە دوو شتدا هاو هەڵوێست بوون، هاوئانزایی لە ئاییندا کە هــەردووکیان (ســنە) بــوون

---

[١٣٤] بەنموونە هێرش و پەلامارەکانی (معز الدولة) بۆ سەر هەرێمی چیاکان و موصــڵ و ناوچــەکانی تــر، هێرشەکانی (عضد الدولة)بۆسەر(باد)ی کوردی و میرنشینی حسنویهی بڕوانە: ابن الأثیر، الکامل ، ج٧، ص٢٢١، ص٣٦٣، ص ص ٣٧١ -٣٧٢.

[١٣٥] الماوردي، الأحکام السلطانیة، ص١١٦، حسام الدین نەقشبەندی، شارەزوور لوڕستان،ل٣٨٧.

[١٣٦] عمیــد: لــە ڕووی زمانەوانییــەوە بــەو کەســە دەگوترێتــە کــە لــە بــەڕێوەبردنی کاروباەرکانــدا پــشتی پێدەبەسترێت، ابن منظور، لسان العرب، دار صادر، (بیروت: ١٩٦٨م)، ج٣، ص٣٠٥.

[١٣٧] ابن الأثیر، الکامل، ج٨، ص١٧٩؛علی ابراهیم حسن، تاریخ الإسلام العام، مکتبة النهضة المصریة، (القاهرة:د.ت)، ص٤٦٣.

ڕێزگرتنیشیان لە خەلیفە لەبەر پلەوپایە ئایینییەکەی بوو نەك سیاسییەکەی[١٣٨]، دووەمیشیان سەلجوقیەکان تێڕوانینێکی جیهانییان هەبوو، هەنگاوەکانیشیان ڕەنگدانەوەی ئەو بیرە سیاسییە بوو کە هەر سوڵتان طغرل بەك داهێنەرو هەڵگری بوو[١٣٩]، ئەمەش لەگەڵ خواستی ئایینی خەلیفەی عەبباسی بەئامانجی یەکخستنەوەی جیهانی ئیسلامی دەهاتەوە[١٤٠]، پێ بەخشینی نازناوی (شای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)ش لەلایەن خەلیفەوە بەناچاریەوە بەواتای شەرعیەت پێدان بوو بە کردارە فراوانخوازیەکانی و دەست کرانەوەیی لە دەست بەسەرداگرتنی هەموو هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامی، بەوانەشەوە کە دانیان بەدەسەڵاتی خەلیفەی عەبباسی دا نەدەنا لەوانەش میسر[١٤١]، سەرباری نازناوی گەورەکانیان ئەوەی لە ڕژێمی سەڵتەنەتی سەلجوقی تێبینی دەکرێت بیرۆکەی بە پیرۆزکردنی کارەکانیان بوو بەسیمایەکی ئایینی[١٤٢]، سەرچاوەیەك زیاتر لەوەش پێداگری کردووەو سیفەتی (گەلی هەڵبژاردەی خوا)ی بە (تورك) بەخشیوە، پێی وابووە هەر لە ئەزەلەوە(خوا) تورکەکانی بۆ

---

(١٣٨) علي ابراهيم حسن، تاريخ الإسلام العام، ص٤٦٥.

(١٣٩) ئەو یەکەم کەسیش بوو لە مێژووی سەلجوقیدا کە خەلیفە نازناوی (سوڵتان –حاكم الاعلى)ی پێ بەخشی بەو مانایەی کە بەرزترین دەسەڵاتی سیاسییە، الراوندي، راحة الصدور، ص١٦٩؛ ديورانت، قصة الحضارة، دار الجيل، (بيروت:د.ت)، مج١٣، ص١٠٣؛فوزي أمين، نظام السلطة، ٦٥.

(١٤٠) حسن أحمد محمود و أحمد ابراهيم شريف، العالم الإسلامي في العصر العباسي، دار الفكر العربي، (القاهرة: ١٩٩٥)،ص ص٤٢٠–٤٢١.

(١٤١) العمراني، الأنباء في تاريخ الخلفاء، ص١٨٩،ص١٩٢؛الإصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص١٩٠؛نيكيتا ايليسيف، الشرق الإسلامي في العصر الوسيط، ص٣٤٩؛ عبدالله رازي، تاريخ كامل ايران، ص١٩٦.

(١٤٢) بۆ نموونە بڕوانە؛الراوندى,راحة الصدور,ص١٩٧؛اليزدى,العراضة فى الحكاية السلجوقية,ص ص٣٧-٣٨؛فوزى أمين,نظام السلطنة,ص٧٤.

سەرکردایەتیکردنی نەتەوەکان درووست کـردووە و ملکەچـکردن و گوێڕایـەڵیکردنیان لەلایەن موسڵمانانەوە بە پێویست زانیوە[١٤٣]، (نظام الملك)یـش بـە ڕاشـکاوی ئـەوەی خـستۆتە ڕوو کـە سـوڵتان جیایـە لـە بەنـدەکانی دی (هەڵبـژاردەی خـوا)یـەو گوێڕایەڵیکردنی پێویستە[١٤٤]، لـە سەرچاوەیەکیـشدا هـاتووە، کـە ملکـشاه(٤٦٥-٤٨٥ك/١٠٧٢-١٠٩٢ز) لە ژێـر بایەخپێـدانی (خـوایی)یـەو بەجێنـشینی ئـەویش دەزانێت لەسەر زەویدا[١٤٥].

بەڵام ئامانج لـە بەخـشینی سـیمایەکی ئـایینی بـە دەوڵەتەکـەیان ملکەچـپێکردنی نەتەوەکانی جیهانی ئیسلامی بوو، لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی مەرکەزیدا، کە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە بیرۆکەی (یەکێتی جیهانی ئیسلامی)یان هـەڵگرتبوو، بـەڵام جێبـەجێکردنی ئـەم پرۆسـەیە تـا سـەردەمی سـوڵتان الـب ارسـلان دواکـەوت، سـەرکەوتنەکانی ئـەم سـوڵتانە لـە شـەڕەکاندا و بەتایبـەتیش (ملازگـرد) سـاڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) [١٤٦]، دەکرێت بەسـەرەتای دەسـتپێکی ئـەم سیاسـەتە دابنرێـت، لەڕاستیدا خەلیفەی عەبباسی پـشتگیرو یارمەتیـدەری جێبـەجێکردنی بـوو، نامـەی پیرۆزباییەکەی خەلیفە(القائم) بەبۆنەی سەرکەوتنی سوڵتان لە شەڕەکەدا، کە تیایـدا وەك پاشـای میللـەتان و خـاوەنی عـەرەب و عەجـەم نـاوی بـردووە، ئـەوەی لـێ دەخوێنرایەوە[١٤٧]، سوڵتان(ملکشاه) کە بەتەواوکەری پرۆسەی چەسپاندنی ناوەنـدێتی

---

[١٤٣] ابن حسول، تفضيل الأتراك على سائر اجناد، وەرگیراوە لـە يلماز اوزطونا، المدخل الى التاريخ التركي، ص٢٧٦.

[١٤٤] سياست نامة، ص٤٩.

[١٤٥] الراوندي، راحة الصدور، ص١٩٧.

[١٤٦] الأصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق،ص٢٠٦؛ ابن العبري، تاريخ المختصر الدول، ص٣٢٢؛ اليافعي، مراة الجنان، ج٣، ص٦٧.

[١٤٧] الحسيني، زبدة التواريخ، ص١١٥.

دادەنرێـت و لـە ئەرکـە سـتراتیژیەکانیدا داینـابوو، کـە خـۆی لـە بڕیـاری دەستبەسەرداگرتنی هەموو هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا بینییەوە[148].

هەرچەندە میرە کوردەکان شێوازو میکانیزمی جیاوازیان لە پێناو پارێزگـاریکردن لـە دەسەڵاتی خۆجێیان گرتەبەر، بەڵام بـەردەوامی هێرشـەکان و زوڵـم و زۆری بەتایبـەت سوڵتان ملکشاه بۆ سەر کـورد وایکـرد میرنـشینەکان ببنـە قوربـانی یەکـەمی ئـەو سیاسەتە، لە راستیشدا بـەهێزیی سـوپای سـەلجوقی لـە ڕووی تـەکنیك و تـاکتیکی جەنگییەوە لەلایەك و لاوازی میرنشینەکان لەم ڕۆژگارەدا لەلایـەکی دی، سـەرکەوتنی سوڵتانیان بەسەر میرنشینەکاندا مسۆگەر کـرد[149]،(الراونـدی)یـش ستایـشی ئـەو سیاسەتەی کـردووەو ئاکامـەکانیـشی بـۆ دەوڵـەت بـاش هەڵـسەنگاندووە[150]، بۆیـە کاریگەری ئەم سیاسەتەشیان لە چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتەکـەیان بەسـەر کـوردو نەتەوەکانی دیدا بە خراپ دەرکەوت[151].

## دووەم/ بەرتیلی سیاسی:

ئەو ڕۆژگارەی میرنـشینەکانی پێـدا تێپـەڕیوە پـڕ بـووە لـە ڕووداو و کارەسـات، دەرەنجامی ئەو بیرۆکە سیاسیانەش، کە هێزە داگیرکەرەکان پیادەیان کـرد مـەترسـیەکی بەردەوام ڕووی لە میرنشینە کوردیەکان کردووە، بۆیە (میرە کوردەکان) ڕێگاو شـێوازی جۆربەجۆریان گرتەبەر هەر وەك ئاماژەی پێدرا، لەپێناوی پارێزگـاریکردن لەمانـەوەی دەسەڵاتیان و پارێزگـاریکردن لـە وڵاتەکـەیان لـە هێرشـی داگیرکـاران، ئـەو ڕێگـاو

---

[148] البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٧١.

[149] نیشتمان بەشیر، کوردو سەلجوقیەکان، ل ل ٢٧٤-٢٧٥.

[150] راحة الصدور، ص١٩٨.

[151] حسن محمود، العالم الإسلامي، ص٣٤٩.

شێوازانەش بوونە دیاردەیەکی سیاسی و مۆدێلێکی نوێی ئەو قۆناغە مێژووییەی کورد، ڕەنگە سیاسەتی کێشکردنی سۆزی داگیرکەرەکان لە ڕێگەی پارەوە یەکێکی دی بوو بێت لەو سیاسەتە باوانەی لە لایەن داگیرکەرانەوە پەیڕەو کراوە، لە هەمبەر بە سەربەخۆیی هێشتنەوەی دەسەڵاتە خۆجێییەکان، کە لەسەر میرەکان پێویست بوو خەزێنەی دەوڵەت پارەدار بکەن، بەناردنی بەرتیلی گرانبەها بۆ خەزێنەی هێزە داگیرکەرەکان[١٥٢]، ئەگەر (دبلۆماسیەت)یش بە هونەری گفتوگۆکردن بەمەبەستی بەرگریکردن و بەرگرتن لە ڕوودانی کارەساتی شەڕو مەینەتیەکانی، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی وڵات و بەرقەرارکردنی ئاشتی بناسێنین[١٥٣]، ئەوا زمانی پارە (بەتیل) لەو قۆناغەدا ڕۆڵی دبلۆماسیەتێکی تا ڕاددەیەك سەرکەوتووی بۆ هەندێك لە میرنشینە کوردییەکان گێڕا، بەهۆی بەخشینی دیاری گرانبەهاو پارەی زۆر بە هێزە دەرەکیەکان، بۆ نموونە میر حسنویهی بەرزیکانی (م.لە ٣٦٩ك/٩٧٩ز) دوای ئەوەی لە ڕێگەی پێدانی بەرتیلێکی زۆرەوە ساڵی (٣٥٩ك/٩٦٩ز) لەگەڵ (ابو الفتح) وەزیری (رکن الدولە)ی بویهیدا ڕێککەوت، تا دەستبەرداری هێرشی سەر میرنشینەکە بێت، ئەوەبوو ئەو میرە کوردە بڕی پەنجا هەزار دینار و کەلوپەلێکی زۆری گرانبەها کە بەهاکەیان سەد هەزار دینار دەبوو بە وەزیری ناوبراو دا[١٥٤]، بەمەش میرنشینەکەی لە ئاکامە خراپەکانی ئەم لەشکرکێشییە ڕزگار کردو توانیشی درێژە بە دەسەڵاتی خۆی بدات، هەر لەو نێوەندەدا میر نصر الدولە (٤٠١-٤٥٣ك/١٠١٠-١٠٦١ز)ی مەروانی بەیەکێك لە دیارترین ئەو دبلۆماتکارانە دادەنرێت کە وەك میری میرنشینێکی گەورە

---

[١٥٢] نیشتمان بشیر، کوردو سەلجوقیەکان، ل١٨٦.

[١٥٣] عومەر مامەسێنی، دبلۆماسیەتی کورد بە درێژایی مێژوو، چاپخانەی ئاسا، (سلیمانی:٢٠٠٢ز)، ل٣٨.

[١٥٤] مسکویە، تجارب الأمم، ج٥، ص٣٧٤؛ ابن الأثیر، الکامل،ج٧، ص٢٩٢؛ محمدامین زکی، تاریخ الدول والإمارات الکردیة، ص٩٠.

ئەو سیاسەتەی بەرامبەر سەلجوقیەکان پەیڕەو کـرد، ئـەو بەدرێـژایی پـەنجاودوو سـاڵ ماوەی فەرمانڕەوایی ئەوەندەی بۆی کرابێـت لەگـەڵ دوژمنەکانیـدا نەچـۆتە شـەڕەوە، بەپارە مەترسیەکانی لە سەر میرنشینەکەی دوور خستۆتەوە، هەر لـەو پێناوەشـدا لـە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە بەرتیل و بەخششێکی زۆری بۆ طغرل بك ناردووەو وتاریشی بە ناوی ئەوەوە خوێندۆتەوە[155]، ئەو سیاسەتەی نصر الدولە لەسەر بنـەمای نەویـستنی شەڕ بینا کرابوو، تا سوود لە ئاشتی وەربگرێـت بـۆ خۆشـگوزەرانی و بەرەوپێـشبردنی وڵاتەکەی، بۆیە دەکرێت بوترێت کە ئەو زۆرجار ئاشتی بە پارە کڕیوە[156]، بەواتایەکی دی ئەو میرە پاراستنی دەسەڵاتی خۆی لە هێزە ئابوورییەکەیدا دۆزیوەتەوە، بەم ڕێگەیە توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی لە بەرامبەر دوژمنەکانی بپارێزێ، هەروەك،(ابن الجوزی)ش ئاماژەی بۆکردووە کە دەڵێ: ((ئەگەر دوژمنێك ڕووی بکردایە وڵاتەکەی، ئەو بـە پـارە لەخۆی دوور دەخستەوە))[157]، توێژەرێکیش ئەم جۆرە هەڵوێـستانەی بـۆ جۆرێـك لـە خۆشەویستی بۆ خاك و هاوڕەگەزەکانی گێڕاوەتەوە[158].

لەڕاستیدا سەلجوقیەکان ئاگاداری خێـرو بێـری وڵاتەکـەی بـوون، بۆیـە گـەلێك جـار سـەرباری هەوڵی هەڕەشـە ئامێزیـان بـۆ داگیرکردنـی ناوچـەکەو دەستبەسـەرداگرتنی سەرچاوەی داهاتەکانی، ویستوویانە لەم ڕێگەیەشەوە دەستکەوتی زیاتر بەدەست بێنن، بۆ نموونە طغـرل بـگ وەك تۆڵەکردنـەوە لـە نـصر الدولـە دوای پـشتگیریکردنی لـە

---

[155] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص٧٨؛ابن العبري، تاريخ الزمـان، ص٩٧؛ بەدلیـسی شـەرەفنامە، ل٣١؛ **الماردینی**، تاريخ ماردين، ص٤٣؛ بسام العسلي، فن الحرب الإسلامي في العصر الاسـلامی،مرکز الکتب الثقافية،(بيروت:١٩٨٨م)، ج٣، ص٣٤٢.

[156] ابو الهجاء، تاريخ ابن ابو الهجـاء، ص١٩٥؛ عومـەر مامەسـێنی، دبلۆماسـیەتی کـورد، ل ل ٨٠-٨١.

[157] المنتظم، ج٨، ص ص ٢٢٢- ٢٢٣.

[158] کرڤان محمد آميدي، الكرد في كتابات، المؤرخ ابن الأثير، ص١٨٨.

بزووتنەوەی بساسیری بڕیاری هێرش کردنە سەر ئەو میرەی دا، ئەویش بە پارە سولتانی ڕازی کرد کە دەستبەرداری هێرشەکەی بێت[159]، میر نظام الدین(٤٥٣-٤٧٢ك/١٠٦١-١٠٧٩ز)یش بە پەیڕەوکردنی ئەو دبلوماسیەتە تارادەیەکی زۆر توانی ئاشتی بۆ میرنشینەکە دەستەبەرکات، چونکە ئەو میرەش لە قایلکردنی سولتانەکان بەپارە سەرکەوتووبوو، ئەوەتا کاتێك سولتان ملکشاە داوای سێ هەزار دیناری لێکرد، میری ناوبراو پێی بەخشی و ڕاشی گەیاند کە خۆشگوزەرانی و ئاوەدانی ولاتەکەی بەو بڕە پارەیە ناگۆڕێتەوە[160].

بەپارە ئاشتی کڕین و مانەوە لەسەر دەسەلات سیاسەتێك بوو، کە هەردوو میرنشینی (شەدادی و ڕەوادی)یش پەیڕەویان کردووە، تا ئەو ڕاددەیە ئامادەبوون پارە بدەن بە سەلجوقیەکان و وتاریان بەناوەوە بخوێننەوە، ئەمەش بۆیان بوو بەدەستەبەری درێژەدان بە فەرمانڕەوایەتییان[161]، بەسەرنجدان لە ڕووداوەکان ئەوە دەردەکەوێت، کە ئەو سیاسەتە بۆتە سەرچاوەیەك بۆ پارەدارکردنی خەزێنەی دەولەتی سەلجوقی، بەتایبەت لەو کاتەدا کە سەرقالی فراوانخوازی بوون لە بەرەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی دا، هەربۆیە کاتێك میر مملان کوری وهسوزان (٤٥٠-٤٦٣ك/ ١٠٥٨-١٠٧٠ز)ڕەوادی بڕیاری بڕینی ئەو بڕە پارەیدا کە دەبوایە سالانە بینێرێت بۆ خەزێنەی دەولەت، طغرل بگ بڕیاری هێرش کردنە سەریدا لە سالی (٤٥٢ك/١٠٦٠ز) وە لە

---

[159] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص١٤٣؛ ابن العبري، تاريخ الزمان، ص١٠١؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٣٨٣.

[160] أسامه بن منقذ، الاعتبار،المكتب الاسلامي،طبعة الثانية،(بيروت:٢٠٠٣م)،ص ص١٦٥-١٦٦.

[161] بڕوانە: ابن الأثير،الكامل،ج٨، ص١١٦؛ ابن خلدون، العبر،ج٤،ص٦٠٦؛حسام الدين النقشبندی، آذربيجان، ص ١٧٠.

ساڵی (٤٥٤ك/١٠٦٢ز) دووبارەی کردەوە[١٦٢]، مملانیش بۆ گەیاندنی سکاڵای خۆی لە دەست ئەو هێرش و پەلامارانە ڕووی کردە بەغدا و خەلیفە القائم بأمرالله داوای لە سوڵتان کرد دەست لە هێرش و داواکاریەکانی هەڵبگرێت، بەڵام سوڵتانی سەلجوقی گوێی بەداواکاری خەلیفە نەدا، لەبەرئەوە میر مملان بۆ قایلکردنیان بەرتیلی زیاتری دا، ناچاریش کرا کوڕەکەی وەکو (بارمتە) لای سوڵتان بهێڵێتەوە، بۆ وەفاداربوونی لەسەر جێبەجێکردنی مەرجەکانی سوڵتان[١٦٣]، چارەنووسی میری مەروانیش هەر بەو شێوەیە بوو، کاتێك میر ناصر الدولە (٤٧٢-٤٧٨ك/١٠٧٩-١٠٨٥ز) ئامادە نەبوو چیتر پارەو شتە گرانبەهاکانی بۆ سەلجوقیەکان بنێرێت[١٦٤] و ملکەچی سیاسەتەکەیان بێت[١٦٥]، بۆیە سوڵتان ملکشاە بڕیاری هێرشکردن و لەناوبردنی میرنشینەکەیدا[١٦٦].

مەغۆلەکانیش پەیڕەویان لە سیاسەتێکی لەو جۆرە کرد و هەندێ جار بەوە ڕازی دەبوون کە بەرپرس و حاکمی سەر شارەکان ملکەچی خۆیان دەربڕن و ماڵ و سامانی زۆریان پێبدەن، ئەوەتا کاتێك (الشریف العلوی) بەرپرسی شاری همدان کە بە پێشڕەوی مەغۆلی زانی ساڵی (٦١٧/١٢٢٠ز) چووە دەرەوەی شار بۆ پێشوازیکردنیان، بەئامانجی دوورخستنەوەی مەترسی ڕەشەکوژی و کاولکارییەکانیشیان ماڵ و سامانێکی زۆری پێبەخشین[١٦٧].

---

[١٦٢] بڕوانە: ابو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج١، ص٥٢٨؛ حسام الدين النقشبندی، آذربيجان،ص ص١٧٢-١٧٣.

[١٦٣] حسام الدين النقشبندي، اذربيجان،ص١٧٣.

[١٦٤] الفارقي، تاريخ الفارقي (تاريخ ميافارقين وآمد)،دار الهيئة العامة الشؤون والمطابع الأمرية،(القاهرة:١٩٥٩م)، ص٢١٨.

[١٦٥] ابن العبري، تاريخ الزمان، ص١١٧.

[١٦٦] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص ص٢٩٩-٣٠٠.

[١٦٧] ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص٣٥٠؛ ادريس حسن الدوسكي، همدان، ص١٣٩.

هەوڵەکانی ملك کامل ئەیوبی خاوەنی شاری میافارقین ساڵی (٦٥٧ك/١٢٥٩ز) بەرێککەوتن لەگەڵ مەغۆل بۆ لابردنی ئابلۆقەی سەر شارەکە نموونەیەکی ترە لەم بارەیەوە، هەرچەندە بەدگومان بوو بەرامبەر بەڵێنەکانیان و دواجاریش هەر لەسەر دەستی هۆلاکۆ کوژرا[١٦٨]، بەهەرحاڵ هەرچەندە هێزی ئابووری لە پاڵ هێزی سەربازیدا وەك دوو ڕەگەزی سەرەکی ڕۆڵی لە دروستکردن و پاراستنی دەسەلاتی میری کورد دا بینیوە[١٦٩]، بەلام لەبەرئەوەی ئەو هەوڵ و چالاکییە دبلۆماسیانەی کورد هەولی تاك لایەنە بوون، بۆیە نەبوونە زامنی مانەوەی دەسەلاتی میرەکان، هەرچەندە توێژەرێك ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە دیاری و بەرتیلەکان گرەنتی مانەوەیان بوو[١٧٠]، بەلام سەلجوقیەکان بەنموونە مەرکەزیەتیان کردبووە ستراتیژیەتێك و پێشتر بڕیاریان لەسەردابوو، بۆیە گوێڕایەلی و ناردنی سەروەت و سامان گرەنتی مانەوەی میرنشینەکانی لەسەر شانۆی سیاسی مسۆگەر نەکرد[١٧١]، وە هیچ ڕێکەوتنێك نەبوو لە نێوان هێزە داگیرکەرەکان و کورد کە پەیوەندی نێوانیان بە پێی بەرژەوەندی هاوبەش ڕێك بخات، بەتایبەتیش کە لە کاری دبلۆماسیدا پێویستە بەڵێننامە هەبێت و بەرژەوەندی هاوبەش ڕەچاو بکرێت[١٧٢]، بەڵکو پەیوەندییەکان لە سەر بنەمای بەهێز و بێهێزی و بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکان ڕێکخرابوون، تائەو کاتەش بەردەوام بوون کە بۆ پێداویستیەکانی ڕێی چەسپاندنی دەسەلاتی هێزە دەرەکیەکان هێزی ماددی و مرۆیی

---

[١٦٨] الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١،ص٣١٩؛ ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص٢٤٤.

[١٦٩] حیدر لەشکری، دەسەلاتی میری کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، گۆڤاری (شانەدەر)، ژمارە(٩)، ساڵی سێیەم، ١٩٩٩ز، ل٢٧.

[١٧٠] نیشتمان بەشیر،کوردو سەلجوقیەکان،ل ل١٨٦-١٨٧.

[١٧١] کامران عەزیز، هۆکارەکانی، ل١٠٣.

[١٧٢] أحمد توني عبداللطيف، العلاقات الدبلوماسية للخلافة العباسية(١٣٢-٢٣٢هـ)،مركز أسكندرية للكتاب، (٢٠٠٤م)، ص٢.

کورد پێویست و شیاوی پڕکردنەوە بوو، ئیدی ئیشیان بە کورد نەما، بەڵام چونکە کورد کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەوانەوە، بۆیە چارەنووسی سیاسی و ئابووری کوردستان بەرەو قۆناغێکی ترسناک چوو، ئەمەش لاوازی دبلۆماسیەتی کورد دەردەخات لەو قۆناغە مێژوویەدا.

## سێیەم/ نازناوی سیاسی:

نازناوەکانیش وەك دیاردەیەکی دی باوی سەدەکانی ناوەڕاست، کە پەیوەندییەکی بەهێزی بەدەسەڵاتی میری کوردەوە هەبووە، ئەگەر چی پێشتریش هەبوون، بەڵام لە ژێر کاریگەری بوەیهیەکان و سەلجوقیەکاندا زیاتر برەویان سەند، لە سەردەمی ئەو دوو هێزەدا جۆرە نازناوێك دەرکەوت کە پێشتر بەکار نەهاتبوو، کە ئەویش نازناوێکی لێکدراو لەزیاتر لە سیفەتێك پێکهاتبوو، کە نیشانەو ڕەنگدانەوەی دەسەڵاتی میری دەگەیاند[١٧٣]، وەك نازناوی میر و هسوزان (الأمير الاجل سيف الدولة وشرف الملة، مولى أمير المؤمنين)[١٧٤]، وەنازناوی میر نصرالدولەش بە(الامير الاعظم عز الاسلام سعدالدين نصرالدوله و شرف الملة ابو نصر احمد)هاتووە[١٧٥]، دیارە ئەمەش لە ژێر کاریگەری ڕووداوەکانی دەوروبەردا وەك دیاردەیەکی دی لەناو دەسەڵاتی سیاسی میانی کورد دەرکەوتووە، کە کاری کردۆتە سەر چەندێتی و چۆنیەتی دەسەڵاتیان، ئەمەش بەهۆی هەڵکەوتەی بەشێك لە جوگرافیای کوردستان و هاو سنووربوونی لەگەڵ خانەی شەڕ (دار الحرب)دا، کە ئەوەی سەپاندووە بە سەر میرەکاندا کە هەردەم لە شەڕو

---

[١٧٣] حسن الباشا، الالقاب الإسلامية، ص٦٣.

[١٧٤] ناصرخسرو، سفرنامه، مطبعة لجنة التأليف والترجمة، (القاهرة:١٩٤٥م)، ص٥.

[١٧٥] ناصر خسرو،سفرنامه،ص٨.

ململانێدابن لەگەڵ نەیارانی دژە ئایین[١٧٦] ، بەتایبەت هەر یەك لە میرنشینەكانی (ڕەوادی و شەدادی و مەڕوانی) لەو نێوەندەدا ڕۆڵی دیاریان گێڕاوە[١٧٧] ، بە شداریكردنی هەر میرێك لە چالاكیە سەربازیەكان لە چوارچێوەی جەنگی خۆ بەختكاری و بەرگری لە ئایین ، بەقازانجی ئەو میرانە گەڕاوەتەوە، بوونی ئەوانی لە ناو مێژوودا سەپاندووەو هێزەكانی تریش دانیان بەدەسەڵاتیاندا ناون[١٧٨] ، هەر ئەو بەرگری لە ئایینە وای كردووە، كە خەلیفە القادر بالله میر وهسوزان بەشمشێری دەوڵەت (سیف الدوله) بناسێنێ و پاراستنی ئابڕووی میللەت بەڕادەی بەرگری ئەو ببەستێتەوە[١٧٩] ، هەر لەو نێوەندەشدا پێویستە ڕۆڵی نصر الدوله لە بەرچاو بگیرێت لە خزمەتكردنی بە ئایین و پاراستنی ئاسایشی ناوچەكە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسیانەی كە لە خانەی شەڕەوە دەكرانە سەر ناوچە كەوشەنەكانی هەرێمی جزیرە[١٨٠] ، لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە، كە كاتێك بەرگریكردن لە ئایین دەبێتە ستراتیژییەتی میری كورد، ئەو كاتە ئەو هێزەی پاڵپشتی دەكات، هەر ئەو هێزە نییە، كە دەمارگیری و هێزی ئابووری پێ بەخشیوە، بەڵكو ئایین پاڵپشتی دەسەڵاتیەتی و ئەوانی دی لە بۆتەی دەمارگیری

---

[١٧٦] ئەگەرچی ململانێی سەربازی لە ناوچە كەوشەنەكان لە نێوان موسڵمانان و هێزە ناموسڵمانەكان لەو مێژووە كۆنترەو كورد لە پاڵ هێزە موسڵمانەكاندا بەردەوام وەك سەرباز ڕۆڵی گێڕاوە، بەڵام بە دەركەوتنی میرنشینەكان ئەم جارەیان ڕۆڵی سەركردایەتی بۆ پاراستنی ناوچەكان گێڕا.

[١٧٧] بۆنموونە هێرشەكانی میرمملانی ڕەوادی بۆ سەر ئەرمینیا بڕوانە: أحمد كسروي ، شهرياران، ص١٦٧ ؛ حسام الدين النقشبندي،اذر بيجان، ص ١٤٣، وەهێرشەكەی میر فضلونی شەدادی بۆسەر گرج،ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص ص ٤٩ -٥٠.

[١٧٨] بۆ نموونە دانانی دەوڵەتی فاتمی و بیزەنتی بە دەسەڵاتی میر(نصرالدوله)دا، بڕوانەس: الفارقي، تاريخ الفارقي، ص١٠٩؛ ابن الجوزي، المنتظم، ج٧، ص٢٢٢.

[١٧٩] ناصر خسرو، سفرنامه، ص٥.

[١٨٠] ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص٢٢٢؛ قادر محمد حسن، الإمارات الكردية، ص٦٥.

گشتیدا، کە لەسەر بنەمای ئاین بنیات نراوە دەتوێنەوە[181]، هەرچەندە توێژەرێك ئەو جۆرە پەیوەندییەی نێوان میرنشینەکان و هێزە ناموسڵمانەکانی بۆ ویستی پاراستنی ناوچەکەو تایبەتمەندی رەگەزی (نەتەوە)یی و سیاسی و سەپاندنی هەژمونی خۆیان لێکداوەتەوە[182]، بەڵام ئەو هەستە بە بەراورد بەهەستی ئایینی کاڵتر دەرکەوتووە، هەروەك ئاماژەی پێدرا، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبدرێت ئەوەیە کە میرە کوردەکان نازناوەکانیان پێبەخشراوە، بە پێچەوانەی بوەیهیەکان کە بەزۆر سەندیانن، هەر لێرەدا دەتوانرێت هەڵاوێرێك بکرێت لە نێوان ئەو میرانەی بەشداری جەنگی خۆ بەختکارییان کردووەو ئەوانەش کە زیاتر دەمارگیری و هێزی ئابووری دەسەڵاتی پێ بەخشیون، بۆ نموونە هەردوو میرنشینی حسنویهی و عەنازی، ئەوانە تا رووخانیان گیرۆدەی شەڕو ململانێی ناوخۆیی بوون، لەکاتێکدا ئەم دیاردەیە لەناو میرنشینەکانی دیدا کەمتر بووە، ئەمەش کاریگەری و رۆڵی ئاین لەسەر چەندیەتی و چۆنیەتی دەسەڵاتی میرەکان دەردەخات[183]، چونکە ئەوانەی رۆڵی کارایان هەبووە لە بەرگری لە ئاین، نەك تەنها لەسەر ئاستی ناوچەکە، بەڵکو لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی و دەرەوەشدا ناسراون، بەمەش تاڕادەیەك سیمایەکی ئایینی بەدەسەڵاتی ئەو میرانە بەخشراوە، بەڵام ئەمە بەڵگە نییە لەسەرنەوەی دەسەڵاتی میری کورد دەسەڵاتێکی

---

[181] بروانە: حیدر لشكری، الكرد في المعرفة التاريخية الإسلامية،دار سپيريز،(دهوك:٢٠٠٤م)، ص١٥٠.

[182] كرڤان محمد آميدی، الكرد فی كتابات المؤرخ ابن الاثير،ص٢٣٩.

[183] وەنەبێت میرەکانی ئەو دوو میرنشینە بایەخیان بە ئاین نەدابێت، بۆ نموونە میر(بدر) پارەو سامانێکی زۆری بۆ پرۆژە ئایینیەکان و مەراسیمی حەج خەرج کردووە، بروانە: الروذراوری، ذيل تجارب الأمم، ملحق بالكتاب (تجارب الامم)، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٣م)، ج٦، ص١٧٢؛ابن الجوزي، المنتظم، ج٧، ص ص٢٧١ -٢٧٢.

ئایینی بووبێت، چونکه دەسەڵاتی میر لە هی دادگەرو دەزگا ئایینیەکانی دی جیا بووە[١٨٤].

لەبەرئەوە میرە کوردەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون نازناوی گەورە بەدەست بهێنن، کە بە هۆیەوە شکۆمەندیان زیادبکات و داکۆکیشیان لەسەر ئەوە کردووە، بەتایبەت ئەوانەی کە لەلایەن خەلیفەوە دەبەخشران بایەخ و تایبەتمەندی خۆیان هەبوو، سەرباری شەرعیەت دان بە میر، لە هەمان کاتدا بە هۆیەوە دەسەڵاتێکی مەعنەوی گەورەشیان بەسەر خەڵکی و هێزەکانەوە دەست دەکەوت[١٨٥]، بۆیە هەندێ جار نازناوێکیان قبوڵ نەدەکرد کە لەگەڵ شان و شکۆیان نەیەتەوە، وەك قبوڵنەکردنی نازناوی (نصرە الدولە) لەلایەن میر بدرەوە، کاتێك خەلیفە (القادر باللە)(٣٨١-٤٢٢ك/٩٩١-١٠٣٠ز) پێی بەخشی، بەڵکو ئەو داوای نازناوێکی گەورەتر لەوەی دەکرد، کە لەگەڵ شانوشکۆی گونجاو بێت، بۆیە بە ناچاری خەلیفە ناصر الدین و الدولەی پێ بەخشی[١٨٦]، ئەم رووداوە گرنگی نازناو بۆ میرەکان روون دەکاتەوە، لەلایەکی تریش ئەو لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی یەکەم کەس بوو جگە لە خەلیفەکان، کە نازناوێکی پێ ببەخشرێت کە هەڵگری پاشگری (الدین) بێت[١٨٧]، دواتر بەشێوەیەکی فراوانتر ئەم جۆرە نازناوانە بڵاوبوونەوە[١٨٨]، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە میرە کوردەکان هاوشانی میرەکانی بوەیهی، داکۆکییان لەسەر نازناوی گەورە دەکردو لە

---

(١٨٤) حیدر لەشکری، دەسەڵاتی میری کورد، ل٢٩.

(١٨٥) آدم متز، الحضارة الإسلامية، مج١، ص٢٤٣.

(١٨٦) الروذراوری، ذیل تجارب الأمم، ج٦، ص١٨٦؛ ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٥٠١؛ ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١١،ص١٣٠.

(١٨٧) حسام الدين نەقشبەندی، شارەزوور، ل٣٨٩؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: قادر محمد حسن، الإمارات الكردية، ص٦٣.

(١٨٨) حسن الباشا، الالقاب الإسلامية، ص٦٥.

هەوڵی ئەوەشدا بوون، کە لەلایەن خودی خەلیفەوە ئەو ڕێزەیان لێ بنرێت، نەك هێزێکی دی، هەروەك چۆن میر نصر الدولەی مەروانی ساڵی(٤٠٣ك/١٠١٢ز) نازناوی (نصر الدوله و عمادها)ی خەلییفە القادری قبوڵ کردو نازناوی (عزالدولـه وبجـدها)ی خەلیفـە الحـاکم بـأمرالله (٣٨٦-٤١١ك/ ٩٩٦-١٠٢٠ز) فـاطمی ڕەت کردەوە[١٨٩]، بەم شێوەیە نازناوەکان بوونە دیاردەیەکی سیاسی کە دەسەلاتێکی مەعنەوی گەورەیان بەمیر دەبەخشی لەفەرمانڕەوایی کردنی بەسەر خەڵکدا، بەڕاددەی گەورەیی نازناوەکەش هێزی مەعنەوی زیاد دەبوو.

شوێنەوارەکانی دی هێزەکان لە سەر سیستەمی دراوی میرنشینە کوردیەکان دەرکەوتووە، وەك هێمایەك بۆ پاشکۆیەتی سیاسی و ئابووریان، یانیش گوزارشتی لە پەیوەندی ئاسایی نێوانیان کردووە[١٩٠]، کە وەك ترادسیۆنێکی تازە لە ژێر کاریگەری سیستەمی دراوی هێزە داگیرکەرەکان لە ناو میرە کوردەکانیشدا سەریهەڵداوە، کە لـە نموونەی ئەو(دیناره زێڕو درهەمە زیوانە)[١٩١]ی سەردەمی هەندێ لە میرە کوردیەکان دۆزراونەتەوە، ئەو ڕاستیە بەرجەستە بووە، لەوانە لەسەر سێ لەو درهەمانەی میرنشینی مەروانی کە لە سێ کاتی جیاوازدا لێدراون لە پاڵ ناوی میری میرنشینەکە

---

[١٨٩] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص ١٠٨ -١٠٩؛ ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص٢٢٢؛فرست مرعـي، الامارات الكردية في العصر العباسي، دار سپيريز،(دهوك:٢٠٠٥م)، ص ٢٨٣.

[١٩٠] قادر محمد حسن، الإمارات الكردية، ص٧٦.

[١٩١] نرخی دینار بە پێی کات گۆڕاوە، هەر دینارێك بەرامبەر (دە تا چواردە یان پازدە) درهەم بووە، بەهەمان شێوە کێشی زێڕو زیوی بەکارهاتووش بە پێی میرنشینەکان و دەوڵەتەکان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لە گۆڕاندابووە، دیارە هەر بەپێی ڕێژەی زێڕەکەش نرخی دینار لە بەرامبەر درهەم و هێزی شت پێکڕینی دیاری کراوە، بڕوانە: حسان الـدین نەقشبەندی، شارەزوور، ل٤٣٧؛ سوادي عبد محمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية، ص٣٢٩؛ عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، دار ئاراس،الطبعة الثانية،(اربيل:٢٠٠١م)، ج٢، ص١١٢.

ناوی هەریەك لە خەلیفەی عەبباسی و میرە بوەیهی لەسەر نەخش کراوە، کۆنترینـشیان بۆ سالّی (٣٨٥ك/٩٩٥ز) دەگەڕێتەوە، کە لە جزیرە لێدراوەو لەسـەر ڕوویـەکی نـاوی (ابو علی حسن)ی دووەم میری مـەڕوانی و خەلیفـە القـادر بـالله و لەسـەر ڕووەکـەی تریشی ناوی بهاء الدولەی بوەیهی لەسەر نەخشکراوە، وە ئەو درهەمەی کە لـە سـالّی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز) لە نصیبین لێـدراوە، کـە نـاوی ممهدالدولـەی مـەڕوانی لـە سـەر ڕوویەکیان و ناوی القادر بالله و بهاء الدولە لە سەر ڕووەکەی تریانـە، وە لەسـەردەمی نصرالدولە ش لە سالّی(٤١٢ك/١٠٢١ز) لە شاری جزیرە درهـەمێکی دی لێـدراوە، کە ناوی هەریەك لە خەلیفەی ناوبراو و (ملك شانهشا ابـو شـجاعی) بـویهی لەسـەر هەلّکەندراوە[١٩٢].

نەخشکردنی ناوی خەلیفەی عەبباسی و میری بوەیهی لـە سـەر دراوی میرنـشینی حـسنویهیش دەبینرێـت، لـەو دینـارە زێـڕەی سـەردەمی مـیر بـدر کـە لـە سـالّی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز) لە شاپورخواسـت لێـدراوە، نـاوی خەلیفـە القادربـالله و بـدر لـە ڕوویەکیان و ناوی مجد الدولەی بویهیش لە ڕووەکەی تریان نەخشکراوە[١٩٣]، ئەم دینارە لە هەرێمی چیاکان بلاّوبۆتەوەو بە دیناری(البدریة) ناسراوە[١٩٤].

بەهەرحالّ ئەگەرچی لێدانی سکە نیشانەیەکە لە نیـشانەکانی سـەربەخۆیی[١٩٥]، بەلاّم هـەلّکۆلّینی نـاوی میرەکـانی بـوەیهی لـە سـەر دراوی میرنـشینەکان دەکرێـت لێکدانەوەی جیاوازی بۆ بکرێت، لە گوزارشتکردن لە پەیوەندی دۆستایەتی نێوانیان و دانپێدانانێکی ڕەمزی بە دەسەلاّتی بوەیهیەکان، یـانیش بـارودۆخێکی سیاسـی ئـەوەی بەسەردا سەپاندوون، بۆ نموونە وەك ئەوەی میر بدر کە خۆی بە قەرزباری ئەوان دەزانێ و

---

[١٩٢] عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة، ج٢، ص ص١٠٩-١١٠.

[١٩٣] حسام الدین نەقشبەندی، شارەزوور، ل ل٤٣٧-٤٣٨.

[١٩٤] الصابي، رسوم دار الخلافة، ص١٠٣.

[١٩٥] بدلیسی، شەرەفنامە، ل٢٥.

هۆکاری وەرگرتنی پۆستی میرایەتی لە ناو بنەماڵەکەیدا[196]، کە هەر چۆنێك بێت کاریگەری سیاسەتی ئەو هێزە بێگانە بەسەر سیاسەتی ئابووری میرە کوردییەکانەوە دەرخستووە، نووسینی ناوی خەلیفەش داننانە بە دەسەڵاتی ڕوحی خەلیفە، بەم هۆیەشەوە شەرعیەتیان بۆ خۆیان لە خەلیفە وەرگرتووە، بە واتایەکی دی ئەگەر ئەمە پاشکۆیەتی ئابووریش بگەیەنێت، ئەوا بە دیوێکی دیدا دەکرێت بە جۆرێك لە سیاسەت و خاڵێکی ئەرێییانە لێکبدرێتەوە.

## چوارەم/ جێگیربوونی دەسەڵاتی هێزە بیانیەکان و پوکانەوەی دەسەڵاتی سیاسی کورد (میرنشینەکان).

هەر لەشکرکێشییەك کە دەکرێتە سەر ناوچەیەك (هەرێمێك)، بەقەدەر ڕادەی بەهێزی و ئاستی توانای سیاسی و سەربازی لەشکرەکە، کار بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی و هێنانە دی ئەو ئامانجانە دەکات کە بۆی هاتووە، لەو پێناوەشدا میکانیزم و تاکتیکی جۆراوجۆر دەگرێتەبەر و هەنگاوەکانیشی بە ڕووپۆشێکی ئایینی یان سیاسی... وێنا دەکات، ئەمەش زۆر جار بەرئەنجامێکی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە، کە خۆی لە پوکانەوەی دەسەڵات و هێزی لەشەکر بۆ سەر کراودا دەبینێتەوە، بەتایبەت لەکاتێکدا، کە ناهاوسەنگی لەنێوانیاندا هەبێت، ئەوا ئەم پرۆسەیە خێراتر بەئەنجام دەگات، سرووشتی ئەم لەشکر کێشیانەی کە کراونەتە سەر کوردستان، زۆر جار هەمان تایبەتمەندی و شوێنەواریان لێ کەوتۆتەوە، کە لێرەدا دەیخەینە ڕوو.

هێزە داگیرکەرەکان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوون، کە ئیرادەی سیاسی و سەربازییان بسەپێنن و کورد بخەنە ژێر هەژموونی دەسەڵاتی خۆیانەوە، بە سەرنجدان لە شێوازی

---

[196] ابن الجوزي، المنتظم، ج٧، ص٢٧٢؛ حسام الدين نەقشبەندی، شارەزوور، ل٤٠٤.

مامەڵـە کردنیـان و لـەپێناو سـەپاندن دەسـەلاتیاندا و کـارکردن بـۆ لاوازکـردن و لـەناوبردنی دەسـەڵاتە خۆجێییـەکانی کـورد، میکـانیزم و ڕێگـای جـۆر بـەجۆریان گرتۆتەبەر، ڕەنگە ڕێگای هێزی سەربازی وەك خاسیەتی هەر داگیرکەرێك لە پێـشینەی ڕێگاکانی ترەوە بووبێت، ئەوەی لەم بارەیەشەوە هەلی پێشڕەوی کردن و سەرکەوتنی بـۆ هێزەکان زیاتر ڕەخساندووە، ئەوە بووە کە کورد خاوەنی هێزێکی سەربازی یـەکگرتووی خۆماڵی نەبووە، لە تەکنیك و تەکتیکدا هاوتای ئەوان نەبووە[197]، (زەیاریـەکان) وەك هێزێکی داگیرکەر و پەنابردنی هەمیشەییان بـۆ ئـەو میکانیزمـە بـەئامانجی دەسـت بەسەرداگرتنی ناوچەکانی کوردسـتان، شـوێنەواری خراپـی لێ کەوتۆتـەوە، هێـرش و پـەلامارەکانیان بـە سـەرکردایەتی (لـشکری) سـاڵی (٣٢٦ك/٩٣٧ز) بـۆ سـەر ئازربیجان، کـە لاوازبـوونی دەسـەلاتی (دیـسم)ی کـوردی و داگیرکردنـی ناوچـەکەی لێکەوەتەوە، نمونەیەکی دیاری ئەم سیاسەتە بووە[198].

بوەیهیەکانیش لە ماوەی (١١٥) ساڵەی فەرمانڕەواییاندا چەندین جار پەنایان بۆ ئەم ڕێگایە بردووە، (معز الدولـە)(٣٣٤-٣٥٦ك/ ٩٤٥-٩٦٦ز) بـەهۆی هێـزەوە تـوانی ناوچەی (حلوان) و دەوروبەری داگیر بکات (ابن ابی الشوك) ناچار بـە ملکەچـکردن و پیشاندانی گوێڕایـەڵی بکـات سـاڵی (٣٤٢ك/ ٩٥٣ز) و بەرپرسـیارێتی پاراسـتنی ناوچەکەشی لێ وەرگرێتەوە[199]، هێرشەکەی (رکن الدولـە) سـاڵی (٣٥٩ك/ ٩٦٩ز) بـۆ سـەر میرنـشینی حـسنویهی، بەمەبەسـتی دانـانی بـەر بەسـت لەبـەر دەم توانـا سەربازیەکانی میر (حسنویهی) و سەپاندنی هـەژموونی دەسـەلاتی خـۆی بەسـەریدا، بەتایبەت دوای ئەوەی هەستی بە مەترسی گەشەکردنی دەسەلاتی ئەو میرە کوردە کرد،

---

[197] لەم بارەیەوە بروانە شوێنەوارە سەربازیەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[198] مسکویە،تجارب الأمم،ج٥،ص٢٢١؛ ابـن خلـدون،العبر،ج٤،ص٥٩٩؛ قـادر محمـد حسن،الامارات الکردیة، ص١٥.

[199] مسکویه ،تجارب الأمم، ج٥، ص٣١٣؛ ابن الأثیر ، الکامل، ج٧، ص٢٠٦.

ئەوە بوو بە سەرکردایەتی (ابن العمید)ی وەزیری لە شاری (الـری)و بەسـوپایەکی پـڕ چەکەوە پەلاماری (حسنویهی) دا، بەڵام لە ڕێگادا (ابن العمید) مـردو (ابـوالفتح)ی کوڕی ئەرکی سەرکردایەتی سوپای گرتە دەست، ئـەویش پێـشنیاری ئاشـتی بـۆ مـیر (حـسنویهی) کـرد، میریـش لـە پێنـاو پاراسـتنی وڵاتەکـەی لـە کاولکـاری ئـەم لەشکرکێشیە بەمەرجەکانی ئاشتی ڕازی بوو[٢٠٠].

سەلجوقیەکانیش وەك هێزێکی دیارو کاریگەر، زیاتر لە بوەیهیەکان پێداگرییان لەسەر ئـەو شـێوازە کـردووە، تاڕادەیـەکی زۆریـش سـەرکەوتوو بـوون، لـە درووسـتکردنی دەوڵەتێکی مەیدان فراوانی بەهێز، کە سیاسەت و ئامۆژگاریەکانی (نظام الملك) لـەو نێوەندەدا ڕۆڵی دیاری بینی، ئەو سیاسەتەشیان شوێنەواری خراپی لەسەر چارەنووسـی میرنشینە کوردیەکان بەجێهێشت، بەتایبـەت سـەردەمی (ملکـشاە)، کـە سـەردەمی جێبەجێ کردن و چەسپاندنی ناوەندیەتی و فراوانخـوازی سـەلجوقیەکانە[٢٠١]، ئـەو لـە میانەی پرۆسەی فراوانخوازی خۆیدا زمانی گفتوگـۆی نـەدەزانی و بـەردەوامیش هـانی هێزە سەربازیەکانی دەدا بۆ لێدانی دەسـەڵاتە خۆجێیـەکانی کوردسـتان[٢٠٢]، بـەهۆی کاریگەریی ئەو سیاسەتە سەربازیەش کە پەیڕەوی دەکرد، توانی هـەموو هەرێمـەکان ملکەچی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی سەلجوقیەکان بکات، بەمەش کاریگەریی خراپی کـردە سەر کوردستان، ئەگەرچی سەرچاوەکان خۆیان لە باسکردنی هێرشەکانی بۆ سەر کورد بەدوور گرتووە، لەبری ئەوە ستایشی سوڵتان و دەستخۆشییان لە هەنگاوەکانی کردووە، جگە لە ئاماژەیەکی (البنداری) نەبێ، کە نووسیویەتی ((توانی دەوڵەتە بـچووکەکان

---

[٢٠٠] ابـن الأثـیر، الکامـل، ج٧، ص٢٩٢؛ بەدلیـسی، شـەرەفنامە،ل٣٤؛ حـسام الـدین نەقـشبەندی، شارەزوور، ل٢٣١.

[٢٠١] عبدالنعیم حسنین، سلاجقة، ص٨١.

[٢٠٢] بۆنموونـە بروانـە: الأصـفهانی، تـاریخ الدولـة ال الـسلجوق،ص٢١٨؛نیـشتمان بەشـیر، کـوردو سەلجوقیەکان، ل٢٧٣.

بڕوخێنێ و جیهانێکی ئیسلامیی یەکگرتوو درووست بکات))[٢٠٣] ئاماژەیەکی تر بەرچاو ناکەوێت، ئەگەر سەرنج بدەینە مێژووی ڕووخانی میرنشینەکانیش، دەبینین زۆربەیان لەماوەی (بیست) ساڵەی فەرمانڕەوایی سوڵتان(ملکشاه)دا لەناوچوون[٢٠٤].

سەبارەت بە خوارزمیەکان و مەغۆلیش دەکرێ بوترێ لە هێزەکانی دیکە زیاتر فراوانخوازی و پرۆسەی داگیرکردنی وڵاتانیان بە بنەمای هێزەوە پەیوەست کردبوو، لەم بارەیەشەوە لەشکرەکانیان خراپترین دیمەنی لەشکرکێشی و داگیرکارییان پێشکەش بە مێژووی مرۆڤایەتی کرد، بەتایبەت مەغۆلەکان کە بەتوندوتیژی و خوێن ڕێژی بەناوبانگ بوون، لە پرۆسەی کوشتندا جیاوازییان لە نێوان گەورەو بچووك و ژن و منداڵدا نەدەکرد[٢٠٥]، ڕەنگە ڕێگەیەکی کاریگەرتر لە بەکارهێنانی (هێز) کە بەردەوام بە شێوازی جۆراوجۆر لە میانەی شەڕەکاندا سودی لێدەبینرا وهەڕەشەیان پێ لەنەیارەکانیان دەکرد، لەبەردەم مەغۆلەکاندا نەبووە[٢٠٦]، کە لەداگیرکردنی شارو قەڵاکانی کوردستان پەیڕەویان لێ کرد، لە نموونەی شاری (هەولێر) و شارەکانی دی جزیرە کە مێژوونوسی مەغۆلی (الهمذاني) ڕووداوەکانی دەگێڕێتەوە، لە نموونەی ئەو جۆرە داگیر کردنەن[٢٠٧].

میرنشینەکان لە قۆناغە یەکەمەکانی فەرمانڕەوایی (تەمەن) یاندا، توانییان سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن، بەڵام لەگەڵ هاتنی وەچەی دووەمدا نیشانەکانی لاوازییان تێدا دەرکەوت و کەوتنە ژێر کاریگەری هێزە دەرەکیەکان، ئەمەش لەگەڵ دیدی (ابن

---

[٢٠٣] تاريخ الدولة ال السلجوق، ص٦٥.

[٢٠٤] میرنشینی شەدادی ساڵی(٤٦٨ك)دەسەڵاتی لەگەنجە نەما ومیرنشینی ڕەوادی ساڵی(٤٦٩ك) و میر نشینی مەڕوانی ساڵی (٤٧٨ك) ڕوخێنراون، کە سێ میرنشینی بەهێزو دیاری کورد بوون.

[٢٠٥] ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص٣٦١؛سەید ئەل بازعەرینی، مەغۆلەکان، ل ٦٣.

[٢٠٦] سەید ئەل باز عەرینی، مەغۆلەکان، ل٦٣.

[٢٠٧] جامع التواريخ، مج٢،ج١، ص٣٢٥؛علاء محمود، المغول في الموصل، ص٨٨.

خلدون)دا دێتەوە، کە بڕوای وایە ((قۆناغی یەکەمی- وەچەی یەکەم- دەوڵەت داهێنەرو بەهێزن و لەوەچەی دووەمیشەوە دەوڵەت بەرەو لاوازی دەچێت و هێزی بەرگری کەم دەبێتەوە))[٢٠٨]، ئەم حاڵەتی بەرەو لاوازچوونی میرنشینەکان دەرفەتی دایە دەست هێزە دەرەکیەکان، تا بەمەبەستی مل پێ کەچ کردن و سوودوەرگرتن لە توانای مادی و مرۆییان بە زیاتر لە شێوازێك دەست وەربدەنە ناو کاروباری ناوخۆییانەوە، میرنشینی (حسنویهی و عەنازی) یش باشترین نموونەی ئەو جۆرە سیاسەتەمان بۆ دەستەبەر دەکەن، ئەوەتا بەمردنی میر (حسنویهی کوڕی حسین) ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز)[٢٠٩]، گڵۆڵەی میرنشینەکە کەوتە لێژی، چونکە دوای ئەم ڕووداوە دەرگای کێشەو ململانێی بنەماڵەیی لە نێوان کوڕانیدا کرایەوە، بوەیهیەکانیشی هاندا کە دەست بخەنە ناو کاروباری ناوخۆییانەوە (عضد الدولة) ئەم پرۆسەیەی بە هێرشکردنە سەر میرنشینەکە دەست پێکرد[٢١٠]، سەرباری دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی میرنشینەکە، هەر (شەش) کوڕەکەی میر (حسنویهی) لەناوبردو لەناویاندا تەنها (بدر)ی هێشتەوەو سەرکردایەتی میرنشینەکەی پێ سپارد[٢١١]، میر (بدر)یش (٣٦٩ -٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٤ز) بە درێژایی (سی و شەش) ساڵ تەمەنی فەرمانڕەوایەتی پاداشتی ئەو چاکەیەی دانەوەو بەشی زۆری توان سەربازیەکانی بۆ کێشەو ململانێ ناوخۆییەکانی بوەیهیەکان تەرخان کرد، ئەو لەبەر پێنەگەیشتوویی هۆشیاری سیاسی، ئەگەرچی لە لایەن مێژوونووسانەو زۆر وەسفی هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتیەکانی کراوە[٢١٢]، بەڵام

---

[٢٠٨] المقدمة، ص٣٢٠" هاشم يحيى الملاح، المفصل، ص١٤٣.

[٢٠٩] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٣٧٠؛ بەدلیسی، شەرەفنامە، ل٣٤.

[٢١٠] مسكويه ،تجارب الأمم، ج٥، ص٤٥٢؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦١٦؛ ڕۆژ بیانی، میرنشینی حسنویهی، ل٥٨.

[٢١١] مسكويه ،تجارب الأمم،ج٥، ص٤٥٣؛ روذراوري، ذيل تجارب الأمم، ج٦، ص١١.

[٢١٢] بۆنمونە بڕوانە: ابن جوزي، المنتظم،ج٧، ص٢١٧.

لەڕاستیدا نەیتوانی بۆ درێژەدان بە تەمەنی میرنشینەکەی، لە بەرژەوەندی خۆی سوود لەم بارودۆخە وەربگرێت.

بارەشکردنەوەی بۆ ئەو میرزادانەی لە دەسەلاتی میرێکی بنەماڵەی خۆیان یاخی دەبوون، شێوازێکی دی دەست تێوەردانی هێزە داگیرکەرەکان بوو لە کاروباری ناوخۆی میر نشینەکاندا، داڵدەدانی (سعدی کوری ابی شوك)ی عەنازی کە دوای مردنی میر (ابی شوك)ی باوکی ساڵی(٤٣٧ك/١٠٤٥ز) لە دەسەلاتی میر (مهلهل)ی مامی یاخی بوو، لەلایەن (ابراهیم ینال)ەوە، نموونەیەکی دیارە لەو بارەیەوە[٢١٣]،(سعدی) بە پاڵپشتی و هاوکاری سەلجوقیەکان هێرشی کردە سەر شاری (حلوان) ساڵی (٤٣٨ك/١٠٤٦ز)و توانی دەستی بەسەردا بگرێت و لە بەرامبەریشدا بەناوی ئەوانەوە کاروباری ناوچەکەی بەڕێوەبرد، وتاریشی بە ناویانەوە خوێندەوە[٢١٤]، کە سەرئەنجام بەچەسپانی دەسەلاتی سەلجوقیەکان و لاوازبونی دەسەلاتی عەنازی کۆتایی پێهات.

سوڵتان (طغرل بك)یش بە هێزێکی (پێنج) هەزار کەسی بۆ هێرش کردنە سەر شاری (میارفارقین) کۆمەکی بە(سعیدی کوری نصر الدولە)ی مەڕوانی کرد، کاتێك لەساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز) لە دەسەلاتی میر(نظام الدین)ی برای یاخی بوو[٢١٥]، بەلام (نظام الدین) بە لێبوردەیی و لێزانی خۆی لەگەڵ براکەی پێك هاتوو، بە پێدانی (پەنجا) هەزار دیناریش وەکو قەرەبوو بە سوپای سەلجوقی کۆتایی بە کێشەکە هێنا[٢١٦].

---

[٢١٣] ابن جوزیی، المنتظم، ج٨، ص١٣٠؛ ابن الأثیر، الكامل، ج٨، ص٥٦.

[٢١٤] ابن الجوزي، المنتظم،ج٨، ص١٣٠؛ابن الأثیر، الكامل، ج٨، ص٥٧؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦٢٢.

[٢١٥] الفارقي، تاریخ الفارقي،ص ص١٨٠ -١٨١؛ ابن شداد، الاعلاق الخطیرة، ج٣، ق١، ص٣٦٧.

[٢١٦] الفارقي، تاریخ الفارقي،ص١٨١؛ ابن شداد، الاعلاق الخطیرة، ج٣، ق١، ص٣٦٧.

زۆرجار هێزه داگیرکەرەکان ئەو میرو دەسەڵاتدارانەی کە لەگەڵ سیاسەتدا دەگونجان و دڵنیابوون کە مانـەوەیان نابێتـە مایـەی مەترسـی بـۆ سـەر بەرژەوەندییـەکانیان، بەنیمچە سەربەخۆیی دەیانهێشتنەوە، ئەمەش سیاسەتێکی جێگیرو بنچینەیی نەبوو، کـە لەسـەر بنـەمای بـاوەڕبوون بـە ئـازادی و سـەربەخۆیی بـەڕێوەبردنی کاروبـاری میرنشینەکان دانرابێ، بەڵکو سۆز نواندنێك بوو، بۆ سوود وەرگرتن لە توانا ئابووری و سەربازییەکانیان لە کاتی پێویستدا[217]، هێشتنەوەی میرنـشینی (هـذباني)(٤٣٧ - ٥٣٤ك/١٠٤٥-١١٣٩ز)[218] لە هەولێر لەلایەن سەلجوقیەکانەوە دەچێتە چوارچێوەی ئەو سیاسەتەوە، چونکە (هذباني)یەکان بە هۆی گوێڕایەڵی و ملکەچییان بۆ ئـەوان و یارمەتیدانی سەربازییان بۆ دژایەتی کردنی نەیارانی دەرەوە لەلایەك[219]، نائـارامی بارو دۆخی ناو خۆشیان لە لایەکی دییەوە هەر لە بنچینەدا نەبوون بەمەترسی لەسـەر دەسەڵاتی سەلجوقیەکان لە ناوچەکەدا[220]، مێژووش دەری خست کە هێـشتنەوەی ئـەم میرنشینە بە گوێرەی ڕەوتی ڕووداوەکان لە بەرژەوەندی خۆیاندا بوو، چونکە هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ئەتابکیەی (زەنکی) کـرا بـەقوربانی فراوانخوازیـەکانی و دەسـتی بەسـەر

---

[217] مینورسکی، الأکراد ملاحظات، ص٢٦.

[218] بۆ زانیاری لەسەریان بڕوانە: أحمد عبدالعزیز، إمارة الهذبانیة.

[219] ابن الأثیر، الکامل، ج٨، ص٥٣٥؛ أحمد عبدالعزیز، إمارة الهذبانیة، ص٩٤.

[220] نیشتمان بەشیر، کوردو سـەلجوقیەکان، ل٢٩٩؛ بـەلام هـەر ئـەم توێـژەرە ڕایـەکی پێـچەوانەی بـاس کردووە کە دەڵێ ((سـەلجوقیەکان ئـەوەیان دەزانـی کـە هزبانیـەکان دەسـەڵاتێکی گـەورەیان هەیـە، بۆیـە بەباشیان زانی بیانهێڵنەوە، کە پێمان وایە ڕای یەکەم لە ڕاستییەوە نزیکترە، بڕوانە، کوردو سەلجوقیەکان، ل٣٠٠)).

هـەولێردا گـرت، میرنـشینەکەش پوکایـەوە، سـەلجوقیەکانیش لارییـان نەنوانـد لـە ڕووخاندنی[٢٢١].

شوێنەوارێکی خراپی لەشکرکێشییەکانی سەر کوردستان کـە تـا ئـەمڕۆش مانـەوەی تێبینی دەکرێت، مل دانی هەندێ هێزە بۆ خواسـتەکانی هێـزی داگیرکـەر لـە پێنـاو مانەوەدا، بەمەش ئیرادەی سیاسـی خۆیـان لەدەسـت داوەو بوونەتـە داردەسـتی هێـزی داگیرکەر، هەرکاتێکیش لاری بوونێکیان نواندبێت تووشی لـە سـەرکار لابـردن، یـان پوکانەوەو لەناوچوون بوون، چونکە هەمیشە داگیرکەرانی کوردستان کاریان لـە سـەر ئەوەکردووە کە هیچ خـاوەن هێـزو دەسـەلاتێك لـە بەردەمیانـدا گـەورە دەرنەکـەوێت، هەروەك چۆن میر (وهسوزان)ی ڕەوادی بەدەر برینی ملکەچیی بۆ (طغرل بـگ) سـالی (٤٤٦ك/١٠٥٤ز) سولتانی لە خۆی ڕازی کرد[٢٢٢]، بەلام بـەو هەلوێـستەی ئـیرادەی سیاسی خۆی لەدەست دا، چونکە دواتـر بـەبێ ڕازی بـوونی خـۆی لـە لایـەن هـەمان سولتانەوە لە سالی (٤٥٠ك/ ١٠٥٨ز) لەسەر کار لابرا[٢٢٣]، مەغۆلەکانیش زۆر جار پەنایان بردۆتە بەر ئەم سیاسەت و تاکتیکە، میر (حسام الـدین عکـە) فـەرمانڕەوای (دەرتەنگ)[٢٢٤]، بەمەبەستی دەربڕینی ملکەچـی چـووە خزمـەتی (هۆلاکـۆ) سـالی (٦٥٥ك/١٢٥٧ز) ئەویش لەسەر کاروبارەکەی هێشتیەوەو سـنووری دەسەلاتیـشی بـۆ

---

[٢٢١] بڕوانـە: ابوشـامة، روضـتین في أخبـار الـدولتین النوریـة والـصلاحیة، (القـاهرة:١٩٥٦م)، ج١، ق١، ص٧٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بن ایوب،(مصر:١٩٥٣م)، ج١، ص٩٧؛ محسین محمد حسین، اربیل في العهد الأتابكي، (بغداد:١٩٧٦م)، ص٤٢.

[٢٢٢] ابن الأثیر ، الكامل، ج٨، ص١١٦؛ ابو الفداء، مختصر فی أخبار البشر، ج١، ص٥٢٨.

[٢٢٣] ابن الأثیر، الكامل، ج٨، ص١٦٢، حسام الدین النقشبندي، اذربیجان، ص١٧٠.

[٢٢٤] دوای لاوازبوون و پارچە پارچەبوونی دەولەتی سەلجوقی لە کۆتاییەکانی سەدەی (شەشەمی کۆچـی و دوازدەیەمی زاینی) لە ناوچەی حلوان (دەرتەنگ) دەرکەوت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، زرار صـدیق، چەند لێکۆلینەوەیەك، ل٥٨ ئەوانی دی.

فراوان كرد، كاتێكیش له هەڵوێستەكەی پەشیمان بۆوه هێرشی كرایه سەرو خۆی و دەسەڵاتەكەشی لەناوبران(٢٢٥)، هەروەها (تكلەی كوری هەزار ئەسپ)یش هەمان چارەنووسی هەبوو، كاتێك لەشكری مەغۆل گەیشته سنوری دەسەڵاتی ملكەچی خۆی بۆ سوپای هۆلاكۆ ڕاگەیاند و بۆ هاوكاریشیان بەرەو بەغدا كەوته ڕێ(٢٢٦)، بەڵام كه هەواڵی كوژرانی خەلیفه (المستعصم)(٦٤٠-٦٥٦ك/١٢٤٢-١٢٥٨ز) و كۆمەڵكوژی موسڵمانانی لەسەر دەستی لەشكری هۆلاكۆ بینی پەشیمان بۆوەو گەڕایەوه بۆ لوڕستان، هۆلاكۆش سوپایەكی نارده سەرو سەرەنجامیش كوژرا(٢٢٧).

گۆڕینی سنووری قەڵەمڕەوی میرنشینەكان و درووستكردنی كێبڕكێ له نێو میرەكاندو تووشكردنیان به ملاملانێی یەكتری بەئامانجی لاوازكردن و لەناوبردنیان، شێوازێكی دی دەستتێوەردانی هێزه داگیركەرەكان بوو له كاروباری ناوخۆی میرنشینەكان، ئەم سیاسەته لای بوەیهیەكان كلیلی نهێنی جوڵاندنی هەستی دوژمنایەتی نێوان میرنشینی حسنویهیی وعەنازی بووه، بەجۆرێك لەگەڵ هاتنی هەر میرێكی بوەیهیدا بۆ سەردەسەڵات، گۆڕان بەسەر جۆری پەیوەندی و دوژمنایەتی ئەوانیشدا داهات(٢٢٨)، (ابن خلدون) لەم بارەیەوه جوان وەصفی میر (محمدی كوری عناز)ی كردووه كه به دوژمنی بدر(عدوبدر) ناوی بردووه(٢٢٩)، ئەوەی ئاشكراشه میر (محمد) بەردەوام له

---

(٢٢٥) الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ص٢٧٧-٢٧٨ ؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه: عبدالحليم عبدالله العزاوي،دور الكرد في مقاومة الغزو المغول،ص١٩٨ ومابعدها.

(٢٢٦) حمدالله مستوفي، تاريخ گزيده،ص٥٤٣ ؛ بەدلیسی، شەرەفنامه، ل٤٨؛ محمد امين زكي،مشاهر الكرد،ص٥٩.

(٢٢٧) حمدالله مستوفي، تاريخ گزيده،ص ص٥٤٣-٥٤٤؛بەدلیسی،شەرەفنامه،ل٤٨؛رمضان شريف، لورستان الكبرى،ص ص٨٢ -٨٣.

(٢٢٨) فرست مرعي، الامارات الكردية، ص٣٥٣.

(٢٢٩) العبر،ج٤، ص٦١٧.

چوارچـــێوەی سیاســـەتی بوەیهیەکانـــدا دەخولایـــەوە[٢٣٠]، کاتێـــك کـــە ســـاڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز) ئەرکی پارێزگاریکردنی رێگای (خۆراسان)ی پێ سپێررا لە لایـەن بوەیهیەکانەوە[٢٣١]، میر (بدر) بەدەست تێوەردان لە کاروباری میرنشینەکەی و سنووری قەڵەمڕەویەکەی هەژماری کرد، بۆیە لێی شێتگیر بـوو، پـەلاماری دا و مـیر (محمدی کوڕی عناز)یش ڕایکرد بەرەو بەغدا[٢٣٢]، بوەیهیـەکانیش بـەڵێنی هاوکارییـان پێـدا دژی میر (بدر)، هەر لەسەر ئـەو بنەمایـەش (بەزانـدنی سـنووری یـەکتری) کێشەو ململانێی نێوانیان درێژەی کێشا و وەك میراتـی بنەماڵـەیی بـۆ کـوڕو نەوەکانیـشیان بەجێ ماو سەرەنجامیش لەناوچوونی میرنشینی حسنویهی لێکەوتەوە[٢٣٣].

ئەگەر تێبینی سیاسەتی سەلجوقیەکانیش بکەین دەبیـنین هـەمان ڕێـچکەو ڕێبازیـان گرتۆتەبەر، هەندێ جار خۆیـان سـنووری دەسـەڵاتی میرنـشینێکیان فـراوان کـردووە، هەندێ جاریش بەرتەسـکیان کردۆتـەوە و بەخـشیویانە بـە هێزێکـی دی، بەنموونـەی هەڵوێستی سوڵتان (الب ارسلان) دوای گرتنی شاری (آنـي) هەنـدێ لـە ناوچـەکانی ئـەرمینیای خـستە سـەر قەڵـەمڕەوی مـیر (ابـو اسـوار)ی شـەدادی ســاڵی (٤٥٧ك/١٠٦٤ز) کـە ملکەچـی خـۆی بـۆ سـوڵتان ڕاگەیانـدبوو[٢٣٤]، هەرهـەمان

---

[٢٣٠] فرست مرعي، تاريخ الامارات، ص٣٥٣.

[٢٣١] ابن الأثير ، الكامل، ج٧، ص٥٤٦؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦١٧.

[٢٣٢] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٥٤٧؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦١٧.

[٢٣٣] بۆ هۆکارەکانی ڕووخانی میرنشینەکە بڕوانە، حسام الدين نەقشبەندی، شـارەزوور، ل٢٧٣؛ مرعـي، تاريخ الامارات،ص٢١٩.

[٢٣٤] منجم باشي، جامع الدول، ص٢٦٨؛اسماعيل شكر، الشداديون، ص٧٣.

میرنشین سوڵتان (ملکشاه) ساڵی(٤٦٨ك/١٠٧٥ز) سنووری دەسەڵاتی زۆر بچووك کردۆتەوەو دەستی بەسەر ناوچەکانیدا گرت و بە(ساوتکین)ی بەخشی[٢٣٥].

دەرەنجامی زۆرانبازی و ململانێی هێزەکان لە لایەك و تێوەگلانی کورد لە شەڕە ناوخۆیی و دەرەکیەکاندا لە لایەکی ترەوە، کاریگەری خراپی کردە سەر پرۆسەی یەکگرتنی ئیتنیکی و سیاسی و یەکخستن، ئەگەرچی لەو دەمەدا هەوڵی لەم جۆرە زۆر دەگمەن بوون، (شەرەفخان)یش ئاخ و کەسەری خۆی بۆ ئەمە دەربڕیوە، کە کورد ئارەزووی یەکگرتن ناکەن و ئەم هەستە لایان لاوازە[٢٣٦]، بەمەش وەکو شوێنەوارێکی خراپ، کامڵبوونی هەستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەرکەزیەتی دەسەڵاتی سیاسی کوردی هەمیشە سیمایەکی ناوچەیی بە خۆوە بینوە و لەوەشدا ڕەنگی دایەوە، کە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری هەردەم لەدەوری (مەڵبەندە ناوچەییەکان)[٢٣٧] کۆ بوونەتەوە[٢٣٨].

دواشت کە لێرەدا دەمانەوێت ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە، کە سەرباری پۆشینی بەرگی ئایینی بە لەشکرکێشی و سیاسەتەکانیان، هێزە موسڵمانەکان وا مامەڵەیان لەگەڵ کورد نەکردووەو کاریگەری سیاسەتەکەشیان لەوەدا دەرکەوت کە چ کارەساتێکیان بەسەر دەسەڵاتی کوردیدا هێنا، لەبەرئەوە سەرباری جیاوازی ئایینی و ئایینزای

---

[٢٣٥] منجم باشی مێژوونووس دەڵێ: ( سولتان الب ارسلان) ؛بەڵام ئەو سوڵتانە ساڵی (٤٥٦ك) مردووە، ڕاستیەکەی (ملکشاه)ی کوڕیەتی، بڕوانە، جامع الدول، ص٢٧٠.

[٢٣٦] شەرەفنامە،ل٢٥.

[٢٣٧] یەك لەم سیما دیارە نەرێتیانەی مێژووی کوردە، کە دابەشبوونی دەسەڵاتە بەسەر مەڵبەندە ناوچەیی و بنەماڵەکاندا، کەهەمیشە ڕۆڵی خراپی گێڕاوە لە پرۆسەی یەکنەگرتن و هاو هەڵوێست بوون لەسەر کێشە چارەنووسسازەکان، کەتاکو ئەمڕۆش وەك شوێنەوارێکی خراپ بەتایبەت لە باشووری کوردستاندا بوونی هەیە، کە لە دابەشکردنی دەسەڵات و دوو هەرێمی کارگێڕیدا دەردەکەوێت.

[٢٣٨] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خواروو، ل١٤.

هێزەکان، هەموویان لە چوارچێوەی یەك بازنەدا دەخولانەوە، ئەویش سەپاندنی هەژموونی خۆیان و پوکانەوەی دەسەڵاتی کورد بووە لەسەر بنەمای (الحق مع القوة)، کەئەمەش دیدێکی داگیرکەرانەیە کار لە سەر دابەشکردنی کۆمەڵ بۆ ژێرکەوتوو سەرکەوتوو دەکات.

## پێنجەم/ کاردانەوەی کورد:

بەردەوامبوونی هیچ ئمپراتۆریەتێکی مەیدان فراوان و تێکەڵ لە ڕەگەزی جۆراوجۆر و بەرقەراربوو، لە سەرپانتایەکی ئاوا بەرفراوان و پێکهاتوو بەرێگای پرۆسەی فراوانخوازی و مەیدانخوازیانەی بەزۆر زەبروزەنگ ئامێز، کە لە لەناوبردنی دەسەڵاتی کۆمەڵێك هێزو میرنشین و زەوتکردنی سەربەخۆیی زۆر میللەتی لێکەوتبێتەوە بێ بەربەرەکانی و ڕاپەڕین وهەڵگەڕانەوەو کاردانەوە گوزەر ناکات[٢٣٩]، بەسەرنجدان لە مێژووی چوار سەدە فەرمانڕەوایی هێزە داگیرکەرەکانی کوردستانیش چەندین شێوازی لەجۆرە بەرچاو دەکەوێت، کە کورد لەپێناو مانەوەو گێڕانەوەی مافی لێزەوتکراو و بەڕوودا چوونەوەی ڕەوشی خراپی ئابووری و ستەمی کۆمەڵایەتی کاردانەوەی هەبووە، وە هەر واناسراوە کە بەئەستەم سەر بۆ داگیرکاران و دەسەڵاتی بەزۆر سەپێنراو شۆڕ دەکات.

ئەگەر چاوێك بە سەرچاوەو گەشتنامەکاندا بخشێنین زۆر دەقی وامان بەرچاو دەکەوێت، کە ئاماژەیان بۆ ئەو سیفەتەی کورد کردووە، ئەوەتا (مسعر بن مهلهل) لە باسی خەڵکی شارەزووردا نووسیویەتی (خەڵکەکەی یاخین لە سوڵتان ومیرەکانیان لە

---

[٢٣٩] محەمەد ئەمین عەلی عەبدوڵا،شەڕی گوگامیلا، ل١٨٠.

خۆیانن)[٢٤٠]، هەڵکەوتەی جوگرافیا (توپوگرافیا)ی کوردستانیش پشت و پەنای بەهێزی بوون، کە دەست بەسەر داگرتن و داگیرکردنی زۆر دژوارو سەخت بێت، ئەمەش وایکردووە هەمیشە لەم کەژو کێوە سەرکەشانەدا بە سەربەستی بژی[٢٤١]، دیارە هەر ئەو ژینگە سروشتیەشە کاریگەری کردۆتە سەر دەروونی مرۆڤی کورد کە مەیلی سەربەخۆی بکات، ئەمە لە کاتێکدا کە توێژەرانی ئەم بوارە جەختیان لە سەر ئەوە کردۆتەوە، بەرادەیەك هەندێکیان هەڵسوکەوت و سیفەتە کۆمەڵایەتیەکان بەکاریگەری ژینگە دەزانن[٢٤٢].

ئەمە سەرباری ئەوەی لە کوردستاندا سەدان شورەو قەڵای سەخت هەبووە، وە بوونی (شەش)هەزار هۆزو خێڵ کە هەریەکەیان خاوەن پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێز بوون لەسنوری دەسەڵاتیاندا[٢٤٣]، ئەوەی زیاتر ئەو پێگەیەشی بەهێزکردووە پێکهاتەی سیستەمی کۆمەڵایەتی بووە، کە لە سەر بنچینەی ئینتیما و دەمارگیری و پەیوەستبوون بە هۆز و خێڵەوە بنیاتنراوە، لەکاتی جەنگ و تێکشکا یان هەر ڕەوشێکی نائاسایدا(خێڵ) تاکە پەناگەی ئەندامەکانی بووە، بەجۆرێك ئاسایشی تاکی کورد لەسەر ڕادەی بەرگری خێڵ بەندبووە[٢٤٤]، ئەندامانیشی مل کەچی سەرۆك خێڵ و هۆزەکان بوون و بەشداری کارای چالاکیە سەربازەکانیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی خێڵ لەگەڵ هەر هێزێکی دیدا کردووە، ئەمەش هێزێکی خێڵەکی گەورەی لە کوردستاندا

---

[٢٤٠] رسالة الثانية،ص١٨.

[٢٤١] بەدلیسی،شەرەفنامە،ل٢٦-٢٧.

[٢٤٢] هاشم الملاح، مفصل فی الفلسفة التاریخ، ص ص٢٠٧-٢٠٨.

[٢٤٣] ئەولیا چلبی، سیاحتنامە،ل٩١.

[٢٤٤] ڤاسیلیەڤا، خواروی کوردستان،ل٢٠٥.

هێناوەتــە ئــاراوە، کــە لــە چــاخەکانی ناوەراســتدا بــە (نیوملیــۆن) جــەنگاوەر خەملێنراوە[٢٤٥].

بە لە بەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کـە هـەموو رەگـەزەکانی بەرگری و جەنگ لە کوردستاندا ئامادەییان هەبووە، کوردیش بەپێی کـات و شـوێن و پاڵنەری هەمەجۆر سودی لەم رەگەزانە بینیووە، بەمەبەستی رووبەرووبونـەوەی هێـزە داگیرکەرەکان، رادەی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنیشی پەیوەستبووە بەبارودۆخی نـاوخۆ و سیاسەتی هێزە داگیرکەرەکان (کەبەجۆرێك لەجۆرەکان لەتەوەرەکانی دیدا باسـکراوە)، ئەوەی لێرەدا جێی باسە بەکورتی کاردانەوەی کوردە بەرامبەر هێزە داگیرکەرەکان.

سیاسەتی بوەیهیەکان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بەزۆریان بەسەر ناوچەکانی موسـڵ و جزیرەی فوراتیدا، سەرهەڵدانی جوڵانەوەیەکی بـەهێزی بەسـەرکردایەتی (مـیر بـاد)ی کـوردی لێکەوتـەوە، کـە سـەرکردایەتی جوڵانەوەیـەکی سیاسـی و سـەربازی دژ بـە پەرەسەندنی دەسەڵاتی بوەیهی دەست پێکرد، بەسود وەرگرتن لە نارەزایی گشتی خەڵك لە سیاسەتی توندوتیژو مەزهەبگەریان، توانی پێگەی جەماوەری خۆی لـە ناوچـەکەدا بەرفراوان بکات، بەئامانجی نەك تەنها بەرگرتن لە تەشەنەسەندنی دەسەڵاتی سیاسیان بەرەو ناوچە وشـارەکانی دی، بـەڵکو بـۆ رزگـارکردنی بەغـدا و کۆتـایی هێنـان بـە فەرمانرەوایی بوەیهیەکان تێکۆشا، عضد الدولـة (٣٦٧-٣٧٢ك/٩٧٧-٩٨٢ز) هـەر زوو دەرکی بە مـەترسی میر(باد) کرد و مانـەوەی لـە سـەر چارەنووسـی دەوڵەتەکـەی بەمەترسی زانی[٢٤٦]، ئەو میرە کوردەش لە نیاز خراپی بوەیهیەکان بێ ئاگانەبوو، بۆیە بریاری گەرانەوەی لە موسـڵەوە بـەرەو دیـاربکر دا، بەدەسـتگرتن بەسـەر ئـەم شـارەو میافـارقین و چـەند ناوچـەیەکی دی مەیـدانی رووبەروبونـەوەی دژی ئـەو هێـزە

---

[٢٤٥] ئەولیا چەلەبی، سیاحتنامە،ل٩١.

[٢٤٦] ابن الاثیر، الکامل،ج٧،ص٤٠٢ ؛ابن خلدون،العبر،ج٤،ص٣٠٢.

بەرفراوانتر کرد[٢٤٧]، مردنی ئەو میەی بوەیهی چانسی سەرکەوتنی بادی زیاتر کرد، (صمصام الدولة)ش دەرکی بەوە کرد کە بەهێز ناتوانێ بەر لە پەرەسەندنی جولآنەوەکە و خواستەکانی بگرێت، لەبەرئەوە پەنای بردە بەر فێڵ و گفتوگۆ و هەڵخەڵەتاندن، بەلآم هەروەك (فارقی) ئاماژەی کردووە باد نەکەوتە داویەوە[٢٤٨]، دواجاریش ئەو میەی بوەیهی هەرناچار بە لەشکرکێشی بوو، ئەوە بوو بە سەرکردایەتی (ابا القاسم سعد بن محمد) ساڵی (٣٧٣ك/٩٧٨ز) بە سوپایەکی بەهێزەوە بەرەو موسڵ کشاو لە ناوچەیەك بەناوی (باجلی)[٢٤٩] رووبەرووی یەکبونەوە، کە سەرئەنجام بە سەرکەوتنی سوپای باد و دەستبەسەرداگرتنی موسڵ کۆتایی بە شەڕەکە هات[٢٥٠]، بەم شێوەیە باد وەك کەسایەتیەکی سیاسی خێڵەکی لە دانانی بەردی بناغەی دەسەلآتێکی خۆجێیی سەرکەوتووبوو، کە دواتر شێوەی میرنشینی بەخۆوە بینی و جێگرەوەکانی گەشەیان پێدا و بوو بەیەکێك لە بەهێزترین و ناودارترین میرنشینەکانی کورد لە چاخەکانی ناوەڕاستدا.

لە مێژووی هەمان میرنشینداو لە سەردەمی هێزێکی داگیرکەری تردا سەرەڕای پەیوەندی ئاشتی و هاومەزهەبیان، بەلآم نصر الدولة (٤٠١-٤٥٣ك/١٠١٠-١٠٦١ز) سەرهەڵدانی جولآنەوەی (بساسیری) ساڵی(٤٤٨ك /١٠٥٦ز) بەدەرفەت زانی و بڕیاری چوونە پاڵ بزوتنەوەکە و پشتگیریکردنی دا، بەئامانجی ڕزگاربوون بە

---

[٢٤٧] فارقی ،مێژووی میافارقین و ئامەد، و.قادر محەمەد پشدەری و ئاکۆبورهان محەمەد، چاپخانەی منارە,(هەولێر:٢٠٠٧)ل ل١٤-١٥.

[٢٤٨] فارقی، تاریخ الفارقی،ص٥٣؛ فرست مرعی، الامارات الكردية،ص٢٤١.

[٢٤٩] باجلی: گوندێکە دەکەوێتە سەررووباری خابور لە ڕۆژهەلآتی زاخۆ ئێستا باجلای پێ دەوترێت،عبدالرقيب يوسف،الدولة الدوستكية،ج٢،ص٢٢.

[٢٥٠] ابن الاثير،الكامل،ج٧,ص٤٠٢ ؛ ابن خلدون،العبر،ج٤,ص٣٠٢؛ عبدالرقيب يوسف،الدولة الدوستكية،ج٢،ص٢٢.

پاشـکۆیەتی سیاسـی سـەلجوقیەکان، بـانگخوازی فـاتمی (هبـە الله شـیرازی) لـە ژیاننامەکەیدا لەسەر زمانی نصرالدولەوە ئاماژەی بـەوە کـردووە کـە (سـەلجوقیەکان شەڕخوازو ستەمکارن و دەستدرێژی دەکەنە سەر سامان و ژن و منداڵمان و چاویان لە داگیرکردنی وڵاتە)[٢٥١]، هەرچەندە سەرەتای بزوتنەوەکە ویستی بەپاراستنی بێلایـەنی خۆی مەترسیەکانی هەردوولا لەسەر میرنشینەکەی دوورخاتەوە، بەڵام دواتر هەڵوێستی گۆڕا[٢٥٢]، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە سیاسەتی ملکەچکردن و سۆز نوانـدن و دیاریە گران بەهاکانیش بۆ (طغـرل بـك) لـە ڕادەی کاریگـەری مەترسـیەکانی کـەم نەکردۆتەوە بۆ سەر میرنشینەکەی، بۆیە بەبێ گوێ دانە جیاوازی مەزهەبی ئـەو مـیرە کوردە بڕیاری چونەپاڵ بزوتنەوەکەی دا.

دەبێت هەوڵی بێ وچانی شیرازیش لە بەرچاوبگرین کە وەك یارمەتی دەری (بـساسیری) بـە دیـاری و پارەیـەکی زۆرەوە ویـستی مـەیلی مـیرو سـەرۆك هـۆزو خـەڵك بـۆ لای بزوتنەوەکـە ڕاکێـشێت، لـە ڕاکێـشانی ژمارەیـەکی زۆریـش لـە دەوری بزوتنەوەکـە سـەرکەوتوو بـوو[٢٥٣]، بـەڵام ئێمـە پێمـان وانیـە نـصرالدولە بەپاڵنـەری مـادی هەڵخەڵەتابێ و لەپێناو سامان میرنشینەکەی توشی کارەسات کردبێت، چـونکە ئـەو بەدرێژایی پەنجاودوو ساڵ فەرمانڕەوایی واناسراوە کە بە پێچەوانەوە هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابووە هەتا لە توانای دایە بـەپارە مەترسـی لەسـەر میرنـشینەکەی دورخاتـەوە، هەتا لەو کاتەشدا کە سوڵتان (طغرل بك)بەپەیوەندی نێوانی زانی لەگەڵ فاتمیەکانـدا هێرشی هێنایە سەر جزیرە و بەنیازی داگیرکردنی ناوچەکانی تریش بـوو، بـەڵام مـیری ناوبراو بەبڕی (سـەد) هـەزار دینـار ئاشـتەوایی لەگـەڵ کـرد[٢٥٤]، لەلایـەکی دیـش

---

[٢٥١] سيرة شيرازي،ص١٠٩.

[٢٥٢] عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية،ج٢،ص٥١.

[٢٥٣] بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: نیشتمان بەشیر، کوردو سەلجوقیەکان،ل١٤٥.

[٢٥٤] العبري، تاريخ الزمان،ص١٠١؛ زرار صديق،نفوذ فاطمي في البلاد الكرد،ص ص٤٥٨-٤٥٩.

میرنشینی مەڕوانی بەتایبەت لەو قۆناغەدا لەوپەڕی گەشەکردن و دەوڵەمەندی دابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەیلی بەلای هیچ کام لە هێزەکان زادەی بیروباوەڕی سیاسی نەبوون، بەڵکو هەڵوێستێکی سیاسی و دبلوماسی بوو، بۆسوود وەرگرتن لە ناکۆکی نێوانیان لەپێناو رزگاربوون لە ستەمی سەلجوقیەکان لەکاتی ئەگەری سەرکەوتنی بزوتنەوەکە، هەروەك چۆن دوای سەرکەوتنی بساسیری لە شەڕی (سنجار)(٤٤٨ك/١٠٥٦ز)دا هەڵوێستی خۆی یەکلایی کردەوە بەلای بزوتنەوەکەدا[٢٥٥]، وەبەناردنی دیاری و بەپچڕاندنی وتاریش بۆ خەلیفەی عەبباسی لەترسی هەڕەشەکانی سەلجوقی لەکاتی نشوستی بزوتنەوەکە خۆی بپارێزێت، لایەنی کەم ئەو لە هاوسەنگ ڕاگرتنی تەرازوی سیاسی لە ناوچەکە سەرکەوتوو بوو، سەرەڕای زیادبوونی هەژمونی سوڵتان (طغرل بك) بەسەر کاروباری خەلافەتدا و پەرەسەندنی متمانەی سیاسیان بەئەنجامی کارەکانیان، بەتایبەت دوای سەرکەوتن بەسەر بزوتنەوەکە و کوشتنی بساسیری ساڵی (٤٥١ك/١٠٥٩ز)دا[٢٥٦].

میرە کوردەکان بەگوێرەی هەلکەوتنی دەرفەت هەوڵی خۆرزگارکردنیان داوە و هەڕەشەکانی هێزی داگیرکەریش لەمە ساردی نەکردونەتەوە، یاخی بوونی میر (فضلونی دووەم)ی شەدادی ساڵی(٤٦٤ك/١٠٧١ز) لە دەسەڵاتی سوڵتان الب ارسلان لەکاتێك لەپەڕی بەهێزی دابوو، بەڵام مەیلی سەربەخۆی وایکرد کە سەرقاڵی سوڵتانی ناوبراو بەشەڕی ئەرمەنەکان بەهەل زانیو لەقەڵای (فضلون) خۆی پەناگرت و بڕیاری جوڵانەوەکەی دا[٢٥٧]، بۆیە (نضام الملك) بڕیاری هێرشکردنە سەریدا، دوای ماوەیەك گەمارۆدان میری ناوبراو خۆیدا بەدەستەوە سوڵتانیش لەم کارەی چاوی

---

[٢٥٥] العمراني،الفخري،ص١٩١.

[٢٥٦] الراوندي، راحة صدور،ص ص١٧٥-١٧٦؛ صالح رمضان حسن،مقاومة الخلافة العباسية،ص٦٢.

[٢٥٧] ابن الاثير،الكامل،ج٨،ص ص٢٢٩-٢٣٠.

پۆشی[٢٥٨] ، واپێدەچێت هۆكاری سەربازی لە پشت بەخشینیەوە بووبێت، چونكە سەلجوقیەكان پێویستیان بەیارمەتی سەربازی كورد هەبووە دژی هێزە نامسوڵمانەكانی ناوچە كەوشەنەكان، بەتایبەت لەوكاتەدا الب ارسلان لەگەڵ ئەرمەن وئەبخازیەكان لە شەڕدابوو.

سەرۆك هۆزو خێڵەكانیش لەو نێوەندەدا ڕۆڵی خۆیان بینی، چونكە نەیانتوانی دەسەڵاتی لەدەستچووی بۆماوەیان لە بیر بكەن، لە لایەكی دیش لە ژێر سایەی دەسەڵاتی هێزی داگیركەر پشتگوێخستنی مافەكانیانی بینی، لەئەنجامی بەناوەندكردنی دەوڵەت و ئەو شەڕو ململانێ ناوخۆیانەی كە لەسەر خاك و داهاتی كورد بەرێوەچوون، بۆ نموونە مردنی سوڵتان (مسعودی سەلجوقی)یان ساڵی(٥٤٧ك/١١٥٢ز)لە هەمەدان بەهەل زانی و دەستیان بە بوژانەوە كرد، چونكە بەمردنی ئەو سوڵتانە سەردەمی بەهێزی و یەكێتی دەوڵەتی سەلجوقی كۆتایی پێهات، هەروەك (ابن الاثیر) ئاماژەی بۆ كردووە (كامەرانی دەوڵەت مردوو ئاڵایەك نەما لەدەوری كۆببنەوە)[٢٥٩] ، كوردیش سوودی لەو لاوازیە وەرگرت لە پێنا ڕزگاربوون لە ستەمی سوڵتانەكان، هەوڵی زیندووكردنەوەی دەسەڵاتی بنەماڵەیان دا، هەنێكیش سەركەوتوو بوون لە دامەزراندنی بنچینەی میرنشینێك بۆ خۆیان یانیش گێڕانەوەی سەرداریەتی خێڵەكی و قەڵاداریەتی[٢٦٠] ،كە دواتر ئەو نیمچە میرنشینانە بوونە بنەما بۆ سەر هەڵدانی میرنشینەكانی قۆناغەكانی دواتر لە مێژووی كوردا.

چەوساندنەوەی كۆمەڵایەتی و جیاوازی كەلتوری وەك هۆكارێكی دی ڕۆڵی لە كاردانەوەكاندا بینیوە، چونكە دەسەڵاتی بیانی یان هێزی داگیركەر چەندی ڕێكوپێك مامەڵە بكات و باش لەگەڵ ژێردەستەكانیدا بجوڵێتەوە نەدەتوانێت بەوان بێت و خۆی

---

[٢٥٨] ابن الاثیر،الكامل،ج٨،ص٢٣٠.

[٢٥٩] الكامل،ج٩،ص١٨٦.

[٢٦٠] قادر محمد،كوردستان لەنیوەی یەكەمی سەدەی شەشەمی كۆچیدا،ل٥٣.

لەنێو دابونەریتی ئەواندا بتوێنێتەوە و کار بەئاداب و ڕێوڕەسم و گوزەرانی ئەوان بکات، نەدەشتوانێت لە پاشخانی کۆمەلایەتی وفکری کۆمەڵگەی خۆی دابڕێت، هەستکردنی ڕەگەزی ژێردەستەش بەجیاوازی کاریگەری نەرێنی سود بینی ئەو بێگانانە لە دەسەلات لەسەر چارەنوسیان دەبێتە یەك لە هۆکارەکانی ڕاپەڕین و کاردانەوە[٢٦١]، بوەیهییەکان و سەلجوقیەکان بەهەمان تایبەتمەندی لە کوردستان هەلسوکەوتیان کردووە، لەبەرامبەریشدا ڕووبەڕووی کاردانەوەی پێچەوانە بوونەوە، کە لەرێگەی بەرپرسەکانیان لە شارەکان لە هەولی سەپاندنی کەلتوری شەڕو مەزهەبگەرای دا بوون، بەگاڵتەکردن بەدابونەریتی خەلك و چەوساندنەوەیان، ڕەنگە ڕاپەڕینی خەلکی شاری نصیبین سالی (٣٧٢ك/٩٨٢ز) دژی (ابن الراعی) والی شارەکە نموونەیەکی دیار بێت، کە توانرا والی بکوژن و شارەکەش ڕزگاربکەن و دواتر بەڕێوەبردنیان دایە دەست میر بادەوە[٢٦٢].

کاولکاری و مامەلەی نامرۆڤانەی (غوزەکان) بەرامبەر کورد، لەلایەك ئەوەی دەرخست کە ئەوان بەکۆمەلگەی کورد نامۆن و لەڕووی کلتوریشەوە دواکەوتووتر بوون، لەبەرئەوە قبولی پێکەوەژیانی ئاشتیانەیان نەکرد و لەدابونەریتی میواندای تێپەڕیان کرد، لە لایەکی دیش ئەو کردارانەیان میرو سەرۆك هۆزەکانی بەرەو یەك هەلوێستی برد، بۆ پێکهێنانی سوپای هاوبەش و دەستپێکردنی خەباتێکی نەپساوە لە دژیان بۆ دورخستنەوەی مەترسیان لەسەر ژیان و گوزەرانی خەلك هەر لەگەل دەرکەوتنیانەوە لە سالی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) بەگرتنەبەری میکانیزمی جیاواز، میر (وهسوزانی کوڕی مملان)ی ڕەوادی بەپێشوازیکردن و میوانداری لێکردنیان دەرگای تبریزی پایتەختی بەڕوودا کردنەوە، وە بەدروستکردنی پەیوەندی کۆمەلایەتی لە ڕێگای

---

[٢٦١] محەمەد ئەمین عەلی،شەڕی گۆگامیلا،ل١٨٢.

[٢٦٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: فرست مرعی، الامارات الکردیة،ص٢٤٢.

پرۆسەی هاوسەرگیریەوە، بەو ئومێدەی لە کاریگەرییە خراپەکانیان لەسەر ناوچەکە کەم کاتەوە[٢٦٣]، دواتر هەر بەو ئامانجەوە میر و هەسوزان لەگەڵ میر ئەبی هیجای کوڕی رییب الدولەی هذبانی هەڵوێستیان دژی دوژمنی هاوبەش یەکخست، لەبەرئەوە غوزەکان بۆیان دەرکەوت کە مانەوەیان لە ناوچەکەدا مەحاڵە، بۆیە بەشێکیان ساڵی(٤٣٠ك/١٠٣٨ز) ناوچەکەیان بەجێهێشت[٢٦٤]، پۆلێکیش لای وهسوزان مانەوە، بەڵام هەروەك وتمان نەیانتوانی واز لە کەلتوری ڕاوڕوتی و تاڵانکاری بهێنن و جێگای ئومێدی میر نەبوون، لەبەرئەوە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز) خوانێکی بۆ سازکردن و سی کەسی لە سەرۆك و گەورەکان گرتن و خستنیە زیندانەوە و ژمارەیەکیشی لێکوشتن[٢٦٥]، پاشماوەی ئەو پۆلەش ڕوویان لە ناوچەی هەکاری کردو کوشتار و کاولکاری زۆریشیان لەم ناچەیەدا ئەنجامدا، دواتر پیاوانی هەکاری لە چیاکان خۆیان سازدایەوە و توانیان هەزارو پێنجسەد کەس لە غوزەکان بکوژن و حەوت میر و سەد ناوداریشیان لێ بەدیل بگرن[٢٦٦].

سەلجوقیەکانیش هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە بەربوونە گیانی کورد و ماڵ و سامانی خەڵکیان بەتاڵان برد، چونکە ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە دەستیان بەسەر ناوچەیەکدا دەگرت کە لەڕووی ئابوریەوە بەپیت و پڕ سامان بوایە، لەم بارەیەوە بایەخی ناوچەیەکیان بەسەر ناوچەیەکی دیدا دەدا و لەڕووی ئابوریەوە دایاندەدۆشی، دوای دەستگرتنیشیان بەسەر زۆربەی هەرێمەکانی لەجۆرە سوپاسگوزاریان دەردەبڕی و

---

[٢٦٣] ابن الاثير ،الكامل،ج٧،ص٧١٨؛ حسام الدين النقشبندي،اذربيجان،ص١٥٦.

[٢٦٤] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ابن الاثير ،الكامل،ج٧،ص٧١٩؛ حسام الدين النقشبندي،اذربيجان،ص١٥٩؛ حوزنی موكریانی،سەرجەمی بەرهەمی،ب٢،ل٢٣١.

[٢٦٥] ابن الاثير ،الكامل،ج٧،ص٧٢١.

[٢٦٦] ابن الاثير ،الكامل،ج٧،ص٧٢١؛ درويش هروري،بلاد هكاري،ص١٠٢.

بەسەركەوتنیان دادەنا[٢٦٧]، ئەو جۆرە مەترسیانە بوون كە وای لەمیریكی وەك ئەبو فتح كوڕی وەرامی جاوانی كرد بڕیاری چونە پاڵ بزوتنەوەی بساسیری بدات، هەروەك بەئاشكرا ئەوەی دەربڕیوە كە (ئێوە ناچارتان كردین بۆ ئەم كارە، چونكە سوڵتان كەهاتە ئەم وڵاتە هەموو خەڵكیان ئاوارە كرد، سەربازەكان ماڵ وسامانیان تالآنكردین و هیچ پەنایەك نەما هانای بۆ بەرین )[٢٦٨]، وادیارە سەلجوقیەكان هەڵوێستی دوژمنكارانەی خۆیان بەرامبەر كورد بەتایبەتیش گاوانیەكان نەگۆڕیوە، بە بەڵگەی ئەوەی كە ئەبو فتح پەیوەندی بە سەلجوقیەكانەوە كردەوە سالّی(٤٤٩ك/١٠٥٧ز)و وازی لە پشتگیری بزوتنەوەكە هێنا، تادواجار لە شەڕی كوفە سالّی (٤٥١ك/١٠٥٩ز)دا بەشداری كرد، یەكێك بوو لەو سەركردە دیارانەی سوپای بساسیری كە لە لایەن لەشكری سەلجوقیەوە بەدیل گیرا[٢٦٩]، بەلآم دواتر لە لایەن سوڵتانی سەلجوقیەوە بەخشرا، بەهەرحاڵ تاچەند ئەو میرە كوردە سودمەند بوو لە چونە پاڵ بزوتنەوەكە ئەوە بابەتێكی ترە، بەلآم دەرخەری ئەو راستیەیە كە كاردانەوەیەك بوو بەرامبەر بە كارو كردەو خراپەكانی ئەو هێزە داگیركەرە، هوكارێكیش بوو بۆ دەركەوتنی رۆڵ و كاریگەری سیاسی و سەربازی زیاتری لەسەر ئاستی ناوچەكە و دەرك پێكردنی سەلجوقیەكانیش بە لێهاتوویی، دیارە هەر لەبەر ئەوەشبوو كە سوڵتان طغرل بك بۆ سودوەرگرتن لە تواناكانی دەیبەخشێت و بوو بە دۆستێكی هەمیشەیی بۆیان.

هەروەك ئاماژەماندا كورد تەنها بەشەڕی مەیدانی و راپەرین نارەزایی خۆی دەرنەبڕیوە، بەڵكو زۆر جار بەشێوازی شەڕی دەرونی لەگەڵ دوژمندا چۆتە جەنگەوە،

---

[٢٦٧] الراوندي،راحة الصدور،ص١٦٧؛ حسن محمود ،العالم الاسلامي،ص٤٤٣.

[٢٦٨] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:نشتیمان بشیر،كوردو سەلجوقیەكان،ل ١٤٤ئەوانی دی ؛مەهدی عثمان،رۆڵی سەربازی كورد،ل٤٥.

[٢٦٩] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص١٦١.

خۆڕاگری بەرامبەر گەمارۆ سەخت و دژوارەکانی سەر شارو قەڵاکان لەلایەن هێزە داگیرکەرەکانەوە، تا ئەو ڕادەی گەمارۆکان سەخت و دژوار بوون کە خەڵك ئامادەی خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو و مردووەکان بووە، بەڵام ئامادەی خۆبەدەستەوەدان نەبووە، گەمارۆکانی سەر شاری خلاط لەلایەن سوڵتان جلال الدین منکبرتی نموونەیەکی دیارە، بەتایبەت گەمارۆی ساڵی(٦٢٧ك/١٢٢٩ز) کە بێ ئاوی و برسیەتی مەرگی بەشێکی زۆری خەڵکی شارەکەی لێکەوتەوە[٢٧٠]، خۆڕاگری خەڵکی شارەکانی هەولێر و ماردین ومیافارقین... بەرامبەر ئابڵۆقەی هێزی داگیرکەری مەغۆل لەسەریان چەند نموونەیەکی دی بەرخودانی کورد پیشان دەدەن لەبەرامبەر هێزی داگیرکەردا[٢٧١]، ئەمانەش هەموو وەبەرزی دانیشتوان و ئاستی قوربانیدانیان دەردەخات لەپێناو بەسەربەخۆیی مانەوەو نەچوونە ژێرباری داگیرکەرەوە.

کورد وەك ڕەگەزێکی کاریگەر لە چوارچێوەی دەوڵەتی عەبباسی ڕۆڵی لە پارێزگاری خەلیفە و دەوڵەتی عەبباسیدا بینیوە، وەهەمیشە وەك ئایینپەروەرێکی ڕاستگۆ و دڵسۆزێکی بەرامبەر بە خەلیفە ناسراوە، لەبەرئەوە هەر هەڵوێست و دوژمنکاریەك بەرامبەر ئایین لەسەر دەستی هەر هێزێك ئەنجامدرابێت کورد کاردانەوەی هەبووە، لەو نێوەندەدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکەین کە بەشێك لە کاردانەوەکانی کورد سیمایەکی ئایینی یان مەزهەبیان بەخۆوە بینیووە، بۆ نموونە ئەو سیاسەتەی میرەکانی بوەیهی بەرامبەر بە خەلیفە پەیڕەویان کرد ئاژاوەو شەڕو کوشتاری زۆری لێکەوتۆتەوە، ئەوە سەرباری ئەوەی ئەوان وەك هێزێکی شیعە زۆر بایەخیان بە شەڕی فیداکاری و بەپاراستنی ناوچە کەوشەنەکان نەدەدا، بۆنموونە ڕاپەڕینی دانیشتوانی شارەکانی دیاربکرو نصیبین ساڵی (٣٦١ك/٩٧١ز) دژی

---

[٢٧٠] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٤٣٩.

[٢٧١] بڕوانە: الهمذاني،جامع التواريخ،ص ص٣٢١-٣٢٢؛ ابن شداد،أعلاق الخطيرة،ج٣،ق١،ص٥١٠؛علاء محمود خليل،مغول في الموصل،ص٨٠.

دەسەڵاتی بوەیهی و گەیانـدنی پـەیامی نـاڕەزایی خـەڵکی ئـەم ناوچـانە بەخەلیفـە، بەرامبە سیاسەتی خراپ و فەرامۆشکردنی پاراستنی ناوچە سنوریەکان لـە بەرامبـەر دەوڵەتی بیزەنتی[٢٧٢]، خەڵکی بەغدا هاوبەشیان لەپاڵ خەڵکی ناوچە سنوریەکان کرد بۆ ناڕەزایی دەربڕین و هەتا هەڕەشەی هەڵکوتانە سەر کۆشکی خەلافەتیان کرد، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە دەسەڵاتی کردارەکی و پاراستنی سـنورەکانی دەوڵـەت لـە دەسـتی میری بوەیهیدا بووە، بـەڵام لـە بـری بایەخـدان بـەکاروباری پاراسـتن معزالدولـە لـە دەوروبـەری کوفـە خـەریکی ڕاو و کـات بەسـەربردن بـووە[٢٧٣]، دیـارە هەرئەمـەش وایکردووە لای موسڵمانانی سوننە خۆشەویست و پەسەند نـەبن، هـەروەها کـورد وەك یەك لەو ڕەگەزانە لە بەشێك لـەو شـەڕانەی دژی بوەیهیـەکان ئەنجامـدراون بەشـداری کردووە، وەك بەشداری و هاوکاری زۆری دانیشتوانی ناوچەکانی هەکاری و جزیرە لـەپاڵ هێزی حەمدانیەکان دژی هێرشەکانی معزالدولە ساڵی (٣٤٧ك/٩٥٨ز)دا[٢٧٤].

بەشداری کورد لـەکۆی ئـەو چـالاکیە سـەربازیانەی کـە دژی هێزەکـانی مـەغۆل ئەنجامدراون، بەشێکیان پاڵنەری ئایینیان لەپشت بووە، بەمەبەستی بـەرگریکردن لـە خەلافەت و پاراستنی شکۆمەندی خەلیفەی عەبباسـی، لەوانـە هەوڵـەکانی (سـعدی کـوڕی حـسام الـدین عککـە) (٦٥٥-٦٥٦ك/١٢٥٧-١٢٥٨ز)ی مـیری دەرتـەنگ، سەرەتا بۆ بەرگری لە دژی لەشکرکێشی مەغۆل خۆی لە یەکێك لە قەڵا سـەختەکانی ناوچەکە قایمکردو ئامادەی خۆبەدەستەوەدان نەبوو[٢٧٥]، پاشانیش ڕووی کردە بەغدا بۆ بەرگریکردن لە خەلافەت، خەلیفە(المستعصم باالله)ڕێزی زۆری لێنا، وەلەسـەروبەندی

---

[٢٧٢] ابن الاثیر،الکامل،ج٧،ص٢٠٢.

[٢٧٣] ابن الجوزی،المنتظم،ج٧،ص ص٥٩-٦٠؛ ابن الاثیر،الکامل،ج٧،ص٢٠٢.

[٢٧٤] مسکویە، تجارب الامم،ج٥،ص٣٢٣؛ ابن الاثیر،الکامل،ج٧،ص٢٢١؛صلاح هروری،بلاد هکاری،ص ص٧٨-٧٩.

[٢٧٥] الهمذانی،جامع التواریخ،ص٢٧٨.

داگیرکردنی بەغدا لەلایەن لەشکری هۆلاکۆوە لەسەر دەستی ئەو لەشکرە کوژرا[٢٧٦]، کورد دوای روخانی خەلافەتیش ڕۆڵی دیارو گرنگیان لە بەرگریکردن و بەرپەرچدانەوەی بۆ سەر شام و میسر گێڕاوە، لەوانەش لە شەڕی (عين جالوت) ساڵی (٦٥٨ك/١٢٦٠ز) کورد ڕەگەزێکی کاریگەربوون بۆ سەرکەتنی مەمالیك و شکستی لەشکری مەغۆل[٢٧٧]، ئەمەش دڵسۆزی و ڕۆڵی بەتایبەت هۆزە کوردەکان دەردەخات لە بەرگری لە ئایین و بەرپەرەکانیکردن لەدژی داگیرکاران، کە ئەمانە چەند نموونەیەکی کەم بوون لە خەباتێکی دوورو درێژ لە مێژووی کورد دا.

---

[٢٧٦] الهمذاني،جامع التواريخ،ص٢٧٨؛ بۆزانیاری زیاتر لەسەر رۆڵی کورد بروانە: عبدالحليم العزاوي،دور الكرد في مقاومة..،ص١٤٤ومابعدها.

[٢٧٧] موسى الهنسنياني،سنوات الاخيرة ،ص٤٦٩.

## باسی سێیەم/ شوێنەوارە سەربازییەکان:
## یەکەم/ پێکهاتەی هێزی سەربازی و دەربەگی لەشکرسازی (الإقطاع العسکری):

پێکهاتەی هێزی سەربازی و شێوازەکانی شەڕو کۆی چالاکیە سەربازیەکانی هێزە داگیرکەرەکان، بەرئەنجام و شوێنەواری زۆریان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی لە دوای خۆیان لە مێژووی نزیك و دووردا بەجێهێشت، کە دەکرێت لێکۆڵینەوەی تایبەتیان لە بارەوە بکرێت و ڕادەی زەرەرو زیانەکانیان بخرێتە ڕوو، بەتایبەتیش کە خودی ئەو سوپایەی بۆ لەشکرکێشی و هێنانەدی ئامانجە سەربازیەکانیان ئامادەیان کردبوو لە ڕووی قەوارەو ئەرك و پاشکۆکانیەوە، سوپایەکی هەمە چەشنە تەیار کراو و هەمەجۆر پێکهێنراو بوون.

بێگومان دروستکردنی سوپاییەکی بەم شێوەیەش لەسەرینی کۆمەڵێك هۆکارەوە سەری هەڵداوە، کە ڕەنگە چالاکییە زۆرە سەربازییەکانیان و بیری فەرامۆش نەکردنی ڕەگەزەکانی تری سنووری قەڵەمڕەوییان و سوود وەرگرتن لە توانیاکانیان بەشێك بن لەو هۆکارانە، یانیش وەك سیاسەت و تاکتیکی سەربازی بۆ ڕێگرتن لە ئاژاوەی ئەو گەلانەو بەر گرتن لە گەندەڵی و ناچالاکی سوپایەکی تاکڕەگەزی لەبەر چاو گیرابێ[٢٧٨]، هەرچەندە سەباری ئەمەش سوپاکانیان فۆڕمێکی گشتی وەرنەگرتبوو، وە سیمایەکی خێڵەکییان پێوە دیاربوو، چونکە سەرکەوتوو نەبوون لە بەیەکەوە گونجاندیان، وە لە بەیەکچاو سەیر نەکردن و پەیوەندی و مامەڵە بەرامبەر ڕەگەزە بێگانەکان نادادگەر بوون، ئەمەش هێزەکانی تووشی کێشەو هەڵگەڕانەوەی سەربازی

---

[٢٧٨] نظام الملك، سياست نامة، ص١٣٨؛ عبدالعظيم ابو النصر، السلاجقة، ص٣٥٦.

زۆر کردووە[٢٧٩]، لەو نێوەندەدا ڕەنگە سوپای مەغۆلی پێکهاتوو لە هۆزەکانی مەغۆل و تەتەر دامەزراوترین و تۆکمەترین سوپا بووبێت کە لەسەر بنەمای لێهاتوویی سەرکردەکانی دیاری دەکران و پەیوەندییەکی بەهێز ڕێکخستنەکانی بەیەکەوە دەبەستەوە[٢٨٠]، ناوی سەربازەکان بەپێی پلەیان لە تۆماری گشتی تۆمارکرابوو، کە بۆ سەر چوار دەستە دابەشکرابون[٢٨١]، بۆ هەریەکێکیان بەرپرسێك هەبوو، لە سەرووی هەمووشیان سەرکردەی گشتی سوپا هەبوو، کە بە (کلاری بك یان کبیر الامراء) ناسرابوو[٢٨٢]، ڕاهێنان و هونەرەکانی جەنگیش لەکاتی ڕاودا فێر دەکران بەجۆرێك کە لەکاتی ئاشتیدا خەریکی ڕاهێنان و ڕاو و لەکاتی شەڕیشدا جەنگاوەر بوون[٢٨٣].

هەرچی شێوازەکانی شەڕکردنیشە ئەوا ڕۆژهەڵاتیەکان لەسەر ئەوە ڕاهاتبوون، کە هێزەکانیان بۆ سەر سێ بەش ڕاست و چەپ و ناوەڕاست دابەش دەکرد، کە لە سوارەو پیادە پێك دەهاتن و جۆری چەکەکانیشیان بە گوێرەی شوێنەکانی شەڕ دەگۆڕا و بریتی

---

[٢٧٩] سەردەمی بوەیهیەکان زۆرترین حاڵەتی هەڵگەڕانەوەی سەربازی بەخۆوە بینیوە، کە شوێنەواری خراپی لێکەوتەوە بە تایبەت لەلایەن (سەربازە تورکەکان هەتا دەیلەمیەکانیش)، ئەمەش دەرئەنجامی سیاسەتی نەشیاوو جیاوازیکردنی میرانی بوەیهی لەنێو پێکهاتەکانی سوپادا، بۆنموونە بڕوانە: مسکویە، تجارب الامم، ج٥،ص٣٢٤، ص٣٥٣؛ النويري، نهاية الأرب، ج٢٦، ص ص١١٣-١١٤؛ ڤیرنیا، مذكرات الرسالة، دار الساقي،(بيروت:٢٠٠٥م)، ص٩١؛ عبدالجبار ناجي، الدولة العربية،ص ص،٣٣٠- ٣٣٣.

[٢٨٠] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص١٣١؛ فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص٣٥٨؛ فايد حماد، العلاقات السياسية،ص١٣٢.

[٢٨١] تومان سەرکردایەتی لەشکرێکی دەهەزارکەسی دەکرد و منجان هی هەزار کەسی و ون هی سەد کەسی و ئاریان هی دەکەسی،ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٢٣٨؛ عباس العزاوي،تاريخ العراق بين الإحتلالين،ج١،ص١٣١؛ فايد حمادعاشور،العلاقات السياسية،ص٢٣.

[٢٨٢] القلقشندي، صبح الأعشى، ج٤، ص٤٢٤؛ فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص٢٥٧.

[٢٨٣] الجويني، جهانطشاي، ج١، ص٦٣؛ القلقشندي، صبح الأعشى، ج٤، ص٤٢٥.

بوون لە ڕم و شمشێر و حەربەو تیرو کەوان و زرێ و...[٢٨٤] مەنجەنیقیش دیارترین ئامێری ئابلۆقەدانیان بوو، لەگەڵ بەکارهێنانی (نەوت و سوتەمەنی) و ئەسپ لە شەڕدا[٢٨٥]، خستنەڕووی ئەو بارە گشتیە ئاستی ئەو شوێنەوارە خراپانە دەردەخات، کە لەسەر پێکهاتەی هێزی سەربازی مینشینەکان بەتایبەت و کورد بەگشتی بەجێیان هێشتووە.

کورد کەوتە ژێر کاریگەری بەشێك لەو دیاردە خراپە سەربازیانەی، کە لە نێو هێزەکاندا بوو بەباو، لەوانەش پەرەسەندنی دەرەبەگی لەشکرسازی[٢٨٦]، نابوتبوونی خەزێنەی دەوڵەت لە پێدانی موچەو داواکاریە ڕوو لەزیادیەکانی هێزی سەربازی و کەم توانایی دەوڵەت لە پڕکردنەوەی پێویستیەکان هۆکاری گرنگی سەرهەڵدانیان بوون[٢٨٧]، لەسەردەمی بوەیهیەکاندا بەشێوەیەکی وا بەرچاو زیادیان کرد کە پێشتر وێنەی نەبوو، بەتایبەت معز الدولە زیادە ڕۆیی کرد لە بەخشینی (اقطاع)

---

[٢٨٤] بۆ زانیاری لەسەر جۆری چەك و شێوازەکانی شەڕ لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بڕوانە: موحسین موحەممەد حسین، سوپای ئەیوبیان لەسەردەمی سەلاحەددیندا، چاپخانەی نووسەر،(سلیمانی:٢٠٠٧ز)،ل ٢٨٥.

[٢٨٥] ادم متز،الحضارة الإسلامية،ج١،ص٦٤؛عبدالجبار ناجي،الدولة العربية،ص ص٣٣٦ - ٣٣٧؛فايد حماد،العلاقات السياسية، ص٣٤.

[٢٨٦] بەو زەویانە دەوترا کەلەلایەن دەوڵەتەوە دەبەخشران بە هێزی سەربازی و مێژووی سەرهەڵدانیشی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلیفە (عمری کوڕی خطاب) (خوالێی ڕازی بێت)، دوای ڕزگارکردنی ڕەشە خاکی عێراق، چەند جۆرێکیشی هەبووە (الاستغلال وتمليك ومدنية وخاصة والخليفة وعسكري) بڕوانە: الماوردي، الأحكام السلطانية،ص٤٩٩؛ القلقشندي، صبح الأعشى، ج١٣، ص١٢٠؛ ابراهيم علي طرخان، النظم الأقطاعية في الشرق الأوسط في العصور الوسطى، دار الكاتب العربي، (القاهرة:١٩٦٨م)؛ عبدالعزيز الدوري، تاريخ العراق الاقتصادي،ص٢٨.

[٢٨٧] النويري،نهاية الأرب،ج٢٦،ص١٠٧؛ ابراهيم علي طرخان،النظم الاقطاعية،ص ص٢١- ٢٣؛ عبدالعزيز الدوري،تاريخ العراق الاقتصادي، ص٣٠.

بەسەرکردەو سەربازەکانی[٢٨٨]، سەلجوقیەکان زیاتر لەئەوانیش بایەخیان پێداو بوو بە بەشێك لە سیاسەتی نظام الملك وەك ڕێکخەرێکی سەرەکی کاروبارەکانی سەربازی[٢٨٩]، جیاوازیش لە دابەشکردنی ئەو (اقطاع)انەدا هێزی سەربازی ناچار بەهەڵگەڕانەوە دژی میرو سوڵتانەکان کردو وڵاتیشی بەرەو ئاشوب و پاشاگەردانی برد[٢٩٠].

کەمبوونەوەی گیانی بەرگری و فەرامۆشکردنی شەڕی میللەتانی ناموسڵمان لە بەرئەنجامە ترسناکەکانی ئەم بارودۆخە بوون، تاوای لێهاتبوو بەبێ پێدانی پارەو مافی زیاتر سەربازەکان هەنگاوێکیان نەدەناو بە دوورکەوتنەوەی هەر فەرسەخێك (نزیکەی ٦کم) داوای ماڵ و سامانی زیاتریان دەکرد[٢٩١].

دەرەبەگی لەشکرسازی وەك نەریتێك بەهەمان شێوەو بە چوونیەکی بەمیرات گوازرایەوە بۆ ئەتابکیەکان و دەوڵەتی ئەیوبی و مەمالیك[٢٩٢]، هەر وەك وێنەیەکی لەبەرگیراوەی یەکتری، میرنشینە کوردیەکانیش لە چوارچێوەی ئەو یاسایە بەدەر نەبوون و وەك کاریگەرییەکی خراپ (دەرەبەگی لەشکرسازی) لەناو ئەوانیشدا بڵاو بۆوە، بەڵام ئەوەی لەم بارەیەوە لە مێژووی میرنشینەکاندا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە میرە کوردیەکان هەم (اقطاع)یان بە خشیوە، هەمیش پێیان بەخشراوە، بە لەبەرچاوگرتنی بەشداری سیاسی و لە بەرژەوەندی لایەنێکدا دژی لایەنێکی دی ئەم (اقطاع)ە لەبری

---

[٢٨٨] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٢٨٣؛ محمد حسين الزبيدي، العراق في العهد البويهي، ص١٢١؛ فهمي سعد، العامة في بغداد، ص٧.

[٢٨٩] بڕوانە: نظام الملك، سياست نامة، ص١٣٧؛ الإصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٢٢٠؛ عبدالعظيم ابوالنصر، السلاجقة، ص٢٧٦.

[٢٩٠] عبدالعظيم ابوالنصر، السلاجقة، ص٣٨٢؛ فاضل الخالدي، الحياة السياسية، ص٢٧٦.

[٢٩١] الصولي، اخبار الراضي، ص٤١؛ تقي الدين عارف الدوري، عصر الامرة امراء، ص٤٥.

[٢٩٢] ابراهيم علي طرخان، النظم الاقطاعية، ص٣٠.

کرێ یان موچە دەبەخشرا[٢٩٣]، بۆنموونە هانا بردنی میر بدر بۆ فخرالملك ی سەرکردەی بوەیهی لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠٠٩ز) کە بەسوپاکەیەوە بەشداری لەشەڕی نێوان میر بدر دژی هلالی کوڕیدا کرد[٢٩٤]، ئەوە بوو لەهەمبەر ئەو بەشداریکردنەی ناوچەکانی شارەرزووری بە سەرکردەی ناوبراو بەخشی و بۆ ماوەیەك لەژێر دەستیدا مایەوە و لەرێگەی نوێنەرەکانیەوە بەڕێوە دەبرا[٢٩٥]، بەشداریکردنی میر شاور ئەبوئەسواری شەدادی لەپاڵ سوپای سوڵتان الب ارسلانی سەلجوقیدا لە هەڵمەتەکانی بۆ سەر ئەرمینیاو شاری(آنـي)، دوای دەست بەسەرداگرتنی شارەکەی بەو میرە کوردە بەخشی[٢٩٦]، پێشتریش بوەیهیەکان ڕازی بوون بە برینەوەی ناوچەکانی جزیرە و طورعابدین بۆ میر بادی کوردی[٢٩٧]، لەڕاستیدا سەرهەڵدانی ئەو جۆرە (إقطاع)انە کاریگەری زۆری کردۆتە سەر بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردستان کە لە بەشەکانی داهاتوودا لێی دەدوێین.

## دووەم/ هێزی بەکرێگیراو و هەڵگەڕانەوەی سەربازی:

کاریگەرییەکی دی لەشکرکێشیەکان لەسەر میرنشینەکان برەوسەندنی هێزی بەکرێگیراو بوو (مرتزقە)[٢٩٨]، کە شوێنەوارێکی خراپی لە سەر چارەنووسی

---

[٢٩٣] موحسن موحەممەد حسین، سوپای ئەیوبیان لەسەردەمی دەسەڵاتی سەلاحەددیندا، ل ل١٤١- ١٤٢.

[٢٩٤] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٥٦٤؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦١٨.

[٢٩٥] حسام الدين نەقشبەندی، شارەزوور،ل ل٢٦٨-٢٦٩؛ قادر محمد حسن، الامارات الكردية، ص١٦٢.

[٢٩٦] منجم باشي، جامع الدول، ص٢٦٧؛ ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص١٩٤؛ اسماعيل شكر، الامارة الشدادية، ص٧٩.

[٢٩٧] ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٣٠٣.

[٢٩٨] وەك ئەریتێکی باوی ناو هێزی سەربازی (بوەیهی و سەلجوقی و میرنشینەکانی تر) لە پێناو کۆکردنەوەی هێزی سەربازی زیاتر و زۆری شەڕو شۆڕو لەدەستچوونی سەربازی زۆر، بۆ پڕکردنەوەی

میرنشینەکان جێهێشت و بەرەو لاوازی و ڕووخانی بردن، چونکە کاتێك پارە بوو بەبنەماو پاڵنەر بۆ بەشداریکردنی لە هێزێکی سەربازیدا، هیچ مانایەك بۆ دڵسۆزی و ئاینپەروەری و دەمارگیری نامێنێ، هێزی بەکرێگیراو لەکوێ دەستکەوتی زیاتری پێبدرێت شەڕ بۆ ئەولایەنە دەکات[٢٩٩]، نەمانی دەمارگیری و کزبوونی گیانی بەرگری و پابەندیی بۆ میرنشین لەلایەك[٣٠٠]، ڕۆچوونی دەسەڵاتداران لەناو نازو نیعمەت و هەوەس بازی و بێ ئاگایی لەخەڵك، وایان لێ دەکات بەناچاری و بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی هێزی سەربازییان، پەنابەرنە بەر سەربازی بەکرێگیراو، ئەمانەش لەبەر نەبوونی دەمارگیرییان ناتوانن خۆیان لەبەردەم شەپۆلێکی نوێی تردا بگرن کە بارگاوییە بەدەمارگیرییەکی سەخت[٣٠١]، لەکاتێکدا توانای سەربازی مەرجی مانەوەی دەوڵەتە بە بەهێزی وە ڕادەی بەهێزیی دەوڵەت لەسەر توانست و بەهێزیی سوپا وەستاوە[٣٠٢].

لەڕاستیدا (دەمارگیری- هێزی سەربازی) و (پارەو پوڵ-هێزی ئابووری) وەك دوو بنەمای سەرەکی ڕادەی چەندیەتی چۆنیەتی دەسەڵاتی (دەوڵەت یان میر)یان دیاری کردووە، هەتا زۆرجار هێزی سەربازی جۆرەکانی دی هێزی بەرهەم دەهێنا[٣٠٣]، ناچوونیەکیشی لاوازی و شکستی بوو، ئەمەش بەرامبەر بەهێزی میرنشینە کوردیەکان

---

شوێنیان و لەبەر هۆکاری ئابووری هێزەکان پەنایان بۆ سەربازی بەکرێگیراو دەبردو لەبەرامبەر بەشدارییان لەشەڕدا پارە یان زێڕیان پێدەدرا، بڕوانە: مەهدی عوسمان، ڕۆڵی سەربازی کورد، ل٥٣.

[٢٩٩] عبدالجبار ناجي، الإمارة المزيدية، دار الطباعة الحديثة، (البصرة:١٩٧٠م)، ص١٨٢.

[٣٠٠] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خواروو،ل٧.

[٣٠١] ابن خلدون، مقدمة، ص١٥٩؛ عەلی وەردی، لۆژیکی ئیبن خەلدون، چاپخانەی گەنج، (سلیمانی:٢٠٠٦ز)ل١٢٣.

[٣٠٢] كريم جبر الحسن، عملية النهوض الحضاري، ص١١٢.

[٣٠٣] كريم جبر الحسن، عملية النهوض الحضاري، ص١١٢؛حیدر لەشکری، دەسەڵاتی میری کورد، ل٢٦.

ڕاستەو شکستەکانیان لە شەڕەکاندا ئەمەی سەلماند، چونکە مادام شەڕ بریتی بێ لە ململانێی چەکدارانە لە نێوان دەوڵەتاندا (دووهێز) بەئامانجی سەپاندنی ئیرادەی هەندێك بەسەر هەندێکی تردا[٣٠٤]، ئەوا هەمیشە ڕێژەی بەهرەمەند بوون لە ئامرازەکان و ڕەگەزەکانی شەڕو ڕادەی کارایی و پێشکەوتوویی ئاستی شارەزایی بەکارهێنانی تاکتیکی گونجاو کاریگەری زۆر گەورەی لەسەر ئاراستەی ئایندەی شەڕ دەبێ[٣٠٥]، کەمیرەکان نەیانتوانی ئەم ئەرکە وەکو خۆی جێبەجێ بکەن، بەتایبەت لەبەیەکەوە گونجاندنی ڕەگەزەکان، ئەمەش شوێنەواری خراپی لێکەوتەوە، ڕەنگە هەڵگەڕانەوەی سەربازی لە دیارترینی ئەو شوێنەوارانە بووبێت، ئەوەی ئاشکراشە میرنشینەکانی حسنویهی و عنازی سەرباری ئەندامانی هێزی بەرزیکانی و شاهنجانی پشتیان بەهێزی بەکرێگیراویش بەستووە لە پێکهێنانی سوپاو شەڕەکانیاندا[٣٠٦]، بۆیە هاوشێوەی سوپای هێزە داگیرکەرەکان توشی هەڵگەڕانەوەی سەربازی بوونەوە، بۆ نموونە هەڵگەڕانەوەی سوپای میرنشینی حسنویهی لە میر بدر لەوکاتەدا کە بەرامبەر سوپای هلالی کوڕی لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠٠٩ز)دا لە شەڕدا و لە کاتێکی چارەنووس سازدا بوو، خاسیەتی هێزی بەکرێگیراو وایە، کە لە کاتی چارەنووس سازدا بەپارە دەخەڵەتێت و سەنگەر دەگۆڕێت، بەتایبەتیش هلال سەرکەوتوو بوو لە کڕینیان بەپارەی زیاتر، ئەمەش بدری تووشی شکست کرد[٣٠٧]، هەرچەندە ئەمە بە یەکێك لە کارە خراپەکانی

---

[٣٠٤] وهبة الزحیلي، آثار الحرب، ص٣٥؛ محمد امین علی عبدالله، شەڕی گۆگامیلا،ل٢١٦.

[٣٠٥] محمد أمین علی، شەڕی گۆگامیلا، ل٢١٦.

[٣٠٦] بڕوانە: ابـن الجـوزي،المنتظم،ج٨،ص١٣٠؛ ابـن الأثیر،الكامـل،ج٨, ص ص٥٦-٥٧؛ نەقشبەندی، شارەزوور، ل٤٠٨.

[٣٠٧] ابن الأثیر، الكامل، ج٧، ص٥٩٦؛محمد جمیل ڕۆژبیانی، مێژووی حسنویهی عەیاری، ل ل٩٠- ٩١.

هلال هەژمار کراوه[٣٠٨]، بەڵام ئەوە دەردەخات کە زۆری و کەمی هێزی سەربازی تا ڕادەیەکی زۆر بەو بڕە پارەیە پەیوەست بووە کە وەك کرێ بە جەنگاوەران دراوه[٣٠٩].

هەڵگەڕانەوەی عەنازیەکان لە سعدی کوری ابی الشوك و خۆ دانە پاڵ مهلهلی مامی ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٥ز) نموونەیەکی دی ئەم بابەتەیە[٣١٠]، وە هەڵگەڕانەوەی کوردەکانی لوڕ لە میر سرخاب ی کوڕی محمدی عنازی ساڵی(٤٣٩ك/١٠٤٧ز) کە لە شەڕی دژی ابراهیم ینال پشتی پێبەستبوون، بەڵام لێی هەڵگەڕانەوەو سرخابیشیان بە دەست دوژمنەکەیەوە دا، ئەویش نا مرۆڤانە مامەڵەی لەگەڵدا کرد و یەکێك لە چاوەکانی هەڵکۆڵی[٣١١]، هەرچەندە ئەمە کێشەی بنەماڵەیی و خێڵەکییە، بەڵام دەشێ سیاسەتی هێزە داگیرکەرەکانیش کاریگەری خراپی کردبێتە سەر خۆشکردنی ئاگری ئەم جۆرە شەڕانە، ڕەنگە هەڵگەڕانەوەکەی (شیروە بن مم)[٣١٢]بەهاوکاری هێزی بەکرێگیراو لە مەترسیدارترین هەڵگەڕانەوەکان بووبێت بۆ سەر چارەنووسی میرنشینی مەڕوانی، کە بە غافڵ کوژ کردنی میر ممهدالدوله (٣٨٧-٤٠١ك/٩٩٧- ١٠١٠ز) و دەست بەسەرداگرتنی شاری میافارقینی پایەتەختی میرنشینەکەی لێکەوتەوه[٣١٣].

---

[٣٠٨] ابن حمدون، التذكرة الحمدونية، دار صادر، (بيروت:١٩٩٦م)، ج٦، ص٣٦٨.

[٣٠٩] عبدالجبار ناجي، الإمارة المزيدية، ص١٨٧.

[٣١٠] ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص١٣٠؛ ابن الأثير،الكامل،ج٨، ص٥٤؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦٢٢.

[٣١١] ابن الجوزي، المنتظم،ج٨، ص ص١٣٠-١٣١؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١١، ص ١٩٩.

[٣١٢] حاجب و دەم ڕاست و باوەڕپێکراوی میر ممهدالدوله بوو، بەڵام ئەو قین لەدڵ بوو لە میرو پێشتریش لە ڕێگەی ژەهر کردنە خوارن ویستی میر بکوژێت، لەو هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو، تا دواجار لە(هتاخ) کە پێگەیەکی سەختی ناوچەی دیاریکرە ساڵی (٤٠١ك/١٠١٠ز) میری غافڵ کوژ کرد، الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص٨٨-٩٢؛ فرست مرعي، الامارات الكردية، ص٢٧٩.

[٣١٣] ايليا برشينايا، تاريخ ايليا برشينايا، ص٢٠٤؛ الفارقی، تاريخ الفارقي، ص ص٩٠-٩٢؛ ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١، ص٣٣٨؛ عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ج٢، ص١٢٧.

کوردیش بەهەمان شێوەی ڕەگەزەکانی دی، وەك بە کرێگیراو لە سوپای هێزە جۆربەجۆرەکان بەشداری کردووە، دەستبردنی کورد بۆ ئەم پیشەیە شرۆڤەکاری زۆری بۆ کراوە، بەشێکیان بۆ ئەو بارودۆخە ڕسکاوەی کە وەك بەرئەنجامی لەشکرکێشیەکان کەوتەوە دەیگێڕنەوە، کە بەهۆی بەتالانبردنی سامان و بەرز بوونەوەی ڕێژەی باجەکان و وێرانبوونی سەرچاوەکانی داهات و سەختی بەدەستخستنی تێشوی ژیان کوردی خستۆتە ژێر باری کرێگرتەیی، سەرچاوەیەك کە هانایان بۆ بردووە بۆ پەیداکردنی ڕۆزی چەکەکانیان بووە، هەروەك (ابن خلدون) دەڵێ: ((ڕۆزییان لەژێر سێبەری نێزەکانیاندا بووە))[٣١٤]، ڕەنگە مەبەستیشی پەنابردن بووبێ بۆ ڕێگری (قطاع الطرق) و کاروان تالانکردن، کە دیاردەیەکی باوی ناو نەتەوەکان بەگشتی و لەناویشیاندا کورد بووە[٣١٥]، شەڕوجەنگیش خاسیەتی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانەیەو پەیداکردنی ڕۆزیش لەم ڕێگەیە نیشانەی پیاوەتی و ئازایەتییە، بەپێچەوانەوە نەنگییە پیاو لەسەرهێزی بازوو نارەقەی ناوچەوانی بژیەت[٣١٦]، هەر لەو ڕێگەیەشەوە هەندێ جار پشتگیری جەماوەری و دەسەڵاتی سیاسیشیان دەست کەوتووە، بۆ نموونە وەك میر باد[٣١٧].

هەر لەژێر کاریگەری ئەو بارودۆخەی کە بەدرێژایی مێژوو بەسەر کورد دا هاتووە، خۆشەویستییەك بۆ جەنگ لە دەروونیدا درووست بووە، ئەمەش وای لێکردووە کە

---

[٣١٤] مقدمة، ص٢٩٥.

[٣١٥] لە سەرچاوەکاندا بەزیادەڕۆیی باسی ئەم دیاردەیە لەناو کورددا کراوە، بەڵکو ئەمە سیفەتێکی گشتی نەبووە، بەڵکو تایبەت بووە بە چەند هۆزو ناوچەیەکی دیاریکراو، بڕوانە: ابن حمدون، التذكرة الحمدونية، ج٩،ص٤١٩؛ حيدر لشكري، الكرد في المعرفة، ص١١٧.

[٣١٦] بدلیسی، شەرەفنامە، ل٢٢؛ عەلی وەردی، لۆژیکی ئیبن خەلدون، ل٣٩١.

[٣١٧] ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٣٠٢؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة،ج٤،ص١٤٥؛محمد امين زكي،تاريخ الدول والامارات،ص١١٤.

بەشداریێت لە سوپای زۆربەی هێزەکاندا و خزمەتی سەربازییان پێشکەش بکات[٣١٨]، ڕادەی سوود وەرگرتن لە هێزە مرۆییەکەشی لەلایەن هێزەکانەوە ئاستی جیاوازی بە خۆوە بینیوە، هەندێ جار لەسەر ئاستی میرنشین بەشداری چالاکیە سەربازیەکانی کردووە، وەك بەشداری میر حسنویهی لەپاڵ رکن الدولەی بوەیهیدا دژی سامانیەکان[٣١٩]، هەندێ جاریش لەسەر ئاستی هۆز، وەك بەشداری هۆزی (گاوانی-جاوانی) لەچالاکیە سەربازیەکانی بوەیهیەکاندا[٣٢٠]، وە بەشداری هەمان هۆز لەگەڵ هۆزی شاهنجانی لە سوپای مەزیدی دا[٣٢١]، وە یان لەسەر ئاستی تاك وەك بەکرێگیراو، وەك بەشداری کوردەکان لە پاڵ ڕەگەزەکانی دیدا لە سوپای طغرل بکدا ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) لە کاتی دەستبەسەرداگرتنی بەغدا دا[٣٢٢]، وە ڕۆڵی جەنگاوەرانی کورد لە بزوتنەوەی بساسیری دا، کە پارەیەکی زۆری بۆ ئەو مەبەستە خەرجکردو ژمارەیەکی زۆریشی لەدەوری کۆبوونەوە[٣٢٣]، هەر لەم بارەیەوە دەبێت ڕۆڵی جەنگاوەرانی کورد وەکو خۆبەخشیش لە هەندێ لە شەڕەکاندا لە بەرچاو بگیرێت، بە تایبەت ئەو شەڕانەی کە دژی بێباوەڕان ئەنجامدراون و وەك خۆبەختکار بەشدارییان کردووە، ڕەنگە شەڕی (ملازگرد) دژی بیزەنتیەکان نموونەیەکی دیار بێت، کە دەهەزار

---

[٣١٨] محمد صالح القزاز، الحياة السياسية، ص٢٠٦.

[٣١٩] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٢٩٢؛لازاریف، تاریخ کوردستان، ص٥٢؛ڕۆژ بیانی، مێژووی حسنویهی، ل٥٢.

[٣٢٠] آواز محمد علي عبدالكريم، الكرد الجاوانيون، ص٦٣.

[٣٢١] ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٥٩٧؛ عبدالجبار ناجي، الإمارة المزيدية، ص١٧٩، ص١٨٣.

[٣٢٢] ابن العديم، بغية الطلب، ص٢.

[٣٢٣] المؤيد فى الدين،ديوان مؤيد فى الدين الداعى الدعاة،دار الكاتب المصرى،(القاهرة:١٩٤٩)،ص٤٢؛ المقريزي،اتعاظ الحنفا،ج٢، ص٢٣٢.

کەس لە دانیشتوانی کورد لە پاڵ سوپای سوڵتان الب ارسلاندا بەشداری شەڕەکەیان کردووە[324].

ئەوەی لەم بارەیەشەوە تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە کورد لەسەر یەك پەت یاری نەکردووەو بەگوێرەی بەرژەوەندی بنەماڵەو میری فەرمانڕەواو (میزاجی میر) سەنگەر گۆڕکێی کردووە، بەمەش متمانەی لای هێزەکان کەم بۆتەوە، خۆشی پێی سودمەند نەبووە، تواناکانی بۆ ئەوە تەرخان نەکردووە کە سود لەلایەنێك وەربگرێت و ئامانجەکانی بێنێتە دی، بەواتایەکی دی هەلی ڕەخساوی ناکۆکی نێوان لایەنە ناکۆکەکانی نەقۆزتەوە، بۆ وێنە میر ابوالشوك کوردی (٤٠١-٤٣٧ك/١٠١٠-١٠٤٥ز) میری عەنازی لەشەڕی نێوان جلال الدولەی بوەیهی و ابوکالیجاری برازایدا، سەرەتا هاوکاری یەکەمیان و پاشانیش پاڵی دایە پاڵ ابوکالیجار[325]، لە مێژووی هەمان میرنشینداو میر سورخاب کوری بدر (٤٦٧-٥٠٠ك/١٠٧٤-١١٠٦ز) لە شەڕی نێوان سوڵتان برکیاروق و محمدی سەلجوقیدا سەرەتا لەپاڵ سوپای سوڵتان محمد دا بەشداری شەڕی کرد، ساڵی (٤٩٣ك/١٠٩٩ز) هەڵوێستی خۆی گۆڕی و پاڵی دایە پاڵ برکیاروق و سەرکردایەتی لەشکرێکی دژی براکەی بۆ بەدەستەوە گرت[326].

ئەگەرچی توێژەرێك پاساوی ئەم جۆرە هەڵوێستانەی بۆ باوی ئەو نەریتە لەو سەردەمدا گێڕاوەتەوە[327]، بەڵام لە ڕاستیدا لاوازی هۆشی سەربازی و نەشارەزایی لە هونەری شەڕو ڕاراییی و لێکنەدانەوەی بارودۆخەکان بەشێوەیەکی لۆژیکیانە بۆ سوودوەرگرتن لە ڕەوشەکە هۆکاری ئەم جۆرە هەڵوێستانەن، چونکە ئەوەی لەم بارەیەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە ئەوەیە، کە سەرکردە بتوانێت ئەنجامی شەڕو ململانێکان بە

---

(324) الدواداري، كنز الدرر، ص393؛ نیشتمان بەشیر، کوردو سەلجوقیەکان، ل238.

(325) ابن الأثير، الكامل، ج7، ص713؛مەهدی عوسمان، ڕۆڵی سەربازی کورد، ل156.

(326) ابن الأثير، الكامل، ج8، ص429، ص434؛ فرست مرعي، الامارات الكردية، ص418.

(327) مەهدی عوسمان، ڕۆڵی سەربازی کورد، ل172.

سوودی خۆی کۆتایی پێ بهێنێت، شەڕیش ئەوەندەی هونەر (تاکتیك) ڕۆڵی تێدا دەبینێت ئەوەندە کەرەستەکانی شەڕ نابینین.

هەڵگەڕانەوەو کاری ئاژاوەگێڕی هێزی سەربازی شوێنەوارێکی دی لەشکرکێشیەکانە، کە لە دەرئەنجامی کەمی موچەی مانگانەو داواکاریە زۆرەکانی هێزی سەربازی لە خەلیفەو میرو سوڵتانەکان سەریان هەڵدا[٣٢٨]، ئەم دیاردەیە هەروەك پێشتر باسکرا خۆی خزاندە ناو هێزی سەربازی میرنشینەکانیش، بەلاّم ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە کورد کەمترین ڕۆڵی ئاژاوەگێڕی گێڕاوە لە دژی خەلیفەو بەتایبەتیش لە بەغدا لە کاتێکدا وەك پایتەختی خەلافەتی عەبباسی زۆرترین کاری ئاژاوەگێڕی لەسەر دەستی سەربازە دەیلەم و تورکەکان لەوێدا ڕوویداوە[٣٢٩]، توێژەرێك کەمی ڕێژەی کورد لە بەغدا بەهۆکاری بەشداری نەکردنی لە ڕووداوەکان دەزانێت[٣٣٠]، بەلاّم ئەم کەم بەشداریکردنە دەریدەخات، کە کورد ڕەگەزێکی ترسناك نەبووە بۆ سەر خەلافەت بەگشتی و ڕێزی لێناوەو بە سەرچاوەی دەسەلاّتی موسڵمانانی زانیوە، لە لایەکی دیش ئەو کوردانەی کە لە بەغدا بوون زیاتر مەبەستی زانستی و خەریك بوون بە کاروباری خوێندن کۆی کردبوونەوە، نەك کاری سەربازی، هەرچەندە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، کە کورد کاری ئاژاوە گێڕی نەکردووە، بەڵکو هەندێ جار لە پاڵ ڕەگەزەکانی دیدا لە کاری لەم جۆرەدا بەشداری کردووە، بۆ نموونە لەساڵی (٤٤٦ك/١٠٥٤ز) ژمارەیەك لە سەربازە کوردەکان بەشدارییان لەو جوڵانەوەیەدا کرد کە تورکەکان لە بەغدا بەهۆی دواکەوتنی موچەکانیان بەرپایان کرد، کە ئابلۆقەی

---

[٣٢٨] محمود عرفة محمود،الاحوال السياسية والدينية في بلاد العراق،حوليات كلية آداب،جامعة الكويت،الحولية العاشرة،١٩٨٩م،ص٣٢.

[٣٢٩] بۆ زانیاری بگەڕێوە، فهمی سعد، العامة في بغداد؛ بدري محمد فهد، العامة ببغداد في القرن (٥هـ)، ص ص٢٨٥-٣١٥.

[٣٣٠] محمد صالح القزاز، الحياة السياسية، ص٢٠٧.

خانەی خەلافەت (دار الخلافة)یاندا وتالانکاری و ترس و دڵەڕاوکێی زۆری بۆ سەر دانیشتوان لێکەوتەوە[٣٣١].

## سێیەم/ کاریگەری ململانێی ناوخۆیی هێزە بیانیەکان:

سەرباری ئەو شوێنەوارانەی کە باس کران، زۆر جار کورد لە کاریگەری خراپی ئەو ڕووداوە سەربازیانەش بێبەش نەبووە، کە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی ڕوویانداوە، یان کاریگەری و شوێنەواری ئەو ململانێ و زۆرانبازیە ناوخۆییانەی کە لەنێوان خودی هێزە دەرەکیەکان خۆیاندا ڕوویانداوە، ڕەنگە شەڕی ملازگرد ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) یەکێك بێت لەو شەڕە گرنگانەی پەیوەندی مێژوویی نێوان جیهانی ئیسلامی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی[٣٣٢]، بەڵام ئەنجامەکانی بۆ کورد پێچەوانە بوون، چونکە زیادبوون و بەهێزبوونی پێگەی سەربازی و جەماوەری سەلجوقیەکان لە ناوچەکەدا وەك دەرئەنجامێکی ئەو شەڕە[٣٣٣]، وای لە سوڵتان الب ارسلان کرد، کە چاکەی بەشداری گیانی و لوجستی کورد لەبەرچاو نەگرێ و لەیەکەم کاردانەوەیدا چەندین ناوچەی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی مەڕوانی وەك (اقطاع) بەسەرکردە سەربازیە تورکەکان ببەخشێ[٣٣٤]، بۆ نموونە خلاط ی دایە یەك لە سەرکردەکانی خۆیی و بۆ ماوەی زیاتر

---

[٣٣١] ابن الأثير، الكامل،ج٨،ص٥٩٠؛ محمود عرفة محمود، الأحوال الساسية والدينية في بلاد العراق، ص ص٣٦-٣٧.

[٣٣٢] عبدالنعيم حسنين، سلاجقة، ص٥٧؛سعيد عبدالفتاح عاشور، تاريخ العلاقات بين الشرق والغرب، ص ص٤٣-٤٤.

[٣٣٣] ايليسيف، الشرق الاسلامي في العصر الوسيط، ص٣٥٥.

[٣٣٤] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص١٩٠؛ محمد صالح الزيباري، السلاجقة الروم، ص٦٨.

له سەدەیەك پشتاوپشت لەبەر دەستی نەوەكانیدا مایەوە[٣٣٥]، سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەلاجیقەی ڕۆمیش (٤٧٠-٦٣٤ك/١٠٧٧-١٢٣٦ز) كە باڵی بەسەر ناوچەی ئاسیای بچووك (توركیای ئێستا)دا كێشابوو، وەك بەرئەنجامێكی گرنگی شەڕەكەو بەنۆرەی خۆشی كاریگەری كردە سەر باروودۆخی سیاسی و سەربازی كوردستان[٣٣٦]، جگە لەوەش بیانوو بۆ پەلاماردان و پاشەكشەكردنی (كر و فر) هێزی سەربازی سەلجوقی پەیدابوو، كە لەنێوان ناوچەكان و بەكوردستاندا تێپەڕن و زیانی زۆریان بەم هۆیەشەوە بە كورد گەیاند، سەرباری ئەوەی دەسەڵاتیان بە سەر كوردستاندا سەپاند[٣٣٧]، له لایەكی دیش توێژەرێك سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانی بەمیراتگری سەلاجیقەی ڕۆم دەزانێ[٣٣٨]، بەو پێیەی كە (كارل بركلمان)یش بنچینەیانی بۆ سەر هۆزێكی غوزە توركمانەكان گێڕاوەتەوە[٣٣٩]، كە له مێژووی شەش سەدە فەرمانڕەوایی خۆیدا گەورەترین كاریگەری لەسەر مێژووی كورد دروستكردووە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەی لەسەرەوە باسكران، شەڕە ناخۆییەكانیش شوێنەواری خراپیان بەسەر كوردستانەوە زۆر بەجێهێشت، لەوانە شەڕی نێوان میرەكانی بنەماڵەی بوەیهی، كە سەرباری سودوەرگرتن له داهاتی كوردستان بۆ شەڕەكان و بوونی بەشانۆیەك بۆ شەڕو جەنگ بەتایبەت ناوچەكانی هەرێمی چیاكان و ڕۆژئاوای هەرێمەكە، كوردیشیان

---

[٣٣٥] حكيم البابيري، مدينة خلاط، ص٧٩.

[٣٣٦] بۆ زانیاری لەسەر ئەم دەوڵەتە بگەڕێوە، مؤلف مجهول، أخبار سلاجقة الروم؛ محمد صالح الزيباري، سلاجقة الروم.

[٣٣٧] سعيد عبدالفتاح عاشور، تاريخ العلاقات بين الشرق والغرب، ص ص٤٦ -٤٧؛ نیشتمان بەشیر، كوردو سەلجوقیەكان، ل ٢٤٣.

[٣٣٨] جرجي زيدان، تاريخ تمدن الإسلامي، مج٢، ج٤، ص٤٧٤.

[٣٣٩] تاريخ الشعوب الإسلامية، ص٤٠٧؛ وە بڕوانە: ستانلي لين پول، الدول الاسلامية، ق١، ص ص٣١٤- ٣١٧.

له بەرژەوەندی خۆیان له شــەڕەکانی نێوانیــان تێوەگلانــد، لــەو نێوەنــدەدا میرنــشینی حسنویهی نموونەیەکی بەرچاوە، بەشداری میر حسنویهی بــەناردنی هێزێکــی (هــەزار) کەسی بەسەرکردایەتی بدرو عبدالرزاقی کوڕی بۆ یارمەتیدانی عــز الدولــە بختیــاری بوەیهی لەشەڕی دژی عضد الدولەی ئامۆزای[٣٤٠]، شوێنەواری خراپی لەسەر پەیوەندی نێوان میرنیشینەکەو عضد الدولة لێکەوتەوە بەتایبــەت دوای ســەرکەوتنی ئــەو مــیرە بەســەر (عزالدولــة)دا و کــوژرانی لــە ســاڵی (٣٦٧ك/٩٧٧ز) دەستبەســەرداگرتنی بەغدا[٣٤١]، ئەوەبوو وەك تۆڵەکردنەوەیەك لە ڕقی کــۆنی بەرامبــەر بــە میرنــشینەکە، مردنی میرحسنویهی بەهەل زانی و ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) پەلاماری میرنشینەکەیداو دەستی بەسەر دەستکەوت و ســامانی زۆرو زەبەندەیــدا گــرت و ئاژاوەشــی خــستە نــاو بنەماڵەکــەوە[٣٤٢]، شــەڕی پۆســت و کورســی میرانــی بــوەیهی زیــاتر لەچــەند جــار میرنشینەکانی حسنویهی و عەنازی تووشی شەڕو ململانێ کردووەو کەوتوونەتە نێــوان بەرداشی مـلملانێکانی نێوانیان، هەموو ئەمانەش کاریگەری خراپی لەسەر پەیوەنــدی نێوان میرەکان و بوەیهییەکان درووست کردووە، سەرئەنجامیش بەرەو لاوازی و پوکانەوەی بردوون[٣٤٣]، ئەوە سەرباری سوود وەرگرتن لە هێزی مرۆیی کورد بۆ بەرژەوەندی شەڕی خۆسەپێنی نێوانیان کە هیچ سوودێکی کوردی تێدا نەبووە.

---

[٣٤٠] ابـن الأثير،الكامـل،ج٧،ص٣٤٥؛ قـادر محمـد حـسن،الامارات الكرديـة،ص٨٥؛حوزنی موکریـانی، سەرجەمی بەرهەمی، بەرگ١،ل١٣٣.

[٣٤١] ابن كثير،البداية والنهايـة،مج٦،ج١١،ص١٠٢؛ القلقـشندي، مآثرالإنافـة، ج١، ص٣١٣؛ الحنبلـي، شذرات الذهب، مج٢، ج٣، ص٥٩.

[٣٤٢] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٤٥٣؛ ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١١، ص١٠٧.

[٣٤٣] بۆ پەیوەندی ئالۆزی نێوان کورد و بوەیهییەکان بڕوانە : قـادر محمـد حـسن، الامـارات الكرديـة، ص ص٩٢ -٩٦.

کوردستان لەشەڕو ململانێی نێوان سوڵتانەکانی سەلجوقیش زەرەرو زیانی زۆری پێکەوت و شوێنەواری خراپیان لەسەر بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی کورد بەجێهێشت، جێی ئاماژەیە کە بەمردنی سوڵتان ملکشاه ساڵی(٤٨٥ك/١٠٩٢ز) دەرگاری ئاژاوەو پاشاگەردانی و شەڕ بەڕووی دەوڵەتی سەلجوقیدا کرایەوەو سەردەمی بەهێزی و یەکێتی و کۆتایی پێهات[٣٤٤]، شەڕی بنەماڵەیی و ناوخۆیی سەلجوقی دەستی پێکرد، کوردستان سەرباری ئەوەی مەیدانێك بوو بۆ زۆرێك لە شەڕەکان، پردی پەڕینەوەی هێزەکانیش بوو، بەتایبەت کە لەگەڵ هەر دەستپێکردنەوەیەکی نوێی شەڕدا شارە کوردیەکان دەکەوتنە بەر تاڵانکاری و دەبوونە پێخۆرو قوربانی شەڕەکە، شاری همدان نموونەیەکی دیارە لەم بارەیەوە لە شەڕی نێوان سوڵتان برکیاروق و محمدی برای دا، کە زۆربەی شەڕەکانیان لەم شارەدا بوو[٣٤٥]، بەتایبەت ئەوان سەرباری ناکۆکی و سەختی شەڕی ناوخۆیان، بەڵام لەسەر لێدان و سەرکوتکردنی خەڵکی کوردستان کۆك بوون، بەڵکو بڕیاری هاوکاری کردنی یەکتریشیان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکاندا دا[٣٤٦]، ڕەنگە دابەشکردنی کوردستان بەسەر دوو بەرەی دژ بەیەکتر داو لەنێوان خۆیاندا وەك خراپترین بەرئەنجامی سەربازی شەڕی نێوان برکیاروق و محمدی برایدا دیاری بکرێت[٣٤٧]، بەمەش گیانی پەرتەوازەیی و شەڕەنگێزییان لەناو کورد بڵاو کردەوە، بەڵام بەمەو بەشەڕەکانی نێوانیشیان نەهامەتیەکان بۆ کورد کۆتایی نەهات، بەڵکو تا دوا ساتەکانی فەرمانڕەوایەتییان ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتیان لە کوردستاندا دەکرد، تا بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی سەلجوقی،

---

[٣٤٤] عبدالعظيم رضايي، تاريخ ده هزار ساله ايران، جلد٣، ص٨٨.

[٣٤٥] ابن الجوزي، المنتظم، ج٩، ص ص١١٢- ١١٣؛ الراوندي، راحة الصدور، ص٢٢٦.

[٣٤٦] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص٤٦٣.

[٣٤٧] ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص٤٩٣؛ الحسيني، زبدة التواريخ، ص١٦٥؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٥، ص١٨٧" عبدالنعيم حسنين، سلاجقة، ص ص ٩٣-٩٤.

وەك ناوچەكانی تری جیهانی ئیسلامیش وەچەیەكی فەرمانڕەوایی دەركەوتن كە بە (سەلاجیقەی كوردستان) ناسران[٣٤٨]، ئەمەش بەڵگەیەكی دیارە لەسەر وونبوونی رۆڵی كورد تەنانەت لە وڵاتی خۆشیدا، (ابن الاثير)یش لەمەڕ ئەو رۆژگارەدا دەڵێ: ((نەهامەتی و ترس و نائارامی باڵی بەسەر خەڵیدا كێشاو ماڵەكان وێران بوون و زیانی زۆریان پێكەوت و گوندەكان سوتان و خوێنێكی زۆر رژا))[٣٤٩].

شەڕو ململانێی سوڵتانەكانی سەلجوقی لەنیوەی یەكەمی سەدەی (شەشەمی كۆچی و دوازدەیەمی زاینی) چووە قۆناغێكی ترسناكتر، شوێنەوارو كاریگەری خراپی زیاتریشیان لەسەر كوردستان لێكەوتەوە، بەشداریكردن و نەكردنی كوردیش لەگەڵ هەر لایەنێكی شەڕەكە هەر بەزیانی كورد و شارە كوردیەكان تەواو دەبوو، چونكە هەروەك توێژەرێك ئاماژەی داوە، شەڕی سەلجوقیەكان لە پێناو بەدەستهێنانی كورسی و دەسەڵات بوو، لەبەرئەوە وێڕای بەركەوتنی زیانەكانی شەڕ بەسەر ناوچەكان، كە زۆربەی كات ناوچە كوردیەكان بوو، ئەگەر لەبەرەی تێكشكاودا بان ئەوە زیانەكان چەندبارە دەبوونەوە، سوڵتانی سەركەوتوو بەرامبەرە سەلجوقیەكەی دەبەخشی و تۆڵەشی لە سوپا تێكشكاوەكەی دەكردەوە[٣٥٠]، خۆ ئەگەر لەبەرەی سەركەوتووش بان ئەوا هەم دیسان ناوچەكان تاڵان دەكران، وەك شەڕی نێوان سوڵتان محمودی سەلجوقی و مسعودی برای ساڵی (٥١٤ك/١١٢٠ز) كە هەرچەندە مسعود تێكشكا، بەڵام سوڵتان محمود بەخشی و رێزی زۆریشی لێگرت و رێگەشی پێدا لە ئازەربیجان و هەرێمی جزیرەو موسڵ وتاری بەناوەوە بخوێندرێتەوە[٣٥١]، كەچی ناوچەكانی همدان كە

---

[٣٤٨] جرجي زيدان، تاريخ تمدن الاسلامي، مج٢، ج٤، ص٤٧٢.

[٣٤٩] الكامل، ج٨، ص٤٩٣.

[٣٥٠] قادر محمد محمد، كوردستان لە نیوەی یەكەمی سەدەی شەشەم، ل٧٢.

[٣٥١] ابن الأثير،الكامل، ج٨، ص٦٥٠؛ الكتبي،عيون التواريخ،ج١٢،ص١٠٣؛ ابن العماد الحنبلي،شذرات الذهب،مج٢،ج٤،ص٤٢.

مەڵبەندی شەڕەکە بوو، زیانی زۆری پێکەوت، بەڵام ئەوە دوا ڕێکەوتن نەبووەو شەڕەکانیش درێژەیان کێشا، مێژوونووسێکیش لەمەڕ ئەو شەڕانەدا نووسیویەتی: ((کوشتاری سەردەمی نەفامییان لەسەر دەسەڵات لەگەڵ یەك کرد نەك لەسەر ئایین))[٣٥٢].

بەردەوامی شەڕەکان خەلیفەی المسترشدی عەبباسیشی تێوەگلاند، بە ئومێدی گەڕانەوەی هەژموونی لە دەستچوویان[٣٥٣]، ئەوەبوو بەسوپایەکەوە ساڵی (٥٢٩ك/١١٣٤ز) لە بەغداوە بەڕێگەی حلواندا بەرەو همدان کەوتە ڕێ، کوردستان لە زیانی ئەو لەشکرکێشیەی خەلیفەش بێبەش نەبوو، چونکە سوپاکەی پەلاماری شاری حلوانیانداو تالآنیانکرد، خەلیفەش لە ترسی ئەوەی لێی هەڵنەگەڕێنەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکردن و گوێی پێنەدان[٣٥٤]، دەتوانرێت بوترێت کە ناوچەکانی حلوان و دەوروبەری بەهۆی هەڵکەوتنی لەسەر ڕێگای نێوان بەغداو همدان، زۆرترین زیانی شەڕەکانی پێگەیشتووە، همدانیش بەهۆی ئەوەی مەڵبەندی فەرمانڕەوایی سوڵتانەکان بووە بەهەمان شێوە، ئەوە سەرباری ناوچەکانی دەینور و ئازربیجان، کە زۆر جار دەبوونە پەناگەی یاخیبوانی سەلجوقی و بێبەش نەبوون لەو کاولکارییە.

## چوارەم/ پەرەدان بە گیانی جەنگاوەری:

بەم شێوەیە ئەو بارودۆخە سەربازیەی کە بەسەر کوردستاندا هاتووە، لەسەر دەستی هێزە داگیرکەرەکان و هێزەکانی دی دەوروبەر، بەرئەنجامی خراپیان لەسەر ئاسایشی

---

[٣٥٢] الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج٤، ص٦٧.

[٣٥٣] ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص٥١؛ الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج٤، ص٧٣.

[٣٥٤] ابـن الأثير، الكامـل،ج٩،ص٢٦؛ ابـن دحيـة، كتـاب النـبراس،ص١٥٠؛ قـادر محمـد محمـد، كوردستان،ل٧٧.

مرۆڤی کورد لێکەوتەوەو وای کردووە کە بەردەوام لەبەردەم مەترسیدا بێت، شوێنەواری خراپیشیان لەسەر دەروونی تاکی کورد بەجێهێشتووە، وایکردووە لە دڵەڕاوکێ و ترس و بیمدا بژیەت، تاکە پەناگەیەکی بەهێز کە مانەوەی پێوە پەیوەست بوبێت هەلومەرجی سرووشتی و چیاکانی کوردستان بووە، لەگەڵ بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە قەڵاو شورە کە مێژوونووس (ابن شداد) تەنها لە هەرێمی دیاربکر زیاتر لە پەنجا قەڵاو پێگەی ژماردووە[٣٥٥]، لەگەڵ شارە شێوە قەڵاکان، هەروەك تاشکراشە زۆربەی شارەکانی کوردستان لە شوێنێکی جوگرافی سەخت و دژواردا هەڵکەوتوون، یانیش قەڵایان هەبووە، ڕەنگە ئەم تیۆرەش سەبارەت بەم شارانە ڕاست بێت کە دەڵێ: ((شار بۆ کاروباری جەنگی درووست کراوە))[٣٥٦]، بایەخدانی زۆربەی میرو سەرۆك خێڵەکانی کوردیش بە درووستکردنی ئامرازە پارێزگاریە جەنگیەکان بۆ خۆپاراستن لە مەترسیە ناوخۆو دەرەکیەکان هەر لەو چوارچێوەیەدا بووە[٣٥٧]، هەروەك چۆن کوردەکانی ناوچەی هەکاری دەستیان بە چاککردنەوەی ئەو قەڵایانە کرد کە بەهۆی شەڕو ململانێی نێوان حەمدانیەکان و بویهیەکان کاول ببون، لەگەڵ دروستکردنی چەند قەڵایەکی دی لەبەر پەرەسەندنی مەترسی سەلجوقیەکان لەسەر ناوچەکە[٣٥٨]، کە تاکو ئەمڕۆش شوێنەواری زۆربەی هەموو ئەوانە لە شارو شارۆچکەکان و لوتکەو چیاکانی کوردستان هەر ماوە، هەموو ئەمانەش شوێنەواری ئەو بارودۆخە سەربازیەیە کە بەسەر کورددا هاتووە دەردەخەن، کوردیش سەرباری سەختی شەڕەکان و بەردەوامی گەمارۆکان لە داگیرکردنی شارو قەڵاکانی کوردستان لەلایەن هێزە داگیرکەرەکانەوە لەبەرگریکردن

---

[٣٥٥] الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١، ص ص٢٤٦-٢٥٢.

[٣٥٦] فرهاد حاجي عبوش، المدينة الكردية، ص٤٦.

[٣٥٧] بۆ نموونە بڕوانە: حسام الدين نەقشبەندی، شارەزور، ل٤٥٤؛ سلام خوشناو، جزيرة ابن عمر، ص ص١٢٩- ١٣١؛ عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية،ج٢، ص٣٢٦.

[٣٥٨] بڕوانە: درويش هروري، بلاد هكاري، ص١٠٩.

لـەخۆی و خاکەکـەی داسـتانی گـەورەی تۆمـار کـردووە، بەتایبـەتیش بەرامبـەر مەغۆلەکان، ئەو داستانە ڕاستەقینانەش وەك شوێنەوارێکی سەربازی نەمر ماونەتەوە، کە تەنانەت مێژوونووسی مەغۆلیش (الهمذاني) نەیتوانیوە باسیان نەکات، بەڵکو بە (شجعان الاكراد) ناوی کورد دەبات و خاوەن قەڵاکانیش بەشانازی و ڕەبەرزییەوە وەڵامی سـەرکردە مەغۆلـەکانیان داوەتـەوە کـاتێ داوای خۆبەدەسـتەوەدان و هەڕەشـەی لەناوبردنیان لێ کردوون، بەوەی کە هەڕەشەکانیان نایانترسێنێت، چونکە بە جەنگاوەری ورەبەزی کورد پشت ئەستورن[٣٥٩]، ئەمانەش کاریان کردە سەر ورە بە بەرداکردنـەوەی دانیشتوانی شارەکانی دی لە بەرووداچوونەوەی شاڵاوەکانی مەغۆلدا.

دەشێ هەر ئەو هەلومەرجەش بەرپرس بـێ لـە چەسـپاندنی ئـارەزووی جـەنگ لـە دەروونی تاکی کورددا، چونکە شەڕ بۆتە سیمایەکی ژیانی گـەلی کـورد و بەدرێـژایی مێژووش بەهای جەنگ لەنێو کۆمەڵگـەی کوردەواریـدا چەسـپاوە، ڕەنگـە بەشـێکی مەیلی جەنگیش حەزو ئارەزوو نـەبووبێ بەتـەنها، بـەڵکو وەك بـەرگریکردن لـەخۆ و ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی داگیرکاران و خۆشەویستی بۆ ئازادی بووبێت، چونکە کورد ئازادی بەسەروەری دادەنێت و مردنیش لە شەڕدا بە ئاوات دەخوازێـت[٣٦٠]، هـەر ئـەو بارودۆخە سەربازییەو زاڵی خەسڵەتی شـەڕ و شـەڕانگێزی لـە چـاخەکانی ناوەڕاسـتدا بووە، کە بە هێزی و سنووری قەڵەمڕەوی بنەماڵە و خێڵە دەرەبەگەکانی کوردستان بـە پێوەری ژمارەی ئەو جەنگاوەرو شـەڕکەرانەی کـە هـەر خێڵێـك خـاوەنی بـووە دیـاری بکرێت، بۆ نموونە وەك ئاماژە کراوە، هەریەك لە هۆزەکانی (گۆران و گـەلاڵی و سـولی

---

[٣٥٩] بروانە: جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٢٩٨، ص٣٢٥.

[٣٦٠] مەلا محمودی بایەزیـدی، دابونـەریتی کوردەکـان، ل٣٤؛ بـەدرخان سـندی، کۆمـەڵگای کـوردەواری، ل٣٦.

وحەمیدی)یەکان خاوەنی هەزار جەنگاوەر بوون[٣٦١]، وە جەنگاوەرانی هۆزی هەکاریش بە چوار هەزارو زرزاریەکانیش بە پێنج هەزار دانراوە[٣٦٢]، ئەمانەش بەڵگەن لە سەر بایەخدانی هۆزە کوردیەکان بە گیانی جەنگاوەری.

بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا شوێنەواری خراپ لە خۆشەویستییان بۆ شەڕ لەسەر ئاستی ناوخۆش کەوتۆتەوە، بەتایبەت لەناو خێڵەکاندا کە وەك کۆمەڵگەیەکی نیوەجەنگی (شبه حربی) بەشێکیان هەمیشە ئامادەبوون بۆ جەنگ[٣٦٣]، ئەمەش تایبەتمەندی و خەسڵەتی هەمان ئەو کۆمەڵگانەیە کە بە کۆمەڵگەی سەربازی (المجتمع العسكري) ناسراون[٣٦٤]، پاشکەوتوویی و فەرهەنگی باری ژیانی خەڵك و هەڵکەوتەی جوگرافی و ئاژەڵداری و دۆخی کشتوکاڵ و تێکۆشان بۆ بەسەربردنی ژیانیش بوونەتە هۆی نانەوەی کێشەو شەڕ لەناو خێڵەکانداو زیانی زۆریشی بەدوای خۆیدا هێناوە[٣٦٥]، چونکە دوژمنایەتییەکی بنەماڵەیی درووست کردووە بەدرێژایی چەند وەچەش وەك نەریتێکی خراپ گیانی تۆڵەکردنەوە لایان ماوەتەوە[٣٦٦]، هەروەك (شەرەفخان)یش ئاماژەی کردووە لە تۆڵەکردنەوەدا بە زەبرو زەنگ و توندو تیژن و تۆڵەی خۆیان یەك بەهەزار دەستێنن[٣٦٧]، هەرچەندە زیادەڕۆیی هەیە لەم گێڕانەوەیەدا، بەڵام بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕاستیەی کە ئاماژەی پێدراوە، کە تاکو ئێستاش لەناو خێڵەکاندا بوونی تێبینی

---

[٣٦١] العمري، مسالك الأبصار، ج٣، ص ص٢٦٠ -٢٦١؛ القلقشندي، صبح الأعشى، ج٤، ص٣٧٣، ص٣٧٥.

[٣٦٢] العمري، مسالك الأبصار، ج٣، ص٢٦٦، ص٢٧٠.

[٣٦٣] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارور، ل٢٠٣.

[٣٦٤] بروانە: سامي ريحانا، المجتمعات العسكرية عبر التاريخ، دار الحداثة، (بيروت:١٩٩٦)، ص ص٨-٩.

[٣٦٥] حسینی خەلیقی، کۆمەڵناسی کوردەواری، ل٦٠.

[٣٦٦] مەلامحمودی بایەزیدی، دابونەریتی کوردەکان، ل٢٢.

[٣٦٧] شەرەفنامە، ل٢٦.

دەكرێت، ئەوە سەربارى ئەوەى وەك شوێنەوارێكى سەربازى ئەو بارودۆخە مێژووييە بەتايبەت ئەندامانى خێڵەكان (خەڵكى رەمەكى) ئارەزووييان لە كارى چەكدارييە، تێشووى بەشێكى زۆريان لەسەر ئەم پيشەيەيە، خوو گرتنى كورديش بەم پيشەيەو ئاسان دەستكەوتنى پارە دوورى خستۆتەوە لە پيشەى ترو دەست ڕەنگينى و پيشەگەرى، كە ئەمەش كاريگەريەكى خراپى لەسەر داهاتووى كۆمەڵگەى كوردى بەگشتى دروستكردووە، ئەمەش وايكردووە سروشتێكى خێڵەكى وەربگرێت و بە قوڵيش ڕەگى لە ژيانى كۆمەڵايەتى و سياسيدا داكوتاوە(٣٦٨).

هەموو ئەمانەش وايكردووە كە تاكى كورد بە كەسايەتييەكى شەڕخوازو شەڕەنگێز لاى ڕۆژهەڵاتناسەكان بناسرێت(٣٦٩)، خراپ بەكارهێنانى كورديش لەلايەن داگيركەرانەوە لە چالاكيە سەربازييەكانياندا واى لێكردوون گيانى شەڕكردن و مەيلى تالآنكاريان لا درووست بكات(٣٧٠)، ئەمەش هەمان گوتەى گەريدەو مێژوونووسە موسڵمانەكانە كە بە(ڕێگر-قطاع طرق) ناويان بردوون، بەم شێوەيە ئەو بارودۆخە سەربازييەى كە چەند سەد ساڵێك درێژەى كێشا، بوونە كۆسپى گەورە لە ڕێى پێشكەوتن و نەشونماكردنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى و سياسى و كەلتورى كورددا(٣٧١)، كەواتە دەكرێت مانەوەى بەشێك لەو ديارده خراپانەى كە باسيانكرا شوێنەوارو كاريگەرى ئەو بارودۆخە بێت كە بەدرێژايى مێژوو بەسەر كورددا هاتووە.

---

(٣٦٨) لازاريف، چەند كێشەيەكى ديوگرافى و مێژوويى، ل٣٩٢.

(٣٦٩) مينورسكى، الاكراد، ص٧٨؛ بەدرخان سندى، كۆمەڵگاى كوردەوارى، ل٤٩٥.

(٣٧٠) مينورسكى، الاكراد، ص ص ٧٩-٨٠.

(٣٧١) لازاريف، چەند كێشەيەكى ديوگرافى و مێژوويى، ل٣٨١.

## بەشی دووەم :

## شوێنەوارە کۆمەڵایەتی و کەلتوریەکان

### باسی یەکەم/
شوێنەوارە کۆمەڵایەتیەکان

### باسی دووەم/
کاریگەری و شوێنەوارە کەلتوری و فەرهەنگیەکان

### باسی سێیەم/
کاریگەری و شوێنەوارە ئایینی و مەزهەبیەکان

## باسی یەکەم/ شوێنەوارە کۆمەڵایەتیەکان:

ئەگەر لەشکرکێشی بریتی بێت لە کۆی ئەو چالاکیە سەربازیانەی کە هێزێکی بەژمارە زۆرو سوپایەکی ڕێکخراو دەیکاتە سەر هەرێمێك، بەگرتنەبەری میکانیزم و هونەری سەربازی جۆراوجۆریش بەبێ سلکردنەوە لە هەر ئەنجامێکی خراپ لە هەوڵی سەپاندنی ئیرادەی هێزی خۆی و گەیشتن بە ئامانج دابێت، ئەوا کوشتن و کاولکاری و ئاوارەبوون لە نزیکترین و ترسناکترین شوێنەوارە مرۆییەکانیەتی، لە داوێنیشیدا بڵاوبوونەوەو نیشتەجێبوونی هێزی داگیرکەرو شوێنەواری کۆمەڵایەتی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە، لەشکرکێشیەکانی سەرکوردستانیش بەدەر نەبوون لە شوێنەواری لەم جۆرە.

### یەکەم/کوشتن و ئاوارەبوونی دانیشتوان:

زەیاریەکان وەك یەك لەو هێزانە لە میانەی داگیرکردن و هێرشکردنە سەرشارەکاندا هەرگیز لە کوشتنی خەڵکی ڕەش و ڕووت و ئاسایی کوردستان درێغیان نەکردووە[٣٧٢]، داگیرکردنی شاری الدینور لەلایەن (ابن علان القزوینی)ی سەرکردەی سەربازییان نموونەیەکی دیارە لەم بارەیەوە، کە سەرباری خۆپەنادانی خەڵك و داخستنی دوکان و بازاڕەکانی شارەکە، بەڵام بە هەزارانی لە دانیشتوانی شارەکە کوشت، تا ئەو

---

[٣٧٢] ڕەنگە نەتوانرێ بە ژمارە قوربانیانی هەر لەشکرکێشییەك دەرخەین، لەبەر نەبوونی ئاماری دروست و بڵاوی و چەندبارەبوونەوەی پەلامارەکان بۆ سەرناوچە جیاجیاکانی کوردستان، مەبەستیشمان ئەوە نییە، بەڵکو پیشاندانی تەنها چەند نموونەیەکە بۆ گشت هێزەکان و هەموو ناوچەکانیش تارادەیەك هاوێنەی یەکن لەم بارەیەوە.

ڕادەی هانایان بۆ پیاوانی ئایینی و سۆفیەکان برد کە تکا بکەن لە (ابـن عـلان) کـە دەست لە کوشتاری خەڵك هەڵگرێت، بۆ ئەم مەبەستەش (ابن مـشاد الـدینوری) کـە یەکێك بوو لە سۆفیە ناودارەکانی شارەکە بە کارێکی لەو جۆرە هەڵسا، بەڵام ابن علان نەك هەر ڕێزی نەگرت، بەڵکو کوشتنی ئەو و دانیشتوان و تاڵانکردنی شارەکەشی بـۆ هێزە سەربازیەکەی حەڵاڵ کرد[٣٧٣]، چارەنووسی شارەکانی دیش، لەوانەش همـدان لـە دەینەوەر باشتر نەبوو[٣٧٤].

لەژێر سایەی داگیرکاری بوەیهیەکاندا ڕێژەی قوربانیەکان زیاتر بـوون، چـونکە لـەم بارەیەوە سیاسـەتیان لـە زەیاریـەکان باشـتر نـەبوو[٣٧٥]، وە بـوونی بەشـێکی ناوچـە کوردنشینەکانیش بە مەیدانی شەڕی نێـوان میەکـانی بـوەیهی و ڕۆڵـی خراپیـان لـە دروستکردنی شەڕ و ئاژاوەی نێوان میرنشینی حسنویهی و عنازی قوربانیەکانی زیـاتر کردووە، بەتایبەت عضدالدولة نەك هەر کوشتنی تەنها ئەوانەی دژی بـوون لەبەرچـاو نەبوو، بەڵکو بە پێشەنگی ئەوانەش دادەنرێـت کـە یاسـای ڕیشەکێشکردنی (قـانون الابادة) بنەماڵەیی پەیڕەوکرد، ئەوەشی لە کوشتنی شەش کـوڕانی مـیر(حـسنویه)دا بەرجەستەکرد[٣٧٦].

کوردسـتان لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی (پێنجـەمی کۆچـی/یـازدەی زاینـی)دا لەسەردەستی غوزەکان و سەلجوقیەکان کە بە ئـاژاوەگێڕ و تاڵانـچی و بکـوژی خـەڵك ناسرابوون ڕووبەڕووی کارەساتێکی مرۆیی و ئابووری تر بوو، لەماوەی چـەند سـاڵێکدا

---

(٣٧٣) المـسعودي،مروج الـذهب،ج٤،ص٣٤٠؛ابـن الأثير،الكامـل،ج٦،ص٧٥٨؛نيـشتمان بـشير،الأحوال الإجتماعية والإقتصادية،ص ص٤٣-٤٤.

(٣٧٤) المـسعودي،مروج الـذهب، ج٤ ، ص٣٤٠؛ القزوينـي، لـب تـواريخ، ص٩٤؛ زرار صـديق،الكورد في العصر العباسي، ص١٥٢.

(٣٧٥) نيشتمان بشير، الأحوال الإجتماعية و الإقتصادية، ص٥٠.

(٣٧٦) مسكويه،تجارب الأمم،ج٥،ص٤٥٣؛الروذراوري ،ج٦،ص١٢؛ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص٣٧٦.

بەگشت ناوچەکاندا بلاوبوونەوەو لە سەرەتای هەڵمەتەکەشیاندا لە ساڵی (٤٢٩ك/١٠٣٧ز) لە ئەرمینیا و شاری ورمیێ کوشتارێکی زۆریان لە کورد کرد[٣٧٧]، پاشان کۆمەڵێکی تریان پەلاماری مراغەیاندا و ڕێژەیەکی زۆریان لە دانیشتوانی کوشت و مزگەوتی شارەکەشیان سوتاند[٣٧٨]، شارەکانی جزیرەش پارێزراو نەبوون لە کاولکاری و کوشتاری غوزەکان سەرباری بەتاڵانبردنی سامان و ماڵی خەڵك و ژن و منداڵەکانیشیان وەك تاڵانی جەنگ دەست بەسەردا دەگرت[٣٧٩]، نامەکەی نصرالدولە بۆ طغرل بك کە داوای لێکرد بەربەستێك لەبەردەم ڕەشە کوژی خەڵك دابنێت لەلایەن غوزەکانەوە[٣٨٠]، ڕادەی ترسناکی کاولکاریەکانیان دەردەخات لەسەر ناوچەکە، بەجۆرێك کە بە درێژایی مێژووی مەرنشینی مەروانی توشی مەترسی و کارەساتی مرۆیی لەو جۆرە نەبووە، (فارقی)یش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە جگە لە غوزەکان کەسی تر نەیتوانیوە مەیدانخوازی دەسەڵاتی نصرالدولە بکات[٣٨١].

هەرچی سەلجوقیەکانیش بوون ئەوا ترس و تۆقاندیان کردبووە ئامرازێك بۆ چاوترساندنی خەڵك لە داگیرکردنی هەر شوێنێك، هەر زووش هاواری بێزاری خەڵك لە

---

[٣٧٧] ابن العبري، تاريخ الزمان،ص٨٩؛ كسروي،شهرياران،ج٢،ص١٩٥؛لازاريف والأخرون،تاريخ كوردستان،ص٤٤.

[٣٧٨] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٨٩[٣٧٨] ابن العبري، تاريخ الزمان،ص٨٩؛ " كسروي،شهرياران،ج٢،ص١٩٥؛لازاريف والآخرون،تاريخ كوردستان،ص٤٤.

[٣٧٨] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٨٩؛انورمائى، الاكراد فى بهدينان،ص١٠٧؛أحمد عبدالعزيز، إمارات الهذبانية،ص٩٠.

[٣٧٩] ابن الاثر،الكامل،ج٧،ص ص٧٢٢-٧٢٣ ؛كسروي، شهرياران،ج٢،ص١٩٥؛ درويش هروري،بلادهكاري، ١٠٢.

[٣٨٠] ابن خلدون،العبر،ج٤،ص٣١٣.

[٣٨١] مێژووی میافارقین و ئامەد ,ل٨٩.

بەرامبەریان بەرزبۆوەو پەیامی ناڕەزایی گەیشتە خەلیفە(القائم بامرالله)(٤٢٢-٤٦٧ك/١٠٣٠-١٠٧٤ز) داوای لێکرا کارێك بکات کە سوپای سەلجوقی دەست لە کوشتاری خەڵك هەڵگرێت، لەسەر ئەو کارانەشی سەرزەنشت کرا[٣٨٢]، شارە کوردیەکان زۆرترین پشکی خراپەکاریەکانی ئەو سوپا سەرکوتکەرەیان بەرکەوت، لەگەڵ هەڵمەتەکانی ابراهیم ینال لە نێوان ساڵانی (٤٣٤-٤٣٨ك/١٠٤٢-١٠٤٦ز)دا دەستی هێزە سەربازیەکەی لە دەستدرێژیکردنە سەر خوێن و سامان و ئابڕوی خەڵك بەجۆرێك والاّ کرد، کە کردارەکانیان لەهی هێزێکی موسڵمان نەدەوەشایەوە[٣٨٣]، زیاتر لەوەش ژن و منداڵیان دیل کردو بڕیاریان لە سەر سوتاندنی کەلوپەلی لە تالاّن بەجێماو و خانوبەرەی دانیشتواندا، بەنموونە لەشاری حلوان ماڵی میر(ابوالشوك)ی عەنازیشیان سوتاند[٣٨٤]، بەم شێوەیە هەموو ئەو شاروگوندانەی کە سوپای سەلجوقی پێیدا تێپەڕیوە سەرباری کوشتنی خەڵك بەشێکیش بەناچاری و بەبێ پێداویستی ئاوارەدەبوون و دەست بەسەر ماڵ و موڵکیاندا دەگیرا[٣٨٥]، ئەوان لە شەڕە ناوخۆییەکانیشیاندا دەستیان لە کورد نەپاراست، بۆ نموونەی هەڵمەتەکەی (تتش کوری الب ارسلان) ساڵی (٤٨٥ك/١٠٩٣ز) بۆسەر شارەکانی جزیرە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کوشت و شارەکانیشی تالاّنکرد[٣٨٦]،(ابن الأثیر)یش لەمەڕ ئەو بارودۆخەی کە لە میانەی شەڕە ناوخۆیەکانی سەلجوقیەکاندا بەسەر کوردستان و ناوچەکانی دی

---

[٣٨٢] ابن الجوزی،المنتظم،ج٨،ص١١٦؛العمراني،الأنباء في تأريخ الخلفاء،ص١٨٨.

[٣٨٣] ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص٥٢ ؛ نیکیتاالیلیسیف،الشرق الاسلامی،ص٣٤٧.

[٣٨٤] ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص٥٣،ص ص ٥٦-٥٧؛ابن کثیر،البدایة والنهایة،ج١١،ص١٩٨؛فرست مرعی،الامارات الکردیة،ص٣٨٠-٣٨١.

[٣٨٥] ابن الاثیر،الکامل،ج٨،ص٥٧؛ حسام الدین نەقشبەندی،شارەزوور،ل ل ٣٣٨-٣٣٩.

[٣٨٦] فارقی،مێژووی میافارقین،ل١٣٣؛کرمانی،سلجوقیان وغز درکرمان،ص٢٥٩؛ابن واصل،مفرج الکروب،ج١،ص٢٣.

هاتووه ئاماژەی بەوەکردووە کە ((شاروگوندەکان وێران بوون و زەوی و کێڵگەکانی سوتان و خوێنێکی زۆر ڕژاو، خەڵك بێ جێگەو ماڵ بوون و سامان و داهاتیان تالآنکراو دنیا پڕبوو لە خراپە))[٣٨٧].

لەسەرەتای سەدەی (حەوتەمی کۆچی/سێزدەی زایینی)ش لە سەردەستی خوارزمیەکان، کورد تووشی قەڵاچۆکردن و پاکتاوکردنێکی نوێ هات، ئەوانیش تەنها بەوێرانکردن و تالآنکردنی کوردستان وازیان نەهێنا، بەڵکو پیاوەکانیان دەکوشت و ژن و منداڵیان دەکردە دیلی شەڕو دەستدرێژیان دەکردە سەر ئابڕۆیان و ماڵەکانیان دەسوتاند، سەرچاوەیەك لەبارەی دڕندەیی ئەوان نووسیویەتی ((ڕشتنی خوێنی مرۆڤیان لا بێ بەهاتربوو لە ڕشتنی ئاو، هەرگیز بەزەیی موسڵمانییان لەدڵدانەبوو، ئەوەی ئەوان کردیان بێباوەڕەکانی ئەبخازوخاچەکان نەیانکردبوو))[٣٨٨]، وەك ئەوەی لەشاری دقوقا ئەنجامیاندا[٣٨٩]، تەنها ئەوانە بێوەی دەرچوون کە لەدەست ستەمی هێزی سەربازی خوارزمیەکان ڕایانکرد[٣٩٠]، ئەوان تەنها بە خستنەکاری شمشێر و مەنجەنیق و ئامرازەکانی دی لەناوبردن بەرنەبوونە گیانی خەڵك، بەڵکو بە مەبەستی ڕیشەکێشکردنی دانیشتوان سیاسەتی ئابلۆقەدانی ئابووریان لەگرتنی شارەکاندا پەیڕەودەکردو بەو هۆیەشەیەوە خەڵکێکی زۆر لە برسان و لە بێئاوی و نەخۆشی لەناوچوون[٣٩١].

---

(٣٨٧) الكامل،ج٨،ص٤٩٣.

(٣٨٨) الراوندي، راحة الصدور،ص٥٥٣.

(٣٨٩) ابوشامة، تراجم رجال القرنين،ص١٤٤؛اليافعي،مرآة الجنان،ج٤،ص٣٩.

(٣٩٠) ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٤٣٢،ص٤٣٩؛اليافعي،مرآة الجنان،ج٤،ص٥٢؛نافع توفيق العبود،الدولة الخوارزمية،ص١٦٥.

(٣٩١) بۆنموونە بڕوانە: ابن الأثير، الكامل،ج١٠،ص٤٣٩؛ابن العبري،تاريخ مختصرالدول،ص٤٢٩؛ النويري، نهاية الأرب،ج٢٧،ص١٠٧.

سەبارەت بە مەغۆلیش کۆی مێژوونووسان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هیچ سوپایەك لەمێژوودا ئەوەندەی ئەوان دڵڕەق و بێبەزەیی و وێرانکەر نەبووە وەك هێزێکی ناموسڵمان، نەك بە تەنها مرۆڤ، بەڵکو ئاژەڵەکان دارو درەخت و بێگیانەکانیش لەدەستی ئەوان بێ زیان نەبوون[٣٩٢]، هەربۆیە لەمێژوودا سوپاکەیان بەلافاوی مەرگهێن و دڵڕەشە نەفرەت لێکراوەکان ناوبراوە بەهۆی کوشتاری زۆری خەڵك[٣٩٣]، خوێن ڕشتنی مرۆڤ لەلایان جۆرێك بوو لەباوەڕ، بەشێکیش بوو لەیاسای سزادان و لە ناوەڕۆکی (یاسا-یاسق)ی مەغۆلدا جێگیرکرابوو، چونکە پێیان وابوو کەڕوح بەخوێن دەخەملێنرێت و لەگەڵیدا تێکەڵاوەو تا خوێن نەڕژێت لاشەو ڕوح لێك جیانابنەوە، بۆیە جگە لە کوشتن و خوێنڕشتنی مرۆڤەکان باوەڕیان بە جۆرێکی دی لە کوشتن نەبوو، شانازیشیان بە کوشتنی خەڵکەوە دەکرد[٣٩٤]، هەتا جەنگیزخان ئەوەی دەربڕیبوو کە لەوە چێژ وەردەگرێ و خۆشحاڵە کە فرمێسکی چاوی ئافرەتان دەبینێت کاتێك بەبەرچاویانەوە پیاو و منداڵەکانیان دەکوژن[٣٩٥]، سروشتی کارەکانیشیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی نەدەگۆڕا، هەرشارێك کە داگیریان دەکرد ژمارەیەکی زۆریان لە دانیشتوانە بێ چەکەکان و دیلەکان بەپێش خۆیان دەدا و لە گرتن و ئابڵۆقەدانی شارو قەڵاکانی تر سودیان لێ دەبینین و وەکو قەڵغانی مرۆیی بۆ پاراستنی

---

[٣٩٢] اليونيني،ذيل مرآت الزمان،ج١،ص٨٥ ؛مصطفى طه بدر،محنة الإسلام الكبرى،الهيئة المصرية العامة،(القاهرة:١٩٩١م)،ص٩٢.

[٣٩٣] ابن عربشاه،فاكهة الخلفاء،ص٥١٢؛سەیدباز ئەلعەمرینی،مەغۆلەکان،ل١٥٣؛محمد سهيل طقوش،تاريخ المغول العظام،ص٧٩.

[٣٩٤] العمري،مسالك الابصار،ج٣،ص١٠٦؛ادوار بروي،تاريخ الحضارات العام،ص٣٦٤؛ماهر حمادة،وثائق الحروب الصليبية،ص٣٥٣.

[٣٩٥] بۆ هەڵسەنگاندنی کەسایەتی جەنگیزخان لەم بارەیەوە بگەڕێوە: عباس اقبال،تاريخ المغول،ص١٠٧.

خۆیان لە زەبری شیوتیری بەرگریکاران بەکاریان دەهێنان، کاتێکیش کاریان پێ تەواودەبوون بەکۆمەڵ دەیانکوشتن[٣٩٦].

شارەکانی کوردستان ئازاری هەموو ئەو نەهامەتیانەی سوپای مەغۆلیان چەشت، هەر لە شاڵاوە سەرەتاییەکانیانەوە بۆ سەر همدان و شارەزوور و هەولێر و شارەکانی دی جزیرە، بەهەزارانیان کوشت و شار و گوندەکانیشیان سوتاندو وێرانکرد[٣٩٧]، وە لەگەڵ داگیرکردنی هەر شارێکدا بۆ چەند رۆژێك دەستی هێزی سەربازییان واڵادەکرد بۆ کوشتاری دانیشتوانی[٣٩٨]، مەغۆلەکان تەنها لە ناوچەکانی جزیرە حەفتاوشەش قەڵایان وێرانکردوە[٣٩٩]، لەبەرئەوەی ئەوکات قەڵا شوێنی نیشتەجێبوونی دانیشتوان بووە و پەناگەیەکی باشبووە بۆ پاراستنی لە مەترسی دوژمنان، بۆیە بەو پێیەبێت دەبێت دانیشتوانی ناو ئەو قەڵایانە یان کوژرابن و لەناوچوون یانیش ئاوارە و دەربەدەربوون، زۆری رێژەی کوژراوان و نەشاردنەوەی تەرمەکانیان بۆتە هۆی پیسبوونی ژینگەو ئاووهەواو بەمەش نەخۆشی بلاوبۆتەوە و رێژەی قوربانیانی زیاتر کردووە[٤٠٠]، بەم شێوەیە ئەو کارەساتەی کە مەغۆلەکان لەماوەی کەمتر لە چل ساڵ بەسەر مرۆڤایەتی بەگشتیدا داهێنا کەم وێنە بووە.

---

[٣٩٦] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٣٤٨؛ سەیدباز ئەلعەرینی،مەغۆلەکان،ل ل ١٣٤-١٣٥.

[٣٩٧] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص ص٤٤٩-٤٥٠؛ الدياربكري، تاريخ الخميس،مج٢،ص٣٧١؛ عبدالله الحارثي،الأوضاع الحضارية،ص ص١٧٩-١٨٠؛ علي عادل حسين،أربل،ص ص٥٤-٥٥.

[٣٩٨] بۆ نموونە بڕوانە: الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١،ص ص٣٠٦-٣٠٧؛ الذهبي، دول الاسلام،ج٢،ص١٧٣؛القلقشندي،مآثر الانافة،ج٢،ص٩٢.

[٣٩٩] ئەولیا چەلەبی،سیاحەتنامە،ل٦٩.

[٤٠٠] الذهبي،العبر،ج٥،ص٢٢٦؛الكتبي،عيون التواريخ،ج٢٠،ص١٣٥؛ابن كثير،البداية والنهاية،ج١٣،ص٢٧٥؛محمد فتحي أمين،الغزو المغولي،ص١٢٦.

کۆچ و پەرِاگەندەبوونی هەندێ هۆز و ماڵباتە کوردیەکان بەناوچە جیاوازەکانی کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا، دەشێ وەك شوێنەوارێکی دی لەشکرکێشیەکان دیاری بکرێت، پەرِاگەندەبوون و پەرش و بڵاوبوونەوەی زۆر لە هۆزو خێڵەکان و پچرانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیان بەیەکەوە و تێکچوون و لەبەریەکهەڵوەشانی یەکێتی خێڵەکانیان چ لەئەنجامی هێرش و پەلاماری هێزەکان بۆ سەرناوچەکانیان، یانیش بەشێك بووە لە سیاسەتیان بۆئەوەی بەئاسانتر بەسەر بەرەنگاری و دەمارگیری خێڵەکاندا زاڵ بن، لێکدەدرێتەوە، بەتایبەت کە هۆزو خێڵە کوردەکان بەخەسڵەتی ئازایەتی و جەنگاوەری ناسرابوون و پەیوەندیەکی بەهێزی خزمایەتی و دەمارگیری خێڵەکی ئەندامانی بەیەکەوە بەستۆتەوە، وەك پەرش و بڵاوبوونەوەی هۆزی بەناوبانگی گۆران (جورقان) کە بەشێکیان لە دەرتەنگی حلوان[٤٠١]، وە بەشێکیشیان بۆ ناوچەی هەولێر پەرِاگەندەبوون، بەبەڵگەی ئەوەی مەغۆلەکان لەو ناوچانە کوشتاری زۆریان لەگۆرانەکان کرد لە کاتی هێرشەکەیاندا[٤٠٢]، سیاسەتی زوڵم و زۆری سەلجوقیەکانیش بەشێکی زۆری لە گاوانیەکان ناچارکرد بۆ پاراستنی ماڵ و سامان و ئابرووی خۆیان ناوچە بەرزاییەکانی رۆژئاوای هەرێمی چیاکان بەجێبهێڵن و بەرەو ناوچەی(جامعین)[٤٠٣]کۆچ بکەن، کە دواتر هاوبەشییان لەگەڵ (مەزیدیەکان)دا کرد لە دروستکردنی شاری(حیللە)دا، ناوی گەرەکێکی گەورەی شارەکەش هەر بەناوی (گەرەکی کوردان) ناونراوە[٤٠٤]وەك رەگەزی دووەم لە شارەکەدا ناسراون[٤٠٥]،

---

[٤٠١] القلقشندي، صبح الاعشى،ج٤،ص٣٧٣.

[٤٠٢] ابن خلدون، العبر،ج٥،ص٦٢٣؛ علي عادل حسين، أربل،ص٢٢٧.

[٤٠٣] الجامعين: شارۆچکەیەك بوو لەنێوان حیللە و بەغدا، ابن عبدالحق البغدادي،مراصد الاطلاع،دار احياء الكتب العربية، (القاهرة:١٩٥٤م)، ج١،ص٤١٩.

[٤٠٤] مستەفا جواد، هۆزی لەبیرکراوی گاوان،ل ل ٤٢-٤٣؛ آواز محمد عبدالكريم،الكورد الجاوانيون،ص٧٧.

وەپەراگەندەبوونی هۆزی گەلالی (الكلاليه) بەناوچەكانی شارەزوور و دەرتەنگ و ئازربیجاندا[٤٠٦]، هەموو ئەمانە نموونە گەلێكی ئەو حاڵەتە نیشاندەدەن، ئەمەش كاریگەری خراپی كردۆتە سەر دیارنەمانی زۆر لە خێڵ و ماڵباتەكانی كورد، هەتا لەناوچوونی هەندێكیشیان هۆزی(گاوان)نموونەیەكە لەوانە[٤٠٧].

جگەلەوە كورد بۆ دەرەوەی سنووری كوردستانیش بەهۆی پەلاماری هێزە داگیركەرەكان ئاوارە بووە، بەتایبەت بەهۆی پەلاماری خوارزمیەكان دووچاری ئاوارەبوون و كۆچ و ڕەو هاتوون و ژمارەیەك لە خێڵ و هۆزەكان ئاوارەو دەربەدەری بەغدا و شام و میسر بوون[٤٠٨]، بەتایبەت خەڵكی شاری خلاط كە زیاتر لە شارەكانی دی تاڵی ستەمی ئەو هێزە سەركوتكەرەیان چەشتوو بەناچاری ماڵ و سامانیان بەجێهێشتووەو كۆچیان كرد[٤٠٩]، چەند بنەماڵەیەكیان لە شاری قاهیرە گیرساونەتەوەو بوونی گەڕەكێكیش بەناوی (حي الخلاطين) بەڵگەی زۆری ڕێژەیان بووە لەو شارەدا[٤١٠]، شاڵاوەكانی مەغۆلیش ڕێژەی كۆچی هۆزەكانی بەرەو شام و میسر زیاتركرد، شارەزووریەكان لە دیارترینی ئەوانەبوون كە ملكەچییان بۆ مەغۆل پێ قبوڵ نەكراو یانیش لەبەر زەبرو زەنگی ئەوان بەڕێژەیەكی بەرچاویان ئاوارەبوون، كۆچی ئەوان لە میسریشی تێپەڕاند و هەندێ بنەماڵە لە تونس و مەغریب و مەراكیش گیرساونەتەوە، لەوانەش بنەماڵەی (محمد بن القالون) ناسراو بە (المزوار) كە دوای هێرشی مەغۆل بۆ

---

[٤٠٥] ابن بطوطه، رحلة ابن بطوطه،مطبعة العصرية،(بيروت:٢٠٠٧م)،ج١،ص١٩٦؛ السبكي،طبقات الشافعية،ج٣،ص٣٩١.

[٤٠٦] العمري،مسالك الابصار،ج٣،ص ص٢٦٠-٢٦١.

[٤٠٧] بروانە: آواز محمد عبدالكريم، الكورد الجاوانيون،ص٢٦.

[٤٠٨] محمد صالح القزاز، الحياة السياسية في العراق،ص٢٠٦.

[٤٠٩] امين زكي،خلاصة،جلد١،ل١٤٧؛عبدالله الحارثي،الأوضاع الحضارية،ص٥٥.

[٤١٠] ئەولیا چلبی،سیاحەتنامە،ل١٦٠؛ حكيم البابيري،مدينةخلاط،ص٢٢٩.

شارەزوور و داگیرکردنی بەغدا بەرەو ڕۆژئاوا کۆچیان کردووە[٤١١]، هەردوو هۆزی لاوین و باپیری کە (العمری) بە (الوسة والباسریة) ناوی هێناون نیشتەجێی شارەزوور بوون ڕێگای کۆچیان بەرەو شام و میسر گرتەبەر[٤١٢]، وە بەشێکی هۆزی گەلالیش ئاوارەی هەمان شوێن بوون[٤١٣]، وە دانیشتوانی شارەکانی جزیرەش کە سەرچاوەیەك بە حەفتاهەزار کەسی داناون کۆچیانکرد بەرەو شام[٤١٤]، دواتریش لە ژێرسایەی دەسەلاتی مەغۆلدا کورد ئۆقرەی بەخۆوە نەبینیوە، زۆرجار بەناچاری ڕێگەی ئاوارەبوون و کۆچی هەلبژاردووە، وەك کۆچی چەند بنەماڵەیەکی ناوچەی سنجار ساڵی (٦٧٥ك/١٢٧٦ز) بەرەو ولاتی شام[٤١٥]، بەدیوێکی تردا ئەو کۆچەی کورد بۆتە هۆی ئاشکرابوون و دەرکەوتنی دەیان هۆزو بنەماڵەو کەسایەتی و سەرۆك هۆز و زانا کە ڕۆڵێکی دیاریان لەبەرپەرچدانەوەی مەغۆلدا بینیوە لە شام و میسر[٤١٦]، دواتریش ڕۆڵی شارستانی گەورەیان گێڕا لە کایە جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتی مەمالیکداو بەمەش خزمەتێکی گەورەی شارستانیی ئیسلامیان کرد[٤١٧].

هەر ئەو کارەساتانەش شوێنەواری خراپیان لەسەر ڕێژەی دانیشتوان بەجێهێشتووە، ئەگەرچی ئاماری وردو دروست لەبەردەستدا نین بۆ زانینی ژمارەی دانیشتوانی

---

[٤١١] ابن خلدون،العبر،ج٦،ص٤٣٢.

[٤١٢] العمری،مسالك الابصار،ج٣،ص٢٦١؛ القلقشندی،صبح الاعشی،ج٤،ص٣٧٤؛ محمد امین زكی،خلاصة،جلد١،ل١٥٢.

[٤١٣] العمری،مسالك الابصار،ج٣،ص٢٦١؛عباس العزاوی،اربل فی مختلف العصور،ص٧٩.

[٤١٤] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٣٢١.

[٤١٥] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٣٣٢؛درويش هروري،بلاد هكاري،ص١٨٠.

[٤١٦] زرار صدیق، چەندلێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی کورد،ل١١٧؛علی عادل حسین، أربل، ص١٣٨.

[٤١٧] بۆ زانیاری لەمبارەیەوە بگەڕێوە: قادرمحمدحسن،اسهامات الكرد في الحضارة الإسلامية،دار سپيريز،(دهوك:٢٠٠٩م)،ص٩١.

کوردستان بەر لە لەشکرکێشی هێزەکان تا سەدەی (حەوتەمی کۆچی/سێزەی زایینی) و دوای لەشکرکێشی مەغۆلەکان، بۆ دەرخستنی ڕادەی ئەو شوێنەوارە خراپانەی لەسەر ئەم لایەنە بەجێیان هێشتووە، بەڵام بە پێی خەملاندنی (مسعر بن مهلهل) بێت، کە لە سەدەی (چوارەمی کۆچی/دەیەمی زایینی)دا ژیاوە، تەنها لە ناوچەی شارەزووردا (شەست) هەزارماڵ هەبووە[٤١٨]، کە بێگومان هەرماڵ و خێزانیش لەچەند ئەندامێك پێکهاتووە، کە دەکرێت بکرێتە بەڵگەی زۆری دانیشتوان، ئەمەش لەگەڵ نەریتی خێڵەکی و کۆمەڵایەتی کورد گونجاوە، کە هەمیشە ئارەزوویان لە منداڵی زۆرە، سەرباری گونجاوی باری جوگرافی و سرووشتی کوردستان و بوژانەوەی ئابووری، کە هۆکاربوون بۆ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، بەلام بەهۆی پرۆسەی لەشکرکێشیەکان و شەڕە ناوخۆییەکان و خراپی سیاسەتی ئابووری چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی پەتاو گرانی ، کە بەرئەنجامی لەشکرکێشیەکان بوون، سەرباری کارەساتە سرووشتیەکان، کەئەمانە هەموو بوونەتە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان[٤١٩]، بەتایبەت ئەو کوشتارە زۆرەی کە مەغۆلەکان بەرامبەر بەدانیشتوان ئەنجامیاندا، کاریگەری خراپی لەم بارەیەوە لێکەوتەوە، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، سەرباری کوژرانی زۆری خەڵك بەشێکی زۆریش ئاوارەبوون و چەندین شارو گوندیش وێران بوون و بوونە کەلاوە، لەبەرئەوە لە سەردەمی مەغۆلەکاندا ژمارەی دانیشتوان زۆر کەمی کردووە[٤٢٠].

---

[٤١٨] الرسالة الثانية،ص١٨.

[٤١٩] أحمد كمال الدين،السلاجقة،ص٢٠٢.

[٤٢٠] جعفر حسين خصباك،العراق في العهد المغول الالخانيين،ص١٦٢.

## دووەم/ نیشتەجێبوونی ڕەگەزی بێگانە لە کوردستاندا:

سروشتی پڕخێر و بێری کوردستانیش و لەئەنجامی لەشکرکێشی بەربلاو و بەردەوامی هێزە بیانیەکاندا بلاوبوونەوە و گیرسانەوەی دەیان هۆزو خێڵ و تیرەی میللەتی داگیرکەری لێکەوتۆتەوە، بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی سەرچاوەکانی داهاتەکەی لەناوچە جیاوازەکاندا نیشتەجێبوون، بوونی چەند کەمینەیەکی نەتەوەیی و ڕەگەزی تائێستاش دەشێ وەك زادەی ئەو هەلومەرجە لە بەرچاو بگیرێت.

بۆ نموونە کاتێك زەیاریەکان هەلسان بە لەشکرکێشی و بەشێك لە شارەکانی هەرێمی چیاکان و ڕۆژئاوای ئەو هەرێمەیان گرت، دەیلەمیەکانیش وەك پێکهێنەری سەرەکی سوپای ئەوان و وەك یەك لەو ڕەگەزانە بەناوچەکەدا بلاو بوونەوە[٤٢١]، پەرەسەندنی دەسەلاتی مرداویج و هەولەکانی بۆ داگیرکردنی بەغداش بەردەوامیدا بە کۆچی دەیلەم بەرەو ناوچە کوردنشینەکان، چەند توێژەرێکیش پێیان وایە کە سەرباری مەترسیە سیاسی و سەربازیەکانی زەیاریەکان بۆ سەرناوچەکە، وەستاندنی کۆچی ڕەگەزی دەیلەم لە پشت قایلبوونی خەلیفە المقتدرەوە بوون، بە دانان بە دەسەلاتی مرداویج و ئەوەی لە هەرێمی فارسی و هەرێمی چیاکان دەستی بەسەردا گرتبوو[٤٢٢]، کۆچی ئەم ڕەگەزە هەرێمەکانی ئازر بیجان و ئارانیشی گرتۆتەوە زیادبوونی ڕێژەشیان لە ناوچەکەدا بەرئەنجامی سیاسی گەورەی هەبوو، لەسەر سەرهەلدان و دامەزراندنی میرنشینی (سالاری) سالی (٣٣٠ك/٩٤١ز) لەلایەن محمد کوڕی مسافری سالاریەوە[٤٢٣]، دەشێ هاوسنوری دەیلەمستان کە زێدی خۆیانبوو لە ئازربیجان

---

(٤٢١) المسعودي، مروج الذهب،ج٤،ص٣٣٨؛نيشتمان بشير،الأحوال الإجتماعية،ص٨٩.

(٤٢٢) حسن أحمدمحمود، العالم الإسلامي،ص٤٨٩،ص٥٠٣؛ابراهيم عبدالمنعم سلامة، في التاريخ الدولة الإسلامية، ص٣١٣.

(٤٢٣) ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص١٠٧؛ابن خلدون،العبر،ج٤،ص٥٩٩؛حسام النقشبندي،آذربيجان،ص١٢٥.

هۆكارێكی یارمەتی دەربوبێت بۆ بڵاوبونەوەیان لە هەرێمەكەدا[٤٢٤]، پەرەسەندنی دەسەڵاتی سیاسی میرنشینی ناوبراو بڵاوبوونەوەی دەیلەمیەكان لە ناوچەكەدا، كاریگەری خراپیان كردە سەر دەسەڵاتی میر دیسمی كوردی و دواتریش توانا سەربازیەكانی ئەو میرە كوردەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، ئەمەش بەهێزبوونی پێگەی دەیلەمیەكانی لێدەخوێنرێتەوە و كاروباریش لەدەست ئەو میرەكوردە دەرچوو، سەرئەنجامیش هەر لەسەر دەستی ئەوان دەسەڵاتی دەیسەم كۆتایی پێهات[٤٢٥].

لەگەڵ لەشكركێشی بوەیهیەكانیش خزینی ڕەگەزی دەیلەم بە شێوەیەكی بەرچاوتر لەجاران زیادی كردووە، بەتایبەت هەریەك لە شارەكانی همدان و دەینەوەر و قرمیسین و حلوان بەهۆی گرنگی و هەڵكەوتەی جوگرافییان زیاتر كەوتنە بەر شاڵاوی كۆچی ئەم ڕەگەزەوە[٤٢٦]، پشت پێبەستنی میرنشینەكانی حسنویهی و عەنازی بەڕەگەزی دەیلەم وەك بە كرێگیراو لە پێكهێنانی سوپاكانیاندا[٤٢٧]، هۆكارێكی دی بوو بۆ زیادبوون و نیشتەجێبوونیان لەشارە كوردنشینەكاندا، بە بەڵگەی ئەوەی تا هێرشی ابراهیم ینال ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٥ز) بۆ سەر حلوان و قرمسین و دەیلەم بەشێك بوون لە سوپای میر (ابوالشوك)ی عەنازی، كە ئەركی پاراستنی قرمیسینیان لەگەڵ هۆزی شازنجانیدا پێسپێردرابوو[٤٢٨]، لەناوچەكە هەرمابوون، بەڵام پێدەچێت لەو مێژووە بەدواوە بەهۆی پوكانەوەی دەسەڵاتی بوەیهیەكان و دەركەوتنی غوز و

---

[٤٢٤] بۆ زانیاری لەسەر هەرێمە دەیلەم بڕوانە: المقدسی،احسن التقاسیم،ص ص٢٦٧-٢٨٠.

[٤٢٥] مسكویه، تجارب الأمم،ج٥،ص٣٠٨؛ابن الأثیر،الكامل،ج٧،ص٢٠٢؛كوثر اسماعیل،الحیاة الإقتصادیة،ص١٤٨.

[٤٢٦] نیشتمان بشیر،الأحوال الإجتماعیة،ص٨٩.

[٤٢٧] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الجوزی،المنتظم،ج٨،ص١٣٠؛ابن الاثیر،الكامل،ج٨،ص ص٥٦-٥٧؛حسام الدین نەقشبەندی،شارەزوور، ل٤٠٨،ل٤١٤.

[٤٢٨] ابن الأثیر،الكامل،ج٨،ص٥٢.

سەلجوقیەکان کاریگەرییان هەبووبێ لەسەر کەمبوونەوەی دەیلەم لە کوردستاندا[٤٢٩]، بەگوێرەی ئەوەی لە سەرچاوەکانیشدا هیچ ئاماژەیەکمان بەرچاو نەکەوتووە رێژەیان زۆر کەمی کردووەو بەو هۆیەشەوە دەکرێت بە تێپەڕبوونی کات لە ناو بۆتەی کۆمەڵگەی کوردیدا توابنەوە.

شاڵاوە توندوتیژە یەك لەدوای یەکەکانی غوزو سەلجوقیەکان بۆ سەر زێدی کورد تەنها کاری خراپی نەکردۆتە سەر لاوازکردن و ڕوخانی میرنشینەکان و سنووردارکردنی دەسەڵاتی سەرۆك هۆزو قەڵادارانی کورد، بەڵکو بڵاوبوونەوەو نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆری لە ئێل و گروپ و بنەماڵەی (تورك یان تورکمان) لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا، لێکەوتۆتەوە[٤٣٠]، کە وەك دیارترین ڕەگەزی بێگانە لە کوردستاندا کاریگەری و شوێنەواری گەورەیان لە مێژووی کوردا بەجێهێشتووە، توێژەرێکیش کۆچی ئەو ڕەگەزەی بەسەر دوو قۆناغ (شێواز)دابەشکردووە، کۆچی (تاکەکەسی-فردی) کە(٤٠٩ك/١٠١٨ز)ی بەساڵی دەستپێکردنی داناوە، وەکۆچی بەکۆمەڵ کە شێوازی لەشکرکێشی بەخۆوە بینیوە لەدوای ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز) دەستی پێکردووە[٤٣١]، ئەمەش لەگەڵ گەیشتنی یەکەم پۆلی غوز بە هەرێمە کوردیەکان کە (ابن الأثیر) ساڵی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) دەستنیشانکردووە نزیکە[٤٣٢].

گێڕانەوەی ڕەگەزی تورکمان بۆ کوردستان هاودەم بووە لەگەڵ دەسەڵاتی میرنشینەکاندا، بۆیە سیاسەتی هەندێ لە میرەکان لەو نێوەندەدا بە هەردوو باری ئەرێنی و نەرێنی دا ڕۆڵی گێڕاوە، ڕەنگە لەمبارەیەوە سیاسەتی میرێکی وەك

---

[٤٢٩] حسام الدین النقشبندي،آذربیجان،ص١٢٥؛نیشتمان بشیر،الأحوال الإجتماعیة،ص٨٩.

[٤٣٠] ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص٥٣؛ابن العمراني،الانباء فی تاریخ الخلفاء،ص١٨٨.

[٤٣١] زبدة عطا،الترك في العصور الوسطی،ص٤٣.

[٤٣٢] الکامل،ج٧،ص٧١٦؛کسروی ساڵی (٤١٠ك/١٠١٩ز) وەك سەرەتای هاتنیان بۆ کوردستان داناوە ، شهریاران،ج٢،ص١٨٠.

(وهـــسوزانی ڕەوادی)(٤١٦-٤٥٠ك/١٠٢٥-١٠٥٨ز) خـــراپ لێکبدرێتەوە،کـــە بـــە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچی یەکێك لە میرەکـانی غـوز دەرگـای بـۆ نیشتەجێبوونیان لە سنووری قەڵەمڕەوی خۆیدا بۆ کردنەوە[٤٣٣]، بەڵام نـصر الدولـەی مەڕوانی ڕۆڵێکی گرنگی گێـڕا لەبـەرگرتن لـە نیـشتەجێبوون و بڵاوبوونـەوەیان لـە ناوچەکانی جزیـرەدا، بەتایبـەت دوای زیـادبوونی ڕێـژەی تورکمـان لـە ناوچـەکەدا و گەلاڵەبوونی بیرۆکەی دامەزراندنی میرنشینێك لایان[٤٣٤]، وایکرد ئەم میرە کـوردە بـە زیاتر لە شێوازێك ڕووبەڕوویان بێتەوە، سەرەتاش هەوڵیدا بەرێگای ئاشتی و پێکهـاتن لەگەڵیان بۆ بەجێهێشتنی ناوچەکە ڕێکبکـەوێت، کـە بەڵێنەکەشـیان نـەبردە سـەر، (سلێمانی کوڕی نصرالدولە) جـێگیری بـاوکی لـە شـاری جزیـرەی ئـیبن عومـەر لـە میواندارییەکدا چەند میرو سەرکردەیەکی لێگرتن، دواتریش نصرالدولە لـە بەرامبـەر کشانەوەیان لە ناوچەکە (منصور)ی میری گەورەیانی ئازادکرد[٤٣٥]، جگـە لـەوە ئـەو میرە کوردە هەر لە پێناو دوورخستنەوەیان لە ناوچەکە هێزی پارەشی خستەگەڕ ویستی بە بەخشینی پارە پێیان ڕازیان بکات و لەو هەنگاوانەشدا سەرکەوتوو بوو، چونکە تـا کۆتایی فەرمانڕەوایی خۆشی، واتا تـا سـاڵی (٤٥٣ك/١٠٦١ز) ڕێگـەی نـەدا هـیچ تورکمانێك لە ناوچەکەدا جێگیربێت[٤٣٦].

دەرکەوتنی سەلجوقیەکان بە شەپۆلێکی نوێی کۆچـی تورکمـان دادەنرێـت بـۆ کوردستان، ئامانجە فراوانخوازیەکانی سوڵتانەکانی سـەلجوقیش بەردەوامیـدا بەکۆچـی ئەم ڕەگەزە،کە هەر لەگەڵ هەڵمەتەکانی ابراهیم ینالەوە بۆ سـەر شـارەکانی هـەرێمی

---

[٤٣٣] ابن الأثیر،الکامل،ج٧،ص٧١٨.

[٤٣٤] محمد سهیل طقوش،تاریخ السلاجقة،ص ٩٦.

[٤٣٥] ابن الأثیر،الکامل،ج٧،ص٧٢٢؛ ابن خلدون،العبر،ج٤ص٣١٢؛ کرفان محمد آمدی،الکورد فی کتابات المؤرخ ابن الاثیر،ص١٨٤؛ئومێد بەهرامی نیا،مێژووی کوردەکانی جزیرە،ل٨٧.

[٤٣٦] محمد سهیل طقوش،تاریخ السلاجقة،ص٦١.

چیاکان کۆمەڵێك لە تورکمانەکان لەناوچەکەدا بڵاوبوونەوەو نیشتەجێکران[٤٣٧]، بۆ نموونە نیشتەجێبوونی بنەماڵەکانی سلغر و پەرچەم (بورجم) و قەفجاقی تورکمانی لە شارەزوور لەناوچەکانی حلوان و قەسری شیرین و قرمیسین و کەرخینی کەرکوك، کە دەستیان بەسەر زەوی وزاری هۆزە کوردەکاندا گرت هەر بۆ ئەو کات دەگەڕێتەوە[٤٣٨]، دیارە دامەزراندنی میرنشینی قەفجاقی تورکمانیش لە ناوچەکانی شارەزوور[٤٣٩]، بەڵگەیە لەسەر زۆربوونی ڕێژەیان لەناوچەکەدا، وە نیشتەجێبونی تورکمانی ئەیوایی لە هەرێمی چیاکان و بەشێکیشیان لە هەولێر نیشتەجێبوون[٤٤٠]، بەشێکیش لە تورکمانی قشیالو هەر لەدەوروبەری هەولێر نیشتەجێبوون[٤٤١]، ناوچەکانی ئازربیجانیش ڕووبەڕووی هەمان شەپۆلی کۆچی تورکمان بوونەوە، لەگەڵ شاڵاوەکانی سوڵتان الب ارسلانساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٤ز) بۆ سەر هەرێمەکە یەکێك لە میرەکانی تورکمان بەناوی (طغطکین)کە ژمارەیەکی زۆر لە بنەماڵەو ئەندامانی هۆزەکەی لەگەڵدابوون بەنیازی بەشداریکردن لە جەنگی خۆبەختکاریدا دژی بێباوەڕان کۆچیانکرد بۆ ناوچەکە[٤٤٢]، دەشێ پیشان نەدانی گوێڕایەڵی و بەربەرەکانی خەڵکی هەندێ لە شارەکانی هەرێمەکە بۆ سوڵتانی ناوبراو، ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە دژی نیشتەجێبوونی هۆزە تورکمانەکان بوون لە ناوچەکانیاندا، هەروەك (قطرانی تبریزی)ش لە هۆنراوەیەکدا ئەوەی خستۆتە ڕوو کە ئەو هۆزانە لە هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی

---

[٤٣٧] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٥٣؛ عبدالله الحارثي،الأو ضاع الحضارية،ص١٣٣.

[٤٣٨] ابن الأثير،الكامل ،ج٨،ص٤٧٦،ج٩،ص١٠٧.

[٤٣٩] بۆزانیاری لەسەر ئەو میرنشینە بگەڕێوە: قادر محمدمحمد،کوردستان لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی کۆچی،ل ل١١٧-١٢٠.

[٤٤٠] ابن الأثير، الكامل، ج٩، ص٢٥٤، ج١٠، ص٤٥٠.

[٤٤١] ابن الأثير،الكامل، ج١٠، ص٤٤٣.

[٤٤٢] ابن الأثير،الكامل،ج٨، ص١٩٤؛احمد كسروى، شهرياران گمنام، ج٢، ص٢٢٨.

زەویە بەپیتەکانی ناوچەکەدا بوون و شوێنێکیان بۆ کشتوکاڵی دانیشتوانە ڕەسەنەکان نەهێشتۆتەوە[٤٤٣]، لە مێژووی داهاتووشدا دیموگرافیای هەرێمەکە بەتەواوی گۆڕا.

زیادبوونی بزاوت و کۆچی تورکمان بەرەو ناوچەکانی ئاسیای بچووك و کوردستان بەیەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی شەڕی مەلازگرد دادەنرێت، بەجۆرێك کە نەخشەی سیاسی و پێکهاتەی دیموگرافی ناوچەکەی گۆڕی و سیمایەکی تورکی پێبەخشرا[٤٤٤]، بە بەڵگەی ئەوەی هێزێکی سەربازی زۆری لە ڕەگەزی تورك لەگەڵدابوو[٤٤٥]، بە ئەرکی خۆزانینی پاراستنی ناوچە سنووریەکانی سنووری ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی وای لە سوڵتان الب ارسلان کرد، کە بەشێك لە هێزە سەربازیەکەی لەو ناوچانە نیشتەجێ بکات و هەژمونیشی بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنێ[٤٤٦]، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەم هێزە ژمارەیان لەزیادبووندا بوو، ئەمەش هۆکارێکی دی بوو بۆ بڵاوبوونەوە و نیشتەجێبوونی تورکمان لە شارە سنووریەکانی هەرێمی جزیرەدا[٤٤٧]، زیاتر لەوەش سوڵتانی ناوبراو بەرپرسیارێتی چەند شارێکی کوردی وەك خلاط وملازگرد بە تورك سپارد[٤٤٨]، (فارقی)یش ئاماژەی بەوە کردوە کەئەم دوو شارە لەژێردەستی میرنشینی

---

[٤٤٣] احمد کسروی،شهریاران گمنام، ج٢، ص٢٢٩.

[٤٤٤] زبدة عطا،الترك في العصور الوسطى،ص١٤٣؛ايليسف،المشرق الإسلامي،ص٣٥٥؛محمد صالح الزيباري،سلاجقة الروم،ص٦٧.

[٤٤٥] الاصفهاني،تاريخ دولة ال سلجوق،ص٢٠٦؛بدرالدين العينى،سيف المهند في سيرة الملك مؤيد،دار الك،(القاهرة :١٩٦٦-١٩٦٧م)،ص١٧٤.

[٤٤٦] بسام العسلى، فن الحرب الاسلامى، مج٣، ص٣١٥.

[٤٤٧] كلود كاهن،دائرة المعارف الاسلامية،مادة(ارمينية)،ج٣،ص٧٨ ؛ فرهاد حاجي عبوش،المدينةالكردية،ص٢٣٨.

[٤٤٨] ناصر خسرو،سفرنامه،ص٦.

مەڕوانیدا دەرچوون[٤٤٩] ، وەدوای ئەوەش دەستی بەسەر چەند ناوچەیەکی دەوروبەری دیاربکردا گرت، ژمارەیەك تورکمانیشی لە شارەکەدا نیشتەجێکرد[٤٥٠] ، سیاسەتی سوڵتان (ملکشاه)ش لە پشت بەستنی زۆری بەرەگەزی تورك لە پێکهێنانی هێزی سەربازیدا و بەخشینی زەوی دەرەبەگی پێیان بە برینەوەی گوندێك یان چەند گوندێك و نشیتەجێکردنیان[٤٥١] ، ڕێژەی تورکمانی لە ناوچە کوردنشینەکان زیاد کرد، بەتایبەت دوای ڕووخانی میرنشینەکان ئەو سوڵتانە داوای لە هاورەگەزەکانی کرد کە لە ناوچەکانی ئەنادۆڵ و دیاربکر نیشتەجێبن[٤٥٢] ، وەبەخشینی ناوچەکانی ئاران لەلایەن سوڵتانی ناوبراوەوە ساڵی (٤٦٨ك/١٠٧٥ز) بە یەکێك لە سەرکردە سەربازیەکانی بەناوی (ساوتکین) بە شاری طنجة (جنزە)ی پایتەختی میرنشینی شەدادیشەوە هۆکارێکی گرنگی بڵاوبوونەوە و نیشتەجێبوونی تورکمان بوو لەو هەرێمەدا[٤٥٣] ، کە دواتریش ژمارەیان زۆر زیادی کرد[٤٥٤] ، سپاردنی ناوچەی حلوانیش بە (ارتق کوڕی اکسب) هەمان ئەنجامی لەناوچەکەدا لێکەوتەوە[٤٥٥] ، کەواتە دەکرێ بوترێ کە سەلجوقیەکان سەرباری ئامانجە سیاسیەکانیان بە کۆچپێکردنی تورکمانەکان بۆ ئاسیای بچووك و ناوچە کوردنشینەکان، بۆ پتەوکردن و بەردەوامی دان بە چالاکی هەنگاوە فراوانخوازیەکانیان و ناوێتەی یەکتری کردنی دانیشتوانی سنووری قەڵەمڕەوییان لەوە سەرچاوەی گرتووە، کە بەتایبەت خەڵکی ناوچە کەوشەنەکان

---

[٤٤٩] مێژووی میافارقین، ل١٠٨.

[٤٥٠] ابن تغري بردي،النجوم الزاهرة،ج٥،ص٨٦؛زرارصديق،كردستان في قرن الثامن الهجري،ص١٠٠.

[٤٥١] السبكي،طبقات الشافعية،ج٣،ص٩.

[٤٥٢] ايليسيف،المشرق الإسلامي،ص٣٥٨.

[٤٥٣] منجم باشي،جامع الدول،ص٢٧٠؛ روس،دائرة المعارف للاسلامية، مادة(شداد)، ج٣، ص١٨٢.

[٤٥٤] ابوشامه،نزهة المقلتين في سيرة الدولتين،ص٨٣.

[٤٥٥] البنداري،تاريخ دولة ال سلجوق،ص٧٥.

بەتەنها نەیاندەتوانی ڕووبەڕووی هێزی بێباوەڕان ببنەوەو پێویستی هێزی مرزیی دەوڵەتیش پڕبکەنەوە، کە بەهۆی دوورییان لە ناوەندەوە بەردەوام لەبەردەم مەترسیدابوون، سەلجوقیەکان بەم هەنگاوەشیان بۆشایی دوورمەودای نێوان ناوچەکەو ناوەندیان پڕکردەوەو قازانجی تایبەتی نیشتەجێکراوەکانیشی تێدابوو، کە لەگەڵ ئامانجێکی تری سوڵتانەکان هاوئاهەنگ بوو، تاڕادەیەك چارەسەری کێشەی زۆری دانیشتوانیان پێکرد، دواجاریش بەهۆی زیادبوونی هەژموونیان پێگەی سیاسیشیان بەهێزبوو، وە لەچوارچێوەی بەمەرکەزیکردنی دەوڵەتدا بەرپرسیاریەتی ناوچەکەیان خستەژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

نیوەی یەکەمی سەدەی (شەشەمی کۆچی/دوازدەیەمی زایینی)ش بە زاڵبوونی ڕەگەزی تورکمان بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا دەناسرێتەوە، کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسی لە شێوەی ئەتابکیەکانی (زنکی و هەولێر و قەفجاقی و ئامەد و حصن کیفا و ئەرتقیەکان) خۆیان نواندووە[456]، وە بەهۆی زۆربوونی ڕێژەشیان لە هەرێمەکانی ئازربیجان و ئاران وناوچە کوردنشینەکانی دی سیمایەکی تەواو تورکیان وەرگرت و دەسەڵاتی سیاسی ناوچەکەشیان خستە ژێردەسەڵاتی خۆیانەوە[457]، ڕەنگە سەرهەڵدانی ئەتابکیەی (الایلدگزیە)[458](٥٣١-٦٢٢ك/١١٣٦-١٢٢٥ز)

---

[456] بۆ زانیاری لەسەر ئەتابکیەکان بگەڕێوە، عمادالدین خلیل،الإمارات الأرتقیة ، قادر محمد محمد،کوردستان لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی کۆچی،ل١١١ و ئەوانی دی.

[457] فرای،دائرة المعارف الاسلامیة، مادة (آران)،ج٢،ص٥٧٢؛محمدسهیل طقوش،تاریخ المغول العظام،ص١٨٩.

[458] ئەتابکیەکی تورکمانی بوو لە ئەنجامی لاوازی سەلجوقیەکان لە هەرێمی ئازربیجان سەریهەڵدا،شمس الدین الایلدگزی(٥٣١-ك/١١٣٦-١١٧٥ز) بە دامەزرێنەری دادەنرێت و هەر بەناوی ئەویشەوە ناسراوە لەسەر دەستی مەغۆلەکان کۆتایی بەدەسەڵاتیان هاتووە، بڕوانە: بوزورن،دائرة المعارف الاسلامیة، مادة (االایلدكزیة)،ج٥،ص٣٨٣؛ستانلی لین پول،الدول الاسلامیة،ق١،ص٣٦٥.

نموونەیەکی دیاربێت لەم بارەیەوە، ئەمەش دیارنەمانی ڕۆڵی سیاسی کورد لە هەرێمەکەدا دەردەخات، هێرش و پەلامارەکانی مەغۆلیش پەیدابوونی دەیان هۆز و بنەماڵەی دی تورکمانی لێکەوتەوە و خزینە شارو ناوچە کوردنشینەکان، لەوانەش ژمارەیەکی زۆر لە شارەکانی مراغە و ئەرزنجان و سیواس و دیاربکر نیشتەجێ بوون[٤٥٩]، کەواتە ئەگەر لەشکرکێشی و سیاسەتی هێزەداگیرکەرەکان هۆکارێك بووبێت بۆ خزینی ڕەگەزی بێگانە بۆ کوردستان، ئەوا نەریتی کۆمەڵایەتی کوردیش لە ڕێزگرتن و قەدرزانینی بێگانەو میوان[٤٦٠]، بەرپرس و هۆکاری مانەوەیان بووە بەدرێژایی مێژوو تا ئەمڕۆ.

## سێیەم/ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان کورد و ڕەگەزەکانی بێگانە:

بەم شێوەیە کۆچی ڕەگەزەکانی بێگانە بۆ کوردستان تەنها پێکهاتەی نەتەوەیی و دیموگرافی هەندێ لە شارەکانی نەگۆڕی، بەڵکو شوێنەواریان لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیشیان لەگەڵ کورد بەجێهێشتووە، هاوسەرگیری سیاسیش وەك شێوازێکی کۆنی پەیوەندی هێزەکانی ناو مێژوو، زۆرجار ڕێگەیەك بووە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و نیشانەیەك بۆ کۆتاییهێنان بە کێشەو ناخۆشیەکانی نێوان کوردو هێزەکانی بێگانە، کە زۆربەی کات لەناو چینی فەرمانڕەوا ئەنجامدراوە، دەکرێت وەك تاکتیکێکی سیاسی هێزەکانیش سەیربکرێ بۆ کردنەوەی جێ پێی خۆیان لە ناوچەکەداو نەهێشتنی کۆسپەکانی سەر ڕێگاو سەقامگیرمانەوەی دەسەڵاتیان، بەلام

---

[٤٥٩] بروانە: القرماني،أخبار الدول،ص٣٣٦؛زرار صديق،كوردستان في القرن الثامن الهجري،ص١٠١؛النقشبندي،اذربيجان،ص٢٣١.

[٤٦٠] مەلا محمودی بایەزیدی،دابونەریتی کوردەکان،ل٤٦؛بەدرخان سندی،کۆمەڵگای کوردەواری،ل٤٤٢.

ناکرێت نکوڵی لەوەبکەین کە هەموو ئەو شتانە بەدیویێکیانداو خودی هاوسەرگیریش کە مانای دروستکردنی خێزانی دەگەیاند، هۆکارێك بوون بۆ تێکەڵبوونی خوێن و ئاشنایەتی و ئاوێتەبوونی کەلتورەکان، وەك کاری کۆمەڵایەتیش لە نێو شوێنەوارە کۆمەڵایەتیەکان جێدەگرێت بۆیە لێرەدا ئاماژەی پێدراوە.

هەستکردن بە گرنگی پێگەی کورد وای لە میر عزالدولە بختیار (٣٥٦-٣٦٧ك/٩٦٦-٩٧٧ز)ی بوەیهی کرد، کە کچی میر (عسکر الکردی) بە سێسەد هەزار دینار! مارەبرێت[٤٦١]، سودی ئەم پرۆسەیەشی لە بەرجەستەکردن و بەدەستهێنانی پشتگیری سەربازی کورد لە پرۆسە سەربازیەکانیدا مسۆگەرکرد[٤٦٢]، هەروەها بەنیازی بەئاسایی هێشتنەوەی پەیوەندی دۆستایەتی نێوانیان و بۆ مسۆگەرکردنی پشتگیری بۆ داهاتووی کوڕەکەی فخر الدولە کچی میر بدری ساڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ز) بۆ مجدالدولەی کوڕی مارەکرد[٤٦٣]، لە داهاتووی ئەو پەیوەندییەشدا بدر رۆڵی دیاری لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەو بنەماڵەیەدا بینیوە و زۆر پشتیان بە ڕاو ڕاوێژی ئەو میرە کوردە بەستووە[٤٦٤].

---

[٤٦١] سبط ابن الجوزي،مرآة الزمان،ص١٥١؛ابن تغری بردی،النجوم الزاهرة،ج٤،ص١٩.

[٤٦٢] مەهدی عوسمان، رۆڵی سەربازی کورد،ل٣٥.

[٤٦٣] هەرچەندە ڕای جیاواز هەیە لەسەر تەمەنی مجدالدولە لەو کاتەدا، بەگوێرەی ئاماژەیەکی(ابن الأثیر)بێت کەساڵی (٣٧٩ك) دەستنیشان کردووە بۆ لەدایکبوونی دەبێت تەمەنی ئەوکات ساڵێك بووبێت (الکامل،ج٧،ص٤٣٣) بەپێچەوانەی ئەو قسەیەش لەشوێنێکی تردا ئاماژەی داوە کەکاتێك فخرالدولەی باوکی مردووە ساڵی (٣٨٧ك) تەمەنی مجدالدولە چوار ساڵ بووە، الکامل،ج٧،ص٤٩٠؛قادرمحمد حسن،الإمارات الکردیة،ص٧٩.

[٤٦٤] بۆ نموونە بڕوانە: هلال الصابی،جزء الثامن من تاریخ هلال الصابی،ج٧،ص ص٦٦-٦٧؛عزیزالله بیات،تاریخ ایران،ص٢٨٤.

کوردیش بەم شێوازە ئارەزووی دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەربڕیوە، بەئامانجی سوود وەرگرتن لە توانای سەربازی و باڵادەستی سیاسی هێزەکان، هەمیش بەو هۆیەوە لە ئاستی کاریگەرییە خراپەکانی لەشکرکێشییەکان لەسەر کوردستان کەمکاتەوە، بەنموونەی پرۆسە هاوسەرگیریەکەی میر و هسوزان لەگەڵ کچی یەکێك لە میرەکانی غوز[٤٦٥]، ئەگەرچی بەرهەمی ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی نەرێتی بەسەر میرنشینەکەدا شکایەوە، غوزەکانیش لەسەر کارە تێکدەرەکانیان بەردەوام بوون و میریش کەوتە گرتن و کوشتاریان[٤٦٦].

هەرلەپەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان کوردو هێزە داگیرکەرەکان،هەندێ جار ئافرەت ئامرازێك بووە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئاڵۆزە سیاسیەکان و بچووککردنەوەی کەلێنی جیاوازی نێوان لایەنە ناکۆکەکان، بۆنموونە دوای تێکچوونی پەیوەندی نێوان سوڵتان الب ارسلان و میر هەزار ئەسپی کوردی و دواتر ئاشتبوونەوەیان،سوڵتان ویستی بەرێگەی هاوسەرگیری شوێنەواری دڵڕەنجان و ناکۆکی نێوانیان سارێژبکات،بۆ ئەم مەبەستەش (سەفیەخاتونی)ی خوشکی لێ مارەبڕیوە[٤٦٧]،ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ ئاسایی بوونەوەی پەیوەندی نێوانیان.

هەرچەندە ئەو نموونانەی باسیان لێوەکرا تەنها بەشێکی ئەوانە بوون کە لەناوچینی فەرمانڕەوا ئەنجامدراون، بەڵام دەکرێت ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە چینی گشتیشی گرتبێتەوە، ئەگەرچی لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیەکمان لەمبارەیەوە بەرچاو نەکەوتووە، بەڵام بە بەڵگەی ئەوەی کە چەندین هۆز و بنەماڵەی ڕەگەزی بێگانە لەناوچە جیاوازەکانی کوردستان نیشتەجێبوون، ناکرێت هەروا دوورەپەرێز وەستابن و

---

[٤٦٥] ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص٧١٨.

[٤٦٦] ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص٧٢١؛ابن خلدون،العبر،ج٤،ص٣١٢.

[٤٦٧] الإصفهاني،تاريخ الدولة ال سلجوق،ص٢٠٥؛ابن تغري بردي،النجوم الزاهرة،ج٥،ص٨٦ ؛نیشتمان بەشیر،کوردو سەلجوقیەکان،ل٢٢٤.

تێکەڵ بە کۆمەڵگەی کوردی نەبووبن، بەڵکو بۆ خۆنزیککرنـەوەو کردنـەوەی جێپێـی خۆیان پەیوەندی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ هۆزو بنەماڵە کوردیەکان دەشێ دامەزراندبێ، پرۆسەی هاوسەرگیریش وەك باشترین پەیوەندی خوێن و خزمایـەتی یـەکێك بـووە لـەو جـۆرە پەیوەندییانـە، بەتایبـەت هاوئـایین بـوونیش بـۆ موسـڵمانەکان پرۆسـەکەی ئاسانترکردووە، تاکو ئەمڕۆش نەریتی هاوسەرگیری لەگەڵ ڕەگەزی بێگانە لەناو کورددا شتێکی ئاساییە.

لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە کە ڕێگەیەکی شیاوی دی بۆ باڵادەستی هێزەکـان لـەجێی دەست بەسەرداگرتن و هێز، پێکهاتن و هاوسەرگیری بووە، کە وەك میکـانیزمێکی دی بۆ سوود وەرگرتن لە کوردو بە پێچەوانەشەوە پەیڕەوی لێکراوە، هیوایـەکی سیاسـی و سەربازی ئاراسـتەی کـردوون، ئـامرازێکیش بـوون بـۆ نزیکبوونـەوە لـە یـەکتری بـۆ بەدیهێنانی هاوسەنگی وردی نێوان مەبەستی ئاشتی و ئامانجی شەڕ، کە دەکرێت ئـەو جۆرە پەیوەندییانە بەشێوە دبلۆماسیەتێکی کۆمەلایەتی ناوبنرێن[٤٦٨].

بەلام پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان کورد و ڕەگەزەکانی بێگانە لە کوردستاندا هـەروا ئاسـایی نەماوەتـەوە، بـەڵکو هەنـدێ جـار بـەهۆی جیـاوازی دابونـەریت و دروسـتبوونی جۆرێـك لـە ڕکەبـەری و شـەڕی بەرژەوەنـدی و چـاوتێبڕین و دەستبەسەرداگرتنی موڵك و ماڵی خەڵك کێشەو ئاژاوەی زۆری لێ پەیدابووە، بۆ نموونە ساڵی (٤٩٥ك/١١٠١ز) میر القرابلی کە لە هۆزی سلغری تورکمانی بـوو، پـەلاماری موڵکەکانی میر سرخاب کوڕی بدری عنازیداو بە پاڵپشتی تورکمانەکان و لەشەڕێکدا میر سرخابی شکاند و ژمارەیەکی زۆری لە دانیشتوانی کورد کوشت و دەستیشی گرت بەسـەر هـەموو ملکـەکانی ئـەو مـیرە کـوردەدا جگـە لـە داقـوق و شـارەزوور[٤٦٩]،

---

[٤٦٨] أحمد توني عبداللطيف،العلاقات الدبلوماسية،ص١٢٨.

[٤٦٩] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٤٧٦؛لازاريف،تاريخ كوردستان،ص٤٥.

هۆكارەكەشی ئەوەبوو میرسرخاب بە مافی خۆی دەزانی ڕێگری بكات لە توركمانەكان لە بەكارهێنان و سوودوەرگرتن لە پاوان و لەوەڕگاكانی سنووری قەڵەمڕەوی خۆی[٤٧٠].

وەستەمی میر ارسلان تاشی میرنشینی قەفجاقی لەخەڵكی شارەزوور و سەرباری دەستبەسەرداگرتنی زەوی و زاری هۆزە كوردەكان لەلایەن میری ناوبراوەوە، تا ساڵی (٥٣٤ك/١١٣٥ز) عمادالدین زنكی ئەتابكیەی موسڵ هێرشی كردە سەرو تاڕادەیەك ستەمی لەسەر كورد كەمكردەوە[٤٧١]، وە هەڵسوكەوتە خراپ و كارە ڕێگریەكانی هۆزی پەرچەمی توركمانی ، تا ساڵی(٥٥٣ك/١١٥٨ز) خەلیفە المقتفی لأمرالله (٥٣٠-٥٥٥ك/١٢٣٥-١١٦٠ز) لە بەغداوە سوپایەكی نارده سەریان، كە ژمارەیەكی زۆریان لە توركمانەكان كوشت و سەری كوژراوان و دیلەكانیش بۆ بەغدا ڕەوانەكران[٤٧٢]، هەروەك چۆن توركمانەكانی هۆزی قشیالو دزی و ڕاوڕوتی زۆریان لەسەر ڕێگاكانی نێوان هەلێرو همدان ئەنجامدا و كەوتنە كاروان ڕوتكردن[٤٧٣].

بەم شێوەیە سەرباری ستەمی زۆری توركمانەكان لە كورد، سەریكێشاوە بۆ قوڵبوونەوەی پەیوەندی دوژمنایەتی نێوانیان، كوردیش ناچار بە بەرگری و شەڕكردووە زیانی زۆریشی لێكەوتووە، بۆ نموونە ساڵی (٥٧٦ ك/١١٨٠ز) لە باكووری شاری ئامەد شەڕێك لەنێوان كورد و توركمانەكانی ناوچەكە ڕوویدا، كە زیانێكی ماڵی و گیانی زۆری بۆ سەر هەردوولا لێكەوتەوە[٤٧٤]، وە ساڵی(٥٨١ك/١١٨٥ز) لەكاتی تێپەڕبوونی كاروانی بوك گواستنەوەیەكی توركمان بەناوچەی (زوزان)دا، بەهۆی ئەوەی

---

[٤٧٠] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٤٧٦؛بدليسى،شەرەفنامە،ل٤١،پەراوێزی ژمارە(١).

[٤٧١] ابن الأثير،تاريخ باهر،ص ص٥٧-٥٨؛ابن واصل،مفروج الكروب،ج١،ص٨٤؛النويري،نهاية الارب،ج٢٧،ص٩٧.

[٤٧٢] ابن الأثير،الكامل،ج٩،ص٢٥٤؛محمد جميل ڕۆژبیانی،مێژووی حسنویهی،ل ل ٢٤٧-٢٤٨.

[٤٧٣] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٤٤٣.

[٤٧٤] عمادالدين خليل،الامارات الارتقية،ص٤٧٦.

ئامادەنەبوون، شیرینی(داوەتـی)ی بـوك گواسـتنەوە بـدەن بـە کوردەکـانی ناوچـەکە، شەڕوئاژاوەیەکی گەورە بەرپابوو، بەجۆرێك پـەرەی سـەند هـەموو شـارەکانی جزیـرەی گرتەوەو بەهۆیەوە خەڵکێکی زۆر لە هەردوولا کـوژران و ئاژاوەکـەش چـەند سـاڵێکی خایاند[٤٧٥]، دەکرێت ئەم ڕووداوانـە بکرێنـە نموونـەی دەیـان ڕووداوی دی لـەم جـۆرە بەتایبەت بۆ پەیوەندی نێوان کوردو تورکمان وەك ڕەگـەزێکی بێگانـەی کاریگـەر لـە کوردستاندا.

## چوارەم/ چەسپانی هەندێك نەریت و دیاردەی کۆمەڵایەتی:

دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکانیش لەئەنجامی پرۆسـەی لەشکرکێـشیەکان و هاوبەشـی شوێنی ژیان و تێکەڵاوبوون لەگـەڵ یـەکتردا کاریـان تێکـردووە، کـوردو ڕەگـەزەکانی بێگانە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری یەکتری و لە هەنـدێ هەڵـسوکەوتی کۆمەڵایەتیـدا لاسایی یـەکتریان کردۆتـەوەو خـوو و نـەریتی یـەکتر فێربـوون، ڕەنگـە هەنـدێك لـە زیادەڕۆیەکانی نەریتی تازیەو بەڕێوەبردنی مەراسیمی شینگێڕان یەکێك بوبێـت لـەو نەریتانەی کە کورد لەم بارەیەوە کەوتۆتە ژێرکاریگەری بوەیهیەکانەوە، لە تەپڵ لێدان لە مزگەوت دانیشتن و چەند زیادەڕۆییـەکی دی کـە لـە نـەریتی دیـاری بوەیهیـەکان بوو[٤٧٦]، دواتریش لەپاڵ ئەمانەدا چەند نەریتێکی تریان داهێنا یان برەویان پێدا، لـە بایەخدان و بەرازاندنەوەو دروستکردنی گومبەز (قوبە) لەسەر گۆڕی مردووەکانیـان و

---

[٤٧٥] الرهـاوي مجهـول ،تـاريخ الرهـاوي مجهـول،ج٢،ص٢٢٥؛ ابـن الأثير،الكامـل،ج١٠،ص١١؛ابـن شداد،النوادر السلطانية،ص٨٠.

[٤٧٦] المقدسي،احسن التقاسيم،ص٣٢٤؛ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص١٢٠.

پیرۆزکردن و سەردانی کردنیان[٤٧٧]، ئەمانەش وەك شوێنەوارێکی کۆمەڵایەتی بوونە نەریتێك لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا[٤٧٨]، کە تائێستاش بەزەقی بوونیان تێبینی دەکرێت، وەبەمەبەستی بەنەمری هێشتنەوەی ناوبانگی مردووەکان بەتایبەت میر و میرزادە و سەرۆك هۆز و پیاوچاك و سۆفیەکان، کەسوکارو لایەنگرانیان هەستاون بە دروستکردنی گومبەزو ئارامگا لەسەر گۆڕەکانیان، بەجۆرێك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم نەریتە بوو بەیەکێك لە سیما دیارەکانی هونەری بیناکاری کورد، مەڕوانیەکان لەوانەبوون کە بایەخی زۆریان بەم لایە نەداوە، بۆنموونە (ست الملك)ی کچی نصرالدولە لە ساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٣ز) لە شاری میافارقین گومبەزێکی ڕازاوەی بۆ گۆڕی باوکی دروستکردووە[٤٧٩]، لەشاری ئامەدیش (ست الناس) گومبەزێکی لەمجۆرەی بۆ میر ناصرالدولەی هاوسەری دروستکردبوو[٤٨٠]، لەسەردەمی ئەیوبیەکانیشدا بوو بەنەریتێکی باو و دەیان گومبەزو ئارامگا بۆ میرو کەسایەتیە ناودارو جەنگاوەرەکانی کورد لەناوەوەو دەرەوەی کوردستان دروستکراون[٤٨١]، کە شوێنەوارێکی زۆریکیان هەرماوە.

ئەو بارودۆخەی کە وەك بەرئەنجامی خراپی کارگێڕی و لاوازی دەسەڵاتی خەلیفەی عەبباسی لە بەریەستکردن و بەرەنگاربوونەوەی هێزەکان هاتە ئاراوە، شوێنەواری خراپی لە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی بەجێهێشتووە، کە خۆی لەسەرهەڵدان و برەوسەندنەوەی کۆمەڵێك دیاردەی نەشیاو و قێزەونی وەك زۆربوونی ڕێژەی غولامزادەو

---

[٤٧٧] تامارا رایس،السلاجقة،ص١١٣.

[٤٧٨] فائزة محمد عزت،الحياة الإجتماعية للكرد بين القرنين(٤-٩ه)،مطبعة الحاج هاشم،(اربيل:٢٠٠٩م)،ص ص١٦٨-١٦٩.

[٤٧٩] فارقی، مێژووی میافارقین،ل١٠٠.

[٤٨٠] فارقی، مێژووی میافارقین، ل١٤١؛عبدالرقيب يوسف،الدولة الدوستكية،ج٢،ص٣٠٠.

[٤٨١] زرارصديق،چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی کورد،ل١٨٤.

جاریەو گۆرانیبێژو داوێن پیسی دا دەبینیەوە[٤٨٢]، کەبوونە هۆی تێکدانی شیازەی کۆمەلآیەتی و زیادبوونی تاوان[٤٨٣]، ڕۆچوون بەناو ژیانی هەوەسبازی و کەڵەکەبوونی سامان لەبەردەستی چینی فەرمانڕەوا، بازاڕی کەنیزەك و کۆیلەکانی گەرمترکرد، وایکرد بەپێی تایبەتمەندی و جوانی و قەشەنگی و دەنگخۆشی و دەستڕەنگینی پارەیەکی زۆر بۆ کڕینیان خەرج بکرێت[٤٨٤]، بەم شێوەیەو لەسەر حیسابی خەڵك سامانێکی زۆر بۆ کڕینی کەنیزەك و خواردنەوە و داوەت (شیرینی)ی ژنهێنان و چەندین شتی بێبایەخی دی خەرجکرا[٤٨٥]، میرێکی وەك نصرالدولە ئەوەندەی گۆرانیبێژو سەماکەرو خزمەتکار هەبووە، کە هیچ کەسێك لەسەرجەم پاشاو سوڵتانان ئەوەی لەخۆشی و ڕابواردندا پێنەبڕاوە[٤٨٦]، سێسەدو شەست کەنیزەکی لەبەردەڵاتی هەبووە، هەر کە بیستبای کەنیزەکێکی جوان و گۆرانیبێژێکی دڵبەرهەیە دەینارد بیکڕن و

---

[٤٨٢] پەرەسەندنی بازرگانیکردن بەکەنیزەك دواتر سەریکێشا بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی نەشازی کۆمەلآیەتی وەك لەشفرۆشی،بەتایبەت لەسەردەمی مەغۆلەکاندا لە زۆر شوێن ئەجۆرە کارانە پەرەیان سەند، تا ئەو ڕادەیەی سوڵتان (غازان) (٦٩٤-٧٠٣ك) بۆ بەرگرتن لە پەرەسەندنی ئەم دیاردەیە چەند بڕیارێکی توندی بۆ سزادانی ئەو کەسانەی بازرگانیان بەو کارەوە دەکرد دەرکرد،بڕوانە:مرتضی راوندی،تاریخ اجتماعی ایران،ج٧،ص٤٦١.

[٤٨٣] علي ابراهيم حسن،تاريخ الإسلام العام،ص٤٦٤؛ فهمي سعد،العامة ببغداد،ص ص٤٢٤-٤٢٥.

[٤٨٤] جرجي زيدان،تاريخ تمدن الإسلامي،ج٣،ص ص ٥٤٧-٥٤٨.

[٤٨٥] ابن الجوزي،المنتظم،ج٩،ص٢٢٤.

[٤٨٦] فارقی،مێژووی میافارقین،ل٩٥؛ابن تغری بردی،النجوم الزاهرة،ج٥،ص٦٩؛کرڤان محمد آمدی،الكرد فی کتابات المؤرخ ابن الاثیر،ص١٨٨.

نرخێکی زۆری پێدەدا[٤٨٧]، وتراوە تەنها بۆ کڕینی کەنیزەکێك (پێنج تا چواردە) هەزار دیناری خەرجکردووە[٤٨٨].

هەر لە چوارچێوەی بایەخدان بە شتە کەمالیەکان و زیادەڕۆیی کردن لە خۆ ڕازاندنەوەو جلوبەرگ و دەرخستنی پێگەی جوانی ئافرەت کە دیاردەیەکی دی باوی سەردەمی سەلجوقیەکان بوو بایەخی زیاتریان پێدرا[٤٨٩]، هەر لەو نێوەندەدا هونەری گاڵتەوگەپ و یاریەکانی شەترەنج و شیربازی و تیرهاوێژی و پێشبڕکێی ئەسپسواری و ڕاوکردن وەك بەشێك لە ژیانی خۆشگوزەرانی و ڕابواردن گەشەیان کرد[٤٩٠]، هەر لەژێر سایەی هێزە داگیرکەرەکاندا هەندێ دیاردەی خراپی دی وەك بایەخدان بە دروستکردن و بازرگانیکردن بە خواردنەوە حەرامکراوەکان پەرەیان سەند، بەجۆرێك بە ئاشکراو بە بەرچاوی خەڵکەوە بازرگانییان پێوە دەکراو دەگوازرانەوە بۆ بازاڕەکان[٤٩١]، بەتایبەت مەغۆلەکان هۆکارێکی سەرەکی بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی ئەو جۆرە دیاردە خراپە کۆمەڵایەتییانە بوون لە ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا[٤٩٢]، ئەم دیاردەیە

---

[٤٨٧] فارقی،مێژووی میافارقین، ل٩٥؛ابوالهجاء،تاریخ ابن ابوالهجاء،ص١٩٥؛ بدلیسی، شەرەفنامە،ل٣١.

[٤٨٨] ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص٢٢٢؛ العمری، مسالك الابصار،ج٢٦،ص٢٥٩.

[٤٨٩] الراوندي،راحة الصدور،ص٤٠٤،ص٤٣٠؛ بدري محمد فهد،العامة ببغداد،ص ص١٦١-١٦٤،ص٢٦٦.

[٤٩٠] الراوندي،راحةالصدور،ص٤٣٠؛عبدالنعيم حسنين،سلاجقة،ص ص١٨٣-١٨٤؛ سعيد الديوەچی،الموصل فی العهد الاتابکی،ص٨٤.

[٤٩١] ابن الجوزي،المنتظم،ج١٠،ص١٠٢.

[٤٩٢] بڕوانە:اکتمال اسماعيل،الحملات المغولية وآثارها الاجتماعية والاقتصادية على بلاد شام،دار مؤسسة رسلان،(دمشق:٢٠٠٨)،ص ٧٣ وما بعدها.

بەتایبەتی لە شارەکانی جزیرەدا زیاتر بڵاوبۆوە، بەهۆی زۆری ڕێژەی مەسیحیەکان لەو ناوچانەدا بەو جۆرە مادانەوە[٤٩٣].

بەم شێوەیە شوێنەواری زاڵی ژیانی ماددی و گەشەکردنی ژیانی ئابووری، کە بوو بەهۆی هەڵاوسانی ئابووری و بەرزبوونەوەی نرخ، سامانی دەوڵەمەندو میرو دەرەبەگەکانی زیاتر کردو هەژارانیشی هاڕی، ئەوەش لە ژیانی گشتی خەڵکیکدا ڕەنگی دایەوەو چینە باڵاکانی خستە ژیانی ڕابواردن و هەوەسبازی، کەچی هەژارەکان کەوتنە جێهێشتنی گوندەکان و هەندێ جاریش نیشتمان، وەگیانی بێزاری و تووڕەیی تێیاندا سەریهەڵدا، بەدور نازانرێت بێزاری خەڵکی میافارقین لە دەسەڵاتی بنەماڵەی مەڕوانی بەتایبەتی میر (ناصرالدولە) لەوە سەرچاوەی گرتبێت[٤٩٤]، ئەوەتا لەکاتی ئابڵۆقەدانی شاری جزیرەی ئیبن عومەردا ساڵی (٤٧٨ك/١٠٨٥ز) لەلایەن (فخرالدولە)وە، بنەماڵەیەکی شارەکە بەناوی (بنو وهبان) بوونە هاوکاری سوپای سەلجوقی و دەرگایەکی شارەکەیان بەڕووی سوپای داگیرکەردا کردەوە، کە بەهۆیەوە شارەکە داگیرکرا[٤٩٥]، هەر لەوساڵەدا دانیشتوانی شارەکە پەلاماری مەسیحیەکانیاندا، چونکە هەروەك (ابن الاثیر) ئاماژەی کردووە هاوپەیمان و هاوکاری بنەماڵەی مەڕوانی بوون لە ستەم و زۆرداری لە دانیشتوانی شارەکە[٤٩٦]، هەر ئەو جۆرە باردودۆخەش سەری کێشا بۆ دەرکەوتنی جیاوازی چینایەتی و دابەشبوونی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای ئاستی هێزی ئابووری و پیشەیی بۆ چینەکانی کاربەدەست و پیشەکارو سەربازو بازرگان و هەژار و کۆیلەو سۆفیەکان... کە هەندێکیان بوونە

---

[٤٩٣] عمادالدین خلیل،الإمارات الأرتقیة،ص٤٨٢؛سوادي عبد محمد الأحوال الإجتماعیة والإقتصادیة،ص ص٢٩٤-٢٩٥.

[٤٩٤] الفارقي،تاریخ الفارقي،٢٣٢.

[٤٩٥] ابن الاثیر،الکامل،ج٨،ص٣٠٠؛کرفان محمد آمیدی،الکرد فی کتابات المؤرخ ابن الاثیر،ص١٩٠.

[٤٩٦]الکامل،ج٨،ص٢٩٩.

سەرچاوەی ئاژاوەو مەترسی لەسەر کۆمەڵگا[497]، بەتایبەت هێزی سەربازی کە لە هەر بارودۆخێکی خراپدا ئەوان پەلاماری ماڵ و سامان دانیشتوانیان دەدا بەجۆرێك خەڵك لە جلوبەرگی بەری خۆشیان دڵنیا نەبوون[498]، نزاکردن و پاڕانەوەش بۆ ڕزگاربوون لەو جۆرە بارودۆخانە تەنها فریادڕەسێك بووە کە خەڵك پەنایان بۆ بردووە[499].

هەر لەئەنجامی ناجێگیری بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەهۆی لەشکرکێشی هێزە بیانیەکانەوە، خراپەکاری و گەندەڵی و دزی و گزیکردن بوونە سیفەتی دیاری کۆمەڵگا، کوشتن و ڕێگری زیادی کردو ڕەشبینی باڵی بەسەر دەروونی خەڵکدا کێشاوە[500]، بەو هۆیەوە خەڵك تەنانەت بەئازادی نەیانتوانیوە ئەرکە ئاینیەکەیان جێبەجێ بکەن، بۆنموونە زۆر ساڵ لە عێراق و کوردستان کەس نەیتوانیوە سەفەری حەج بکات[501]، ڕەنگە خەرجکردنی بڕی(پێنج) هەزار دینار ساڵانە لەلایەن

---

[497] احمد كمال الدين،السلاجقة،ص٢٠٤؛ آن لمبتن،تاريخ ميانه ايران،٢٤٢.

[498] ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص ص١٨٩-١٩٠.

[499] بۆ نموونە بڕوانە: مسكويه،تجارب الأمم،ج٥،ص٣٩٢.

[500] ئەگەر بارودۆخی گشتی وڵات هەوێنی هۆنراوەی هۆزانڤانان و دەربڕی واقعی کۆمەڵگاش بێت،ئەوا بەزەقی ئەو ڕەوشەی چاخەکانی ناوەڕاست لە هۆنراوەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوەو ئاخ و پەژارەی خۆیان لەدەست چەپگەردی گەردوون و ڕۆژگاری ڕەش دەربڕیوە، (بڕوانە: أحمد كمال الدين، السلاجقة،ص ص١٩٦-٢٠٣) ؛ لەم بارەیەوە عومەری خیام کە هاوسەردەمی بەشێك لەو ڕۆژگارە بووە، لەچوارینەیەکیدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| جارجارە پەنا بۆ مەی دەبەم و ناچارم | غەمبارم و پێم دەڵێن کە تاوانبارم |
| خۆزگە وەکو مەی درۆ و دزیش مەستی ئەکرد | مەردێکم دەویست بیگوتایە هۆشیارم |

چوارینەکانی خیام،هەژار کردویەتیە کوردی،(تهران:١٣٦٩ش)،ل٢١.

[501] بۆ نموونە بڕوانە ئابن الأثیر،الکامل،ج٧،ڕووداوی ساڵەکانی(٣٨٤و٤١٧و٤١٨و٤١٩و٤٢٣و٤٢٦و٤٨٦..)کۆچی.

میر(بدر)ەوە، بۆ پاراستنی ڕێگاکان لە مەترسی ڕێگران[502]، لەم بارەیەوە بەڵگەیەکی دیار بێت.

---

[502] الروذراوري،ذيل تجارب الامم ،ج٦،ص١٧٢؛ابن تغري بردي،النجوم الزاهرة،ج٤،ص١٦٩.

## باسی دووەم / شوێنەوارە کەلتوری و فەرهەنگیەکان:

لایەنی کەلتوری و فەرهەنگی وەك سەرجەم لایەنەکانی دی کەوتۆتە ژێرکاریگەری لەشکرکێشی هێزەدەرەکیەکان و شوێنەواریان بەسەریدا بەجێهێشتووە، وەك دیاردەیەکی باوی نـاو مێژوو، کۆمەڵگاکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری یەکتری و فێربوون و فێریانکردوون، لاسایی کراونەتەوەو لاساییان کردۆتەوە، بەخشیویانەو وەریانگرتووە، بەواتایەکی دی کارلێککردنی کەلتورەکان دیاردەیەکی کۆنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیە[503]، رێگاو شێوازی ئەو بەریەککەوتنەش جۆراوجۆرن ئەگەر هاوسنوری و نزیکی نەتەوەکان لەیەکتری، کاریگەری داگیرکەر بۆسەر داگیرکراو، بەپێچەوانەشەوە، یاخود کاریگەری دەوڵەتێك بۆ سەر دەوڵەتێکی دی و سەرکردە بۆسەر گەلەکەی لەو رووەوە لەبەرچاو بگرین[504]، ئەوا بەشێکیان لەگەڵ ئەو مەبەستەی ئێمەدا دێنەوە، چونکە کورد بەهەر رێگایەك لەو رێگاو شێوازانە کەوتۆتە ژێر کاریگەری کەلتور و فەرهەنگی هێزە داگیرکەرەکان، بەپێچەوانەشەوە هەروەك (کەمال مەزهەر) دەڵێ: ((کورد هەم کاری تێکراوەو هەم کاری کردۆتە سەریان))[505]، بەڵام ئاست و چەندیەتی کاریگەری و کارلێککردنەکەو قبوڵکردن و نەکردنەکەشی بەکورد خۆشیەوە پەیوەندی هەیە، سەرباری لایەنە باش و خراپەکانی کە بەتێکرا جێگای مەبەستی ئێمەن.

---

[503] کریم جبر الحسن، عملیة نهوض الحضاري، ص٢٤.

[504] کریم جبر الحسن، عملیة النهوض الحضاري، ص٢٥؛کەمال مەزهەر، مێژوو، ل١٠.

[505] مێژوو، ل١٠.

## یەکەم/ زمان:

زمان وەك بنەمایەکی سەرەکی نەتەوەو هۆکارێك بۆ ناسینەوە و جیاکردنەوەی لە میللەت و نەتەوەکانی دیو لە یەکگەیشتنی شارستانیەتەکان، یەکێکە لەو لایەنە گرنگانەی کە لە ئەنجامی پرۆسەی لەشکرکێشیەکان و ئەو کارەسات و نەهامەتیانەی بەسەر کوردستان هاتووە، لەگەڵ بەریەککەتن و ئاوێتەبوونی کەلتورەکان کاری تێکراوە، لەژێر سایەی دەسەڵاتی هێزە دەرەکیەکان (زمانی عەرەبی و فارسی) گەشەکردنی گەورەیان بەخۆوە بینیووە[٥٠٦]، بەهۆی ئەوەش کە ئەوان زمانی سەرەکی نووسین و خوێندەواری و مامەڵەو نووسینی قەواڵەکان و سەوداو بازرگانی بوون، بەشێوەیەکی بەربڵاو لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بڵاوبوونەوە و لەبەرامبەریشدا زمانی کوردی لەنێو ئەو شارستانیەتەدا بەگۆشەگیری ماوەتەوە[٥٠٧]، هەروەك (یاقوت الحموی) دەربارەی دانیشتوانی هەولێر دەڵێ: ((اکثر اهلها اکراد قد استعربوا))[٥٠٨]، کە دیارە مەبەستی بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبیە نەك دانیشتوانەکەی بەعەرەب کرابن.

تێکەڵاوبوونی زمانەوانی وەك بەرئەنجامێکی بەریەککەوتنی کورد و ئەوانی دی بوو بە دیاردەیەك کە تائێستاشی لەگەڵدابێ شوێنەواری بەسەر زمانی کوردییەوە ماوە، هەندێك لە زاراوەکان بەشێك لە ئاخاوتنی خەڵکن، (بارتولد) لە باسکردنی سەلجوقیەکان و کاریگەری زمانەکەیان لەسەر ناوچەکانی کوردستان ئاماژەی بەوەداوە، کە زمانەکەیان (تورکی) بڵاوکردۆتەوە بەتایبەت لە ناوچەکانی ئاران و

---

(٥٠٦) ذبیح الله صفا،تاریخ ادبیات ایران،ج١،ص١٩٣؛عبدالعظیم رضایی،تاریخ ده هزار ساله ایران،ج٣،ص٢١٠.

(٥٠٧) بەدرخان سندی، کۆمەڵگای کوردەواری، ل٥١٦؛زرار صدیق توفیق،زمانی کوردی لەسەدەکانی ناوەراستدا،گۆڤاری زانکۆی دهۆك،پەربەندی(١١)،ژمارە(١)،ساڵی ٢٠٠٨ز،ل٩٦.

(٥٠٨) معجم البلدان، ج١، ص١٣٨.

ئازربیجان[509] ، هەر لەم بارەیەوەو لەسەرچاوەیەکی دیدا هاتووە، کە هـۆزە تورکـەکان لـە هـەردوو هـەرێمی نـاوبراودا قـەراریان گرتـووەو نیـشتەجێبوون[510] ، لـە دەسـت بەسەرداگرتن و بـەتورك کردنیـشیدا خۆیـان نـەبوارد[511] ، بـەمجۆرە وردە وردە زمـانی تورکی لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە و لە جیاتی زمانـەکانی دی بـوو بـە زمـانی ئاخـاوتنی خەڵك، دوای هێرشەکانی مەغۆل و کۆچی زیاتری هۆزە تورکەکان بەتایبـەت هـەرێمی ئاران سیمایەکی تەواو تـورکی وەرگـرت[512] ، ئەمـەش دەکرێـت بکرێتـە بەڵگەیـەك لەسەر بە تورك بوونی[513] ، کە تاکو ئەمڕۆش هەست بەکاریگەری ئەو بارودۆخـە لـە ناوچـەکەدا دەکرێـت، هـەر لەمبارەیـەوە هـەولێر نموونەیـەکی تـرە کـە بـەهۆی نیـشتەجێبوونی تورکمـان تێـدا و تێکـەڵاوبوونیان لەگـەڵ کۆمەڵگـەی کوردیـدا زمانەکەشیان بە بەربڵاوی بڵاوبۆتەوە, وەك زمانی روشنبیریش رۆڵی خۆی لـە مێـژووی ئەم شارەدا گێڕاوە[514] .

بەدوور نازانرێت کە ئەو کەوتنە ژێر کاریگەریە و بڵاوبوونەوەی زمانەکەشیان لـە چوارچـێوەی پـەیڕەوکردنی سیاسـەتە مەرکەزیەکـەی سـەلجوقیەکاندا لێکبدرێتـەوە، بەتایبەت هەوڵەکانی(نظام الملك) بۆ ئاوێتـەکردنی میللـەتانی ژێـر دەسـەڵاتیان، کـە خاوەن کەلتور و فەرهەنگی جیاوازبوون، بەئامانجی یەکخـستنی دەوڵـەت و بنیادنـانی

---

[509] تاريخ الترك في اسيا الوسطى، ص١٢٨.

[510] منجم باشى،جامع الدول،ص٢٧٠.

[511] فراى،عصر زرين فرهنگ ايران،ص٢٤٤.

[512] فراي، مادة (اران)، دائرة المعارف الاسلامية، ج٢، ص٥٧٢.

[513] وەك توێـژەرێك یاداشـتی کـردووە کـە کوردەکـانی ئـاران ئێـستا تـورك زمـانن و تـەنها هۆزەکـانی (زنگەزور وجەلالی وشیلانلو کە هەزار خێزان دەبـن) بـەزمانی کـوردی قـسە دەکـەن، بڕوانـە: محمـد جـواد مشكور،نظرى به تاريخ اذربيجان،چاپ دوم،(تهران:١٣٧٥ش)،ص٢٥.

[514] علي عادل حسين، أربل، ص٢٧٥.

شارستانیەتێکی یەکگرتوو لەسەر بنەمای ئارەزووی یەکێتی جیهانی ئیسلامی، کە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیان کاریان لەسەرکرد[515]، لەسەردەمی سوڵتان (ملکشاه)و بە لێوەشاوەیی وەزیری ناوبراو ئەو ویستە تارادەیەکی زۆر بەرجەستەبوو، بەلام لەبەرئەوەی ئەم یەکێتیە لەسەر بنەمای تێکگەیشتن و هاودڵی و ڕێزگرتن لە ئیرادەی نەتەوە جیاوازەکان بنیاد نەنرابوو، کوژرانی وەزیرو مردنی سوڵتان لەساڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز)[516]، نەك تەنها یەکێتیەکە هەڵوەشایەوە، بەڵکو جیهانی ئیسلامیش پارچەپارچەبوو[517].

کۆچی مەغۆلەکان و ڕەگەزەکانی دیکەی تورك بۆ ناوچەکانی ئێران و کوردستان، دەروازەیەکی دی بوو بۆ تێکەڵاوبوونی کەلتوری و فەرهەنگی بەڕووی ئەوان و فارس و کورددا کرایەوە و کەوتنەژێر کاریگەری یەکتری[518]، بەهۆی نیشتەجێبوون و تێکەڵاوبوون و پەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوانیان بەشێك لە زاراوە مەغۆلیەکان هاتنەناو زمانی کوردی، لەم بارەیەشەوە (مینورسکی) ئاماژەی بەوە کردووە کە چەندین وشەو زاراوە بنچینەو بنەماکەیان دەگەڕێتەوە سەر ناوەمەغۆلیەکان[519]، گەڕاندنەوەو

---

[515] حسن محمود، العالم الاسلامي، ص ص٤٢٠-٤٢١.

[516] الحسيني، زبدة التواريخ، ص١٤٠؛اليافعي، مرآة الجنان، ج٣، ص١٠٣؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٥، ص١٣٤.

[517] الراوندي،راحة الصدور،ص٢١٩؛البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق،ص٨١؛عبدالمنعيم حسنين، سلاجقة، ص٨٣.

[518] عبدالامير الرفيعي،العراق ،ص١٥٥.

[519] مینورسکی ناوی چەندین شوێن و زاراوەی کە بنچینەکەیان دەگەڕێتەوە سەر ناوە مەغۆلیەکان هێناوە لەبەر زۆرییان ئێمە تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، کۆی ئەو ناوانەی لە وتارێکدا بەناوی ناوە مەغۆلیەکان لە کوردستانی موکریان بڵاوکردۆتەوە، کەئێستا لە چوارچێوە کتێبێك لەگەڵ چەند وتارێکی دی بڵاوکراونەتەوە، بەناوی کۆمەڵەی شەش وتار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، (هەولێر:٢٠٠٢ز)،ل ل٣٦-٦٧.

پەیوەستکردنی ناوی چەندین شوێن و ناوچەو ڕووبار و گوندو چیا بەزاراوەی مـەغۆلی، بەڵگەیـەکی دیـاری شـوێنەواری مەغۆلـەکان دەخەنـە ڕوو، بـۆ نموونـە (چـۆمی چەغەتوو[٥٢٠]، لوتکەی چۆغانتوو[٥٢١] و تەرەغ[٥٢٢] و ناوی گادەر و چەغان و بووکـان (بۆکان)و ئەختاچی و تەتەهوو و سونجاق و چەلیك و کۆندەلان و سولدووز...هتد[٥٢٣]).

نووسینەوەی مێژوو ئامرازێك بووە بۆ بڵاوبوونەوە و تێکـەڵاوبوونی چـەندین وشـە و زاراوەی دی[٥٢٤]، کە تاکو ئەمڕۆش لە بواری کارگێڕی و سەربازیدا بەکاردێن، لەوانـە زاراوەی یاسا کە لە وشەی (یاسق یان یاسـا)ی مەغۆلیـەوە هـاتووە[٥٢٥]، لـە زمـانی کوردیدا لە جێگای ڕێوشوێنی ناو کۆمەڵ یان دام و دەستور بەکاردێت، وە یـان زاراوەی (کێشکچی-ئیشکر) وەك ئەرکێکی سەربازی مەغۆلی[٥٢٦]، بەئەرکەکەشیەوە خراوەتە

---

[٥٢٠] چۆمی چەغەتوو بەدرێژایی (٢٤٠کم) لە کێوەکانی چل چەشمە هەڵدەقوڵێ لە سـنوری شاری سەقز لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەفارسی (زرین روو)ی پێدەوترێت بەکوردیش بە (زێڕین چـۆم) ناسـراوە، الهمـذاني، جـامع التـواريخ، ج٢، ق١، ص٣٣٧، عـەلی ئەصـغەری هەمـەدانی، جوگرافیـای کوردسـتانی ئێـران، (بغداد:١٩٨٠)، ل١٤.

[٥٢١] هەردوو ڕوباری سابلاغ و لاجان لێك دادەبڕێـت و لەچـەغانی مـەغۆلییەوە وەرگـیراوە کـە بـەمانای سپی دێت، واتە دەبێتە لوتکەی خاوەن ڕووەکی سپی، ئەو شوێنەش ڕووەکی لەجۆرەی زۆرە، مینۆرسـکی، کۆمەڵەی شەش وتار، ل ل٤٦-٤٧.

[٥٢٢] ناوی لوتکە شـاخێکی باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مهابادەو لەناوی (تەرغا)ی کـورە بـچوکی هۆلاکـۆ وەرگیراوە کە بە مانـای سـەری بـێ تـوك دێـت و لەگـەڵ پێکهاتـەی سرووشـتی لوتکەکـەش گونجـاوە کـە ڕووتەنە،النويري نهاية الأرب،ج٢٧،ص٢٦٧؛مینـورسکی، کۆمەڵەی شەش وتار، ل٤٧.

[٥٢٣] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مینورسکی،کۆمەڵەی شەش وتار،ل٣٧ ئەوانی دواتر.

[٥٢٤] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص٥٠٥.

[٥٢٥] القلقشندي،صبح الاعـشى،ج٤،ص٣١٤؛فـؤاد عبـدالمعطي الـصياد المغـول،ص٣٣٨؛ آن لـمبتن،تـاريخ ميانه ايران،ص٤٠٢.

[٥٢٦] فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص٣٥٩.

ناو زمانی کوردییەوە، کـە بـەمانای ئاگـادارکردن و ئاگـاداربوون و پاسـەوانی دێـت، لەبەرامبەر وشەی (پاس) کە وشەیەکی تورکی سەردەمی سـەلجوقیەکانە[٥٢٧]، دەشـێ هەر لەڕێگەی ئەوانیشەوە هاتبێتە ناو فەرهەنگی کوردیەوە، کە بۆ هـەمان مەبەسـت بەکاردێت[٥٢٨].

هاونەرێتبوونی مەغۆل و کورد لە هەندێ ئیش وکـار و شـێوازەکانی ژیانیـان ئـەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەی کە لەگەڵ کورد دا دروسـتیانکرد، ڕێگەیـەکی دی بـوو بـۆ تێکەڵاوبوونی هەندێ لەو زاراوانە بۆنموونە وشەی (قشلاق- قشلاخ)ی مـەغۆلی[٥٢٩]، لەناو هۆزە ڕەوەندەکان بەتایبەتی لە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان بڵاوبۆتـەوە تـا ئـەمڕۆش بەکاردێت لەبری مانای زستانەوار، وەناوی شوێنێکیشە لە سنوری شاری سنە[٥٣٠].

هەر بەهۆی بەشـێك لـە لەشکرکێـشیەکان بەتایبـەت مەغۆلـەکان، بەشـێك لـە هۆزەکانی گەلانی ئـالان (الـلان)[٥٣١]یـش بـەرە و ناوچـەکانی قـەوقاز و کوردسـتان پەڕیونەوە و تێکەڵبوونیشیان لەگەڵ کورددا وایکردووە، کـە بکەونـە ژێـر کاریگـەری یەکتری و شوێنەواری ئەو بەریەککەوتنەشیان بەتایبەت لەسـەر زمانیانـدا بەئاشـکرا دەرکـەوتووە، بازرگـانی و سـەوداو مامەڵـە و پەیوەندیـەکانی دی وەك هاوسـەرگیری

---

[٥٢٧] ذبیح الله صفا، تاریخ ادبیات ایران، ص١٩٧.

[٥٢٨] هەژار، هەنبانە بۆرینە، ل٩٨.

[٥٢٩] عباس اقبال،تاریخ ایران،ص٣٨٧؛آن لمبتن،تاریخ میانه ایران،ص٣٩٦.

[٥٣٠] هەژار، هەنبانە بۆرینە، ل٥٥٥.

[٥٣١] گەلانی وڵاتـی ئـالان وشـیروان دەگرێتـەوە کـە پێکهـاتوون لـە (ئەرمـەن و ڕوس وخـزر وتـورك...)، ناوچەکەشیان دەکەوێتە سنوری باکوور و ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بەشی زۆری ئـەم نەتەوانـە لەسـەر ئـایینی مەسـیحی بـوون، بڕوانـە: المـسعودي، مـروج الـذهب، ج١، ص١٦٧؛یـاقوت الحمـوی،معجم البلدان،ج١،ص ص٢٤٥-٢٤٦.

هۆكارێكی دیكەی ئەو تێكەڵاو بوونەن[٥٣٢]، زاراوەی (ئالان) وەك چەمكێكی جوگرافی لە كوردستان بڵاوبۆتەوە تاكو ئەمڕۆش چەندین شوێن بەم ناوە ناونراون[٥٣٣]، هەرلەسەر ئەو بنەمایەش دەشێ (ئالان ) كە شارێكی گەورەو ناووهەواخۆش و دڵڕفێن بووە لەوناوە وەرگیرابێت، كە یەكێك بوو لە شارەكانی سەر بە هەرێمی كارگێڕی كوردستان لەسەردەمی مەغۆلەكاندا[٥٣٤]، هەروەها لە هەرێمی دەرسیمی باكووری كوردستانیش لەنێو كوردانی زازا (ئالان) وەكو ناوی هۆزێكی كوردەواری نێودار دەركەوتووە[٥٣٥]، وەناوی هۆزێكی ناوچەی لوڕستانیشە[٥٣٦]، سەرەڕای هەموو ئەوانەی باسكران ئالان وەك زاراوەیەك خۆی خزاندۆتە ناو كەلتور و فەرهەنگی میللی كورد و لە زەینی خەڵكدا شوێنەواری جێهێشتووەو تاكو ئەمڕۆش ئامادەیی خۆی پاراستووە، دەشێ وەك ناو بۆ ناونانی منداڵان كە بەزەقی و بەشێوەیەكی بەرفراوان دێتەبەرگوێ ڕاستی ئەو قسەیە بسەلمێنی[٥٣٧]، شایانی ئاماژەبۆكردنە كە بەهەمان شێوە ئالانیەكانیش كەوتوونەتە ژێر كاریگەری زمانی كوردی[٥٣٨]، بەشێك لەوانە كە بەرەو

---

[٥٣٢] توفیق سلطان الیوزبکي، الثغور ودورها، ص٣١.

[٥٣٣] ئالان ناوچەیەكی سنوری نێوان ئێران و عێراقە لەسنوری قەزای سەردەشت گوندێكی ناوچەكەیە، لە باشووری شاری سلێمانی و لە ناوچەی شارەزووریش ناوچەیەك بەم ناوە هەیە، ئەمانەو چەندین ناوچە و گوند و ڕووباری دی، جەمال ڕەشید، بەیەكگەیشتنی كوردو لان، ل١٤٦.

[٥٣٤] حمدالله مستوفی، نزهه القلوب، ص١٠٧؛ علی اصغر هەمەدانی، جوغرافیای كوردستان، ل٢٨.

[٥٣٥] جەمال ڕەشید، بەیەكگەیشتنی كوردولان، ل١٤٦.

[٥٣٦] حمدالله مستوفی،تاریخ گزیده،ص٥٥٠؛ بدلیسی،شەرەفنامە،ل٥٦.

[٥٣٧] الفارقي ئاماژەی بەوە كردووە كە ملكشاه ناوی سنجەری كوڕی بەناوی شاری سنجاری كوردییەوە كردووە، دەكرێت ئەمەش بەجۆرێك لەكاریگەری دابنرێت، تاریخ الفارقي، ص٢٨٧وەبڕوانە: حمدالله مستوفی،تاریخ گزیده،ص٤٣٥.

[٥٣٨] هەر لەئەنجامی ئەوكارتێكردنە سوڵتانەكانی سەلاجقەی ڕۆم ناوی سەركردەكانی دەوڵەتی ماد یان وەك شكۆمەندی و شانازیكردن و سەرسامبون بەگەورەیی و دەسەڵاتیان لە منداڵەكانیان ناوە وەكو

ولاّتی کورد کۆچیانکردووه لەبەرئەوەی کەمینەبوون لەناو بۆتەی کۆمەڵگای کوردیدا بەتێپەڕبوونی کات تواونەوە و زمانی ڕەسەنی خۆیان لەبیرکردووە وەك چۆن (ئەرمەن)ەکانی ناوچەی بەتلیس بەزمانی کوردی دەدوێن[٥٣٩].

لەبەرئەوەش کە توندی و سستی ئەم کارتێکردنە بە چلۆنایەتی جوگرافی و شوێنی نیشتەجێبوون و پەیوەندی کۆمەلاّیەتی ئەوان لەگەڵ خەڵکدا پەیوەستە، کاریگەری ئەو ڕەوشە بەیەك ئاست کاری لەزمانی هەموو خێڵ و ناوچە و شارەکان نەکردووە، بۆیە دەبینین ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستان بەهۆی تێکەلاّوی زۆر و نزیکییان لە مەڵبەندی فەرمانڕەوای ئیلخانی زیاتر لەناوچەکانی دی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەوان، کارتێکردنەکە لە زمانی خەڵکی شارو شارنشینان و سەر ڕێگا سەرەکییەکانی پەیوەندی نێوانیان و نزیك کەوشەنەکان زیاترە وەك لە دانیشتوانی گوندو شوێنە سەخت و چیانشینان[٥٤٠]، ئەمەش لەبەرئەوەی لادێ نشینەکان کۆمەڵی داخراون و زۆر بە کەمی کەلتوری بێگانە قبوڵ دەکەن و کەمتر دەکەونە ژێر کاریگەری دەرەکییەوە[٥٤١]، ئەوە سەرباری نزمی ئاستی پەیوەندی کۆمەلاّیەتیان لەگەڵ شارەکاندا، بۆیەشە زمانەکەیان بەپاکی و ڕەسەنایەتی ماوەتەوەو تێکەڵ بەزاراوەی بێگانە نەبووە، تا ئێستاش تەنها لەو ناوچانەی کەمتر کەوتونەتە ژێر کاریگەری هێزی بیانییەوە وشەی ڕەسەن و سادەی کوردیمان دەست دەکەوێت، وەکو ناوچە

---

(کیکاوس و کیخسرۆ و کەیقباد...) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالشافي المغربي، اسیا الصغری فی العصور الوسطی،دار الوفا،(اسکندریة:٢٠٠٥م)، ص٣٦٨.

[٥٣٩] مینورسکي، الاکراد، ص٣٢.

[٥٤٠] عەلی ئەصغەر هەمەدانی، جوگرافیای کوردستان، ل٥٤؛ زرارصدیق، زمانی کوردی لەسەدەکانی ناوەراستدا،ل٩٦.

[٥٤١] جرجي زيدان، تاريخ تمدن الاسلامي، مج٢، ج٣، ص٤٧٤.

دەوارنشینەکانی هەورامان و مەریوان و ناوچە شاخاویەکانی دیکەی کوردستان[٥٤٢]، بەم شێوەیە گوندەکان تەنها ڕۆڵی پاراستنی زمانی ڕەسەنی کوردیان نەبینی، بەڵکو ڕۆڵی پاراستنی ئەدەبیاتی زارەکی و دابونەریت و ئەو جلوبەرگانەشیان بینیوە، کە ناسنامەو کەلتوری تایبەتی کوردیان پێکهێناوە[٥٤٣].

هاتنە ژوورەوەی زاراوەی زمانە دەرەکیەکان بۆ ناو زمانی کوردی، کاریگەری و شوێنەواری خراپی لەسەر ئەو زمانە بەجێهێشتووە، ڕەنگە هەر ئەو بارودۆخە سیاسیەی کە لە بەرئەنجامی لەشکرکێشیەکان کەوتۆتەوە، جڵەوی دەسەڵات کەوتۆتە دەست هێزە داگیرکەرەکان و زمانی ئەوانیش بۆتە زمانی فەرمی و زمانی کوردیش پەراوێز خراوە و لەناو ئەو شارستانیەدا گۆشەگیرکراوە، لەبەر ئەو کارتێکردنە خراپەی زمانە بێگانەکانیش بەشێوە زمانێکی نارێکی فارسی یان عەرەبی دراوەتە قەڵەم[٥٤٤]، ئەگەر چی نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی نەبووە، بەڵام ئەمە بەڵگە نیە لەسەر نەبوونی زمانەکە، بەڵکو هۆزو خێڵە کوردەکان بە زمانی کوردی دواون[٥٤٥]، ئەوەندە هەیە لەئەنجامی ئەو تێکەڵاویەدا قوربانیی بە چەندین وشەو زاراوەی ڕەسەن دراوە و وشەی بیانی جێگایانی گرتۆتەوە، ئەمەو سەرباری لاوازبوونی زمانەکە تەنانەت زاناو خوێندەوارانی کوردیش هۆگری زمانی بێگانەبوون و هەر بەو زمانەش سەرچاوەو بەرهەمەکانیان نووسیوە، ئەمانە و هۆکاری جوگرافیش لەپاڵیاندا بوونەتە ڕێگر لەبەردەم دروستبوونی زمانێکی یەکگرتووی کوردی، بەواتایەکی دی زۆری شێوە

---

[٥٤٢] عەلی اصغری هەمەدانی، جوگرافیای کوردستان، ل٥٤.

[٥٤٣] فلیپ کرینبروك و کریستیەن ئالیسون،کولتورو ناسنامەی کورد،چاپخانەی خانی،(دهوك:٢٠٠٨ز)،ل٢٩.

[٥٤٤] بەدرخان سندی کۆمەڵگای کوردەواری، ل٥١٨؛ فؤاد حمة خورشید، اللغة الكردية التوزيع الجغرافي للهجاتها،مطبعة الوسام،(بغداد:١٩٨٣م)،ص٩.

[٥٤٥] المسعودي،مروج الذهب،ج٢،ص١٠٧.

زمانەکان تارادەیەك بەپەیکی دابەشکراوە سیاسیەکان دەزانرێت[٥٤٦]، هەشە ئەمە بەکارێکی سروشتی دەزانێت بۆ گەلێك کە زۆر بڵاو و خاکەکەی سەخت بێت و زمانی نووسراوی نەبێت[٥٤٧].

## دووەم/ زانست و فێربوون:

بواری زانستی وەك هەر لایەنێکی دی کەوتۆتە ژێر کاریگەری سیاسەت و لەشکرکێشی هێزە دەرەکیەکان، بەڵام ئاستی کارتێکردنیان جیاوازە، سەدەی(چوارەمی کۆچی/دەیەمی زاینی ) لە مێژووی ئیسلامیدا بەسەردەمی زێڕین و بوژانەوەی زانستی ناودەبرێت، کە سەردەمی داگیرکاری بویهیە[٥٤٨]، بەڵام مەرج نیە ئەو بوژانەوە هزریە لەژێر سایەو بەهۆی بایەخدانی ئەوانەوە هاتبێتەدی، چونکە بویهییەکان کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی دووربوون لە ڕۆشنبیری ئیسلامی و هیچ شارەزاییەکیان تەنانەت لەسەر زمانی عەرەبی وەك زمانی ئاین نەبوو، میرە پێشینەکانیشیان ئەو زمانەیان نەدەزانی[٥٤٩]، بایەخدانیشیان بەزانست زیاتر لەچوارچێوەی هەستی مەزهەبگەری و بەشیعەکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی سەرچاوەی گرتبوو[٥٥٠]، (عضد الدولة)تەنها میرێکە کە بایەخی زۆری بەم بوارە داوە ، بۆئەمەش بەردەوام لە کۆڕو

---

[٥٤٦] فؤاد حمة خورشيد، اللغة الكردية،ص٢٨؛ شاكرخصباك، الاكراد، ص٤٨٠.

[٥٤٧] فلیپ کرینبروك، کولتورو ناسنامەی کورد،ل٣٤.

[٥٤٨] رشاد بن عباس معتوق،الحياة العلمية في العراق خلال العصر البويهي،سلسلة الرسائل العلمية الموصى بطبعها،(مكة المكرمة:١٩٩٧)، ص١٠٢.

[٥٤٩] ادم متز، الحضارة الاسلامية، ج١، ص٥٢؛ فرای،عصر زرين فرهنگ ايران،ص٢٢٨.

[٥٥٠] رشاد معتوق، الحياة العلمية في العراق خلال العصر البويهي، ص١٠٤.

کۆبوونەوەکانیدا بانگهێشتی زانار شارەزاو وێژەزانانی کردووە[551]، لەژێر سایەی دەسەڵاتی بوەیهیەکاندا پێشکەوتنێکی وابەسەر باروودۆخی زانستی کوردستاندا نەهاتووە، بەڵکو ئەوسیاسەتە شەڕانگێزو شەڕ وئاژاوانەی لەسەردەستی ئەوان ڕوویانداوە بوونەتە مایەی پەکخستنی دامەزراوە ئایینیەکان، کە تائەوکات مەڵبەندی فێربوونی زانست و خوێندەواری بوون و کاریگەری خراپیشیان لەسەر باروودۆخی گشتی بەجێهێشتووە[552].

لەلایەکی دیکەوە دەسەڵاتی کارگێڕی لەو سەردەمەدا بەدەست میرنشینە کوردیەکان بوو، ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەو بوارەشدا ڕوویانداوە بە سیاسەت و ئارەزووی میرەکوردەکانەوە پەیوەستبووە، بەتایبەتیش ئەوانەی کە پێشکەوتنی ناوچەکەیان لەبەرچاوگرتووە، بەنموونە مەڕوانیەکان[553]، بەمەش میرنشینەکان ڕۆڵێکی دیاریان لە پێشخستنی شارستانی ئیسلامیدا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا گێڕاوە، وەك بەشێك لەو شارستانییەتە پشکی ئەو پێشکەوتنەیان بەرکەوتووە، بەڵام بە لەناوچوونی میرنشینەکان ڕۆڵی کورد لە چوارچێوەیەکی تەسکترو بەشێوەی ئاست و توانای تاکەکەسی بەهەڵگری پاشگری ناوی بنەماڵەو هۆز و ناوچەو شار دەرکەوت، وەك ڕۆڵی شارەزوورییەکان و هەکاریەکان یان گۆرانی یان ئامەدی و ئەربیلی...هتد، هەندێك لە زانایانیش وەك سمبولێکی نەتەوەیی پاشگری کوردی (الکردی)یان بەناوەکانیانەوە لکاندووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە شارستانیەتی پێویستی بەدەسەڵاتی (دەوڵەت) هەیە تابیبێتە هەڵگری مەشخەڵەکەی و پارێزگاریشی لێبکات هەروەك چۆن

---

[551] الاربلی،خلاصة الذهب المسبوك،ص٢٦٠؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٦٢.

[552] مريزن سعيد مريزن، الحياة العلمية في العراق في العصر السلجوقي،مكتبة الطالب الجامعي،(مكة المكرمة:١٩٨٧م)،ص٥٢.

[553] اكو برهان محمد، الحياة العلمية في دياربكر وجزيرة ابن عمر من القرن (٥-٧ه)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية اداب جامعة الصلاح الدين،(اربيل:٢٠٠٠م)،ص٤١.

(ابن خلدون)بەردەوام بوون و مانەوەی شارستانیەتی بە دەوڵەتەوە پەیوەست کردووە و لەبەریەکترازان و هەڵوەشانیشی بە شکستی شارستانی داناوە[554].

لە سەردەمی سەلجوقیەکان (447-590ك/1055-1198)دا وەرچەرخانێکی گەورە بەسەر بزوتنەوەی زانستی و ڕۆشنبیریدا هات، بەجۆرێك بەسەردەمێك لە سەردەمە زێڕینەکانی پێشکەوتنی زانستی و فەرهەنگی لە مێژووی ئیسلامیدا دانراوە[555]، پێشەنگ و ئەندازیاری ئەو پێشکەوتنەش (نظام الملك) بوو[556]، کە هەنگاوە یەکەمەکانی بەکردنەوەی قوتابخانە (زانستگە)ی (نظامیة) لە بەغدا لە ساڵی 457ك/1064از دەستپێکرد[557]، ساڵی (459ك/1066ز) بیناکردنی تەواو بوو دەستکرا بە کاری وانە وتنەوە تیایدا، هەموو پێداویستیەکانیشیی لەلایەن دەوڵەتەوە بۆدابینکرا و هەر بەناوی (نظام الملك)شەوە ناونرا[558].

کردنەوەی قوتابخانەکانی (نظامیة) وەرچەرخانێکی گەورەی لە مێژووی شارستانی ئیسلامیدا هێناکایەوە، کە وایکرد سەردەمەکەی دوای خۆی سروشتێکی جیاواز لەپێش خۆی وەربگرێت و ئەوگۆڕانەش بەدرێژایی چوار سەدە کاریگەریەکەی بەردەوام

---

(554) مقدمة، ص405؛ وەبڕوانە: هاشم يحى الملاح، المفصل في فلسفة التاريخ، ص147.

(555) مرتضى راوندى،سير فرهنگ وتاريخ تعليم وتربيت در ايران واوربا،چاپ نوبهار،چاپ٤،(تهران:1383ش)،ص91.

(556) بۆ زانیاری لەسەر لایەنی زانستی لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا بگەڕێوە بۆ: مريزن سعيد مريزن، الحياة العلمية في العراق في العصر السلجوقي.

(557) الطرطوشي، سراج الملوك، ج2، ص516؛ابن الجوزي، المنتظم، ج8، ص238؛ابن كثير، البداية والنهاية، مج6، ج12، ص229.

(558) الطرطوشي، سراج الملوك، ج2،ص517؛اليافعي،مرآة الجنان،ج3،ص64؛مرتضى راوندى،سير فرهنگ وتاريخ تعليم،ص76.

بوو[٥٥٩]، بەمەش پایەکانی یەکەمین دامەزراوەی زانستی بەفۆڕمێکی نوێ لە مێـژووی ئیسلامیدا دامەزرا[٥٦٠].

هەرچەندە ڕای توێژەران لەبارەی دیاریکردنی هۆکارەکان و ئامانجەکانی دامەزرانـدنی قوتابخانەکانی(نظامیة) جیاوازە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی پەرەسەندنی مەزهەبی شیعە و بلاوکردنەوەی مەزهەبی (سنی) بەتایبەتیش مەزهەبی (شـافعی)[٥٦١]، بـەلام سەرباری ئەوانە ئامانجی گرنگ بلاوکردنـەوەی زانـست و زانیـاری و هۆشـیارکردنەوەی خەلك بەبنەما ئایینییەکان و پێگەیاندنی کادیرو پسپۆڕی لێهاتوو لەبوارە شـەرعی و ئایینیەکان و لایەنی کارگێڕی، دامەزراندنیان لە دامودەزگاکانی دەولەت لـە بەرچـاو گرتووە، لەم بارەیەشەوە سەرکەوتنی دیاری بەدەسـتهێنا و لـە نـزیکترین دەسـتکەوتی زانستی ئەوەبوو، کە هیچ شارو تەنانەت گونـدێك نـەما دادگـەرێك یـان وتاربێـژێکی دەرچـووی (نظامیـة)ی تیـدا نـەبێت[٥٦٢]، بەوپێیـەش بەشـێوە زانکـۆی ئـەمڕۆ چوێنراوە[٥٦٣]، دواتر بەشێوەیەکی بەرفراوانتر ناوچەکانی جیهـانی ئیـسلامی گرتـەوە، لەزۆربەی ناوچەکان قوتابخانـەی لـەم جـۆرە دروسـتکران و دانیـشتوان لـە پرۆسـەکە

---

[٥٥٩] ذبیح الله صفا،تاریخ ادبیات ایران،ج١،ص١٨١؛عبدالهادي محبوبة، نظام الملك، ص٤٠١.

[٥٦٠] السیوطي،تاریخ الخلفاء،ص٣٢٩؛حسین امین،تاریخ العراق في العصر السلجوقي،ص٢١٨؛مریزن سعید،الحیاة العلمیة،ص١٦١.

[٥٦١] مریزن سعید مریزن، الحیاة العلمیة في العراق، ٢٥٦؛شوقي ضیف،عصر الدول والامارات،ص٢٧٧.

[٥٦٢] الحنبلي، شذرات الذهب، ج٣، ص٣٥٠؛جرجي زیدان، تاریخ تمدن الاسلامي، ج٣، ص٢٢٠؛ایلسیف، الشرق الاسلامي، ص٣٥٨.

[٥٦٣] فریدون اسلام نیا،نگاهی بەتاریخ ایران،ص٥٦،ص٦٣.

بەهرەمەندتر بوون[٥٦٤] ، لە کوردستانیشدا بەدەیان قوتابخانە لەسەر ئەو شێوازە نوێیە بەناوی جیاجیا کرانەوە، هەروەك (ابوشامە)دەڵێ: ((هیچ وولاتێك لەو قوتابخانانە بێبەش نەبوو، تەنانەت جەزیرەی ئیبن عومەریش، کەئەمە گۆشەیەکە لەزەوی، گرنگیەکی ئەوتۆی پێنادرێت قوتابخانەیەکی گەورەی باشی تێدا دروستکرا، کە بەقوتابخانەی رضی الدین ناسراوە))[٥٦٥] ، کە رۆڵی دیاریان بینی لەبەرەو پێشبردنی رەوشی زانستی و رۆشنبیری، ئەوانەش کە جڵەوی دەسەڵاتی کوردستانیان بەدەست بووە لەدوای رووخانی میرنشینەکان لە (ئەتابەکیەکان وئەرتەقیەکان وئەیوبیەکان) لەونێوەندە بەشداربوون لەو پرۆسەیەدا[٥٦٦] ، بۆیە توێژەران کردنەوەی ئەو قوتابخانەو شێوەخوێندنە بە سەرەتای راستەقینەی ژیانی زانستی دەزانن لە کوردستاندا[٥٦٧] .

جێی ئاماژەیە کە کردنەوەی قوتابخانەکان لە کوردستان سەرباری سەرهەڵدانی شێوازی نوێی خوێندن[٥٦٨] ، پێگەیشتنی سەدان زانای لە بوارە جۆربەجۆرەکانی زانستدا لێکەوتەوە، ئەگەر سەرنجیش لە مێژووی دەرکەوتنیان بدەین، دەبینین بەشی هەرەزۆریان مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دوای کردنەوەی قوتابخانەکانی نظامیـة، دەشکرێت ئەمە بەزادەی پێشکەوتنی کۆمەڵگای کوردی لێکبدرێتەوە، بۆنموونە لە شارێکی وەك

---

[٥٦٤] الطرطوشي، سراج الملوك، ج٢، ص٥١٤؛الحسيني، زبدة التواريخ، ص١٤٢؛ابوالفداء، مختصر في اخبار البشر، ، ج٢، ص١٧؛مريزن سعيد مريزن، الحياة العلمية في العراق، ص٢٥٥؛سوادي الرويشدي، امارة الموصل، ص ص٢٠٢-٢٠٣.

[٥٦٥] روضتين في اخبار الدولتين، ج١، ق١، ص٦٢.

[٥٦٦] الماردينی،تاريخ ماردين،ص٦٠،ص٦٣، بۆزانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: اكو برهان محمد،الحياة العلمية في دياربكر،ص٨٣ ومابعدها.

[٥٦٧] فرهاد حاجي عبوش، المدينة الكردية، ص١٣٦؛ اكو برهان محمد، الحياة العلمية في دياربكر، ص٨٢.

[٥٦٨] جگە لەقوتابخانەکان مزگەوت وخەڵوەتگە وکەنیسە ودێرەکانی مەسیحیەکانیش رۆڵی دیاریان لەبڵاوکردنەوەی زانست وخوێندەواریدا گێڕاوە، بڕوانە: فرهاد حاجي عبوش، المدينةالكردية، ص١٢٨.

هـــەولێر چـــەند قوتابخانەیـــەك لەســـەر شـــێوەی (نظامیـــة) دروســـتکران، وەك قوتابخانە(القلعة) کە لە ساڵی (٥٣٣ك/١١٣٨ز) دروستکراوە و (شـیخ الخـضری بـن عقیل الاربلی)(م.لە٥٦٧ك/١١٧٢ز)یەکەم زانا بووە کەوانـەی تێـدا وتۆتـەوە[٥٦٩], وە قوتابخانـــەی(العقیلیـــة) کـــە هـــەر بـــەناوی زانـــای نـــاوبراوەوە ناســـراوە[٥٧٠], قوتابخانەی(المضفرية)ش کەلەلایەن سـەرداری هـەولێر مـضفرالدین کـوکبری (٥٨٦-٦٣٠ك/١١٩٠-١٢٣٢ز)دروستکراوە و لەسەر بنەمای هەردوو مەزهـەبی شـافیعی و حەنبەلی دەرزی تێدا وتراوەتەوە[٥٧١]، وە لەسەر هەمان شێواز مزگـەوت و فێرگـەکانی شارێکی وەکو دیاربەکر بەردەوام دەرسیان تێدا وتراوەتەوە و زانستی جۆراوجـۆری تێـدا خوێنراوە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیش مۆڵەت بەدەرچوانی دراوە[٥٧٢]، وە لەشاری سنجاریش زیاتر لە شەش قوتابخانە لەسەر هەمان شێواز دروستکران[٥٧٣]، کە دەکرێت هـەموو ئەمانـە بکرێنـە نموونـەی زۆر لەشـارەکانی دی کوردسـتان، کـە سـەرئەنجام بزوتنەوەیەکی زانستی وهزری دیاری لێکەوتەوە، بەم شێوەیە ئەگەر تا ئەوکات خەڵکی کوردستان بەمەبەستی وەرگرتنی زانست ڕوویان لە شوێنەکانی دی وەك بەغـدا و شـام ومصر کردبێت، ئەوا دوای ئەو کاتە زۆر لە شارە کوردیەکانیش بوون بە مەڵبەنـدێکی

---

[٥٦٩] ابن المستوفی،تاریخ اربـل،ج٢،ص٥٦٧؛ابـن خلکـان،ج١،ص٣٠٦؛عبـاس العزاوی،اربـل فـی مختلـف العصور،ص٣٩؛محسن محمد،اربیل فی العهد الاتابکی،ص٢٤٨.

[٥٧٠] ابن المستوفی،تاریخ اربل،ج١،ص١٥٩،ص٣٦٦؛ابن خلکان،وفیات الاعیان،ج١،ص٣٠٧؛امیدابراهیم جوزتلی،الحیاة العمیة فی اربیل،مطبعة رۆژهەلات،(اربیل:٢٠٠٨م)،ص٩٤.

[٥٧١] ابن خلکـان،ج٢،ص٢٩١؛الـذهبی،تاریخ الاسـلام(حـوادث٦٢١-٦٣٠ه)،ص٤٠٣؛سـامی بـن خمـاس الصقار،أربل،ص٩٥.

[٥٧٢] ئـەولیا چـەلەبی، سـیاحەتنامە، ل٤١، ل٤٤، ٤٥؛بڕوانـە: سـلام خوشـناو، جزیـرة ابـن عمـر، ١٤٨ ومابعدها.

[٥٧٣] بڕوانە: ابن شداد،الاعلاق الخطیرة،ج٣،ق١،ص ص١٥٦-١٥٧.

زانستی و کەسانی دی بۆ هەمان مەبەست ڕوویان تێدەکرد، بەهۆی پێگەیشتنی دەیان شارەزا و زاناو بوونی مەڵبەندی زانست[٥٧٤]، لە داوێنی ئەو گەشتە زانستیانەشدا شوێنەواری گرنگ لەبواری ئابووری و شارستانی و کۆمەلایەتی کەوتوونەتەوە.

ئەگەرچی کورد لەڕووی سیاسییەوە نەیتوانی بەرگەی مەیدانخوازی هێزە داگیرکەرەکان بگرێت و دەسەلاتی سیاسی لەدەستدا، بەلام لەپێناو مانەوەیدا بەجۆرێکی دی (استجابە)ی بەرامبەر ڕۆژگاری سەختی ژێردەسەلاتی بێگانەو ئەو ژینگەیەی هاتە ئاراوە پیشاندا، چونکە لەوجۆرە بارودۆخانەدا توانستەکانی بەهرەو داهێنانی مرۆڤ وەئاگادێن، تەنگانەو مەترسیش (شەڕ) هیممەت دەجۆشێنن وا لەمرۆڤ دەکەن زیاتر بیرکاتەوە[٥٧٥]، بەخۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخەکەو خۆتەرخانکردن بۆ بەرەوپێشبردنی بواری زانستی و شارستانی، بوونی خۆی لە پشکداری بەرچاو، ئەویش بەدەیان دادگەرو زاناو پسپۆڕی دیکەی بواری جۆراوجۆر لەچوارچێوەی (دەوڵەتی عەبباسی و ئەتابەکیەکان ومەمالیك)دا سەلماند[٥٧٦]، بەواتایەکی دی کورد بەر لەوکاتە لەتواناو شارەزایی خۆماڵی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی لاوازبوو، زیاتر پشتی بەکەسانی شارەزاو پسپۆڕی ڕەگەزی بێگانە دەبەست، ئەمەش زۆرجار شوێنەواری خراپی لێکەوتۆتەوە، کە دەکرێت بە هۆکارێکی لاوازی دەسەلاتی میرنشینەکان دابنرێت، بەلام دوای ئەو سەردەمە بەپێچەوانەوە کورد ڕۆڵی سەرکردایەتیکردن و پیشەنگیەتی و دادگەری و... بۆ ئەوانی دی گێراوە وەك ئاماژەمان پێدا، دەکرێت شوێنەوارەکانی ئەو ڕەوشەش بەدەسکەوتێکی کەم وێنە بزانرێت[٥٧٧].

---

[٥٧٤] لەم بارەیەوە بڕوانە: محسن محمد حسین،اربیل فی العهد الاتابکی،ص ص٢٥٦-٢٦٧؛سامی الصقار،أربل،ص ص٩٩-١٠٨.

[٥٧٥] دیورانت، دروس التاریخ، ص١٥٥.

[٥٧٦] قادر محمد حسن، اسهامات الكرد، ص٢٩٥.

[٥٧٧] الطرطوشي، سراج الملوك، صج٢، ص٥١٦.

دەرکەوتنی ئافرەت وەك دیاردە و بەرئەنجامێکی دی بەشێوەیەکی بەرچاوتر لە جاران لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی قوتابخانەکان، کە سەرەڕای پەخساندنی هەلی خوێندن لە قوتابخانەکانی (نظامیة) بۆیان، لە کردنەوەو دامەزراندنی مەڵبەندە زانستیەکانیشدا ڕۆڵیان بینیووە[٥٧٨]، لەو نێوەندەدا ئافرەتی کورد بەئەرکی دیاری خۆی هەستاوە، سەرباری بنیادنانی دەیان قوتابخانە و خەڵوەتگە و خانەقا، لەبوارە جیاجیاکانی زانستیشدا دەیان ئافرەت توانیویانە لەدەستکەوتەکانی (نظامیة) سودمەندبن[٥٧٩]، پلەوپایەی زانستی گەورە لە فەرمودەناسی و وتاربێژی و ..بەدەست بێنن، بەجۆرێك لەکۆی (٧٠) فەرمودەناس (١٢) یان ئافرەت بوون[٥٨٠].

ئەو جوڵانەوە زانستیەی لە سەردەمی سەلجوقیەکانەوە دەستی پێکرد چەند سەدەیەك درێژەی کێشا[٥٨١]، دەستکەوتەکانیشی هەمەجۆر بوون لە هەریەك لەبوارەکانی زانستە ئاینیەکان و زمانەوانی و زانستە لۆژیکی و پراکتیکیەکان[٥٨٢]، ئەوەی سەرنج کێشە لێرەدا بەتەنها ئاماژەی پێدەدەین، زانستی ئەستێرەناسی (تنجیم)ە، چونکە پەیوەندی بەشتێکی نادیارەوە هەیە زیاد لە توانای مرۆڤ لە لایەکی دیکەش لەسەر چارەنووسی کورسی دەسەڵات و بەخت، زانیاری و پێشبینی ئەگەری ڕووداوەکان دەخاتەڕوو،

---

[٥٧٨] تەنها لەبەغدا لەنێوان سەدەی (٥-٦ك)دا زیاتر لە ٢٠٦زانای ئافرەت لەبوارە جۆربەجۆرەکاندا هەبووە، کە زۆربەیان لە دەرچوانی قوتابخانەکانی (نظامیة)بوون و ڕۆڵی گرنگیان لەبەرەوپێشبردنی ژیانی زانستیدا بینیوە، اسراء مصطفى النجار، دور المراة في تطوير الحياة الفكرية، الدار العربية للموسوعات،(بيروت:٢٠٠٨م)،ص ص ١٩٠-١٩١.

[٥٧٩] بۆ نموونە بڕوانە: اسرا مصطفى نجار، دور المراة في تطوير الحياة الفكرية، ص ص١١٩، ١٢٥، ١٢٨.

[٥٨٠] قادرمحمد حسن، اسهامات الكرد، ص٢٩٧.

[٥٨١] ديورانت، قصة الحضارة، ج١٣، ص١٠٣.

[٥٨٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: قادر محمد حسن، اسهامات الكرد، ص٢٩٠ ومابعدها؛ اكوبرهان، الحياة العلمية، ص١٠٦ ومابعدها.

سەرباری سوودوەرگرتن لەو زانستە و ئەستێرەناسان بۆ زانینی کاتی مەراسیمە ئایینیەکان و ئەو شتانەی پەیوەستن بەم لایەنەوە[٥٨٣]، چەندبارەبوونەوەی کارەساتە سروشتی و مرۆیەکان و زیادبوونی مەترسی و دڵەڕاوکێ کاریگەریان لەسەر پەنابردنی خەڵك بۆ ئەستێرەناسان هەبوو، کە لەشکرکێشیەکان سەرچاوەی سەرەکی بەشێکی زۆر لەو مەترسیانە بوون، بۆیە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا ئەم زانستە زۆر گەشەی کرد و بایەخی زۆری لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە پێدراوە، وایلێهاتبوو پێشبینیەکانی ئەستێرەناسان جێگای متمانەو باوەڕبوون[٥٨٤]، ئەم زانستە لە کوردستانیشدا گەشەی کردو چەند ئەستێرەناسێکی بەتوانا دەرکەوتن[٥٨٥]، لەلایەکی دیکەش میرە کوردیەکانیش لەوانەبوون کە ئەستێرەناسان و پێشبینیەکانیان جێگەی باوەڕیان بن، هیچ سەیرنیە کە ئەستێرەناسی بەناوبانگی هیندی (ابن عیسون)(م.لە٤٨٩ ك،/١٠٩٥ز) ئەستێرەناسی مەڕوانیەکان بە وردی ڕووخانی میرنشینی مەڕوانی بۆ (نصرالدوله) دیاری کرد[٥٨٦]، هەر هەمان ئەستێرەناس ئەوەی بەگوێی میر (نظام الدین)دا دا، کە دوای مردنی بەختی میرنشینەکە بەسەردەچێت و جەورو ستەم باڵ بەسەر وڵاتدا دەکێشێت[٥٨٧]، بەڕاستیش پێشبینیەکانی لەکاتی خۆیدا هاتنەدی، چونکە لە ساڵی (٤٧٨ك/١٠٨٥ز) میرنشینەکە ڕووخاو بەمەش ڕۆژگاری بەختی مەڕوانیەکان بەسەرچوو ستەمیش باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا[٥٨٨].

---

[٥٨٣] ابن خلدون، مقدمة، ص٣٦٥.

[٥٨٤] حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام، ج٤، ص ص٥٢٤-٥٢٥.

[٥٨٥] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: اكوبرهان، الحياة العلمية، ص ص١٦٦-١٦٨.

[٥٨٦] الفارقي، تاريخ فارقي، ص ص١٧٢-١٧٣؛ ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١ص٣٦٣.

[٥٨٧] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص٢٠٣-٢٠٤.

[٥٨٨] ابن الاثير، الكامل، ج ٨، ص٢٩٩؛ ابوالفداء، مختصر في اخبار البشر، ج٢، ص٩.

گەشەکردنی ئاستی ڕۆشنبیری و هۆشیاری کۆمەڵگاش بەرئەنجامێکی دیکەی گرنگی کردنەوەی قوتابخانەکان بوو [٥٨٩]، کە خۆی لە بەگژداچوونەوەی نادادگەری کۆمەڵایەتی و بڕیارە نەشیاوە سیاسیەکان و هێزی بێگانەدا وێناکردووە، دەشێ بڕیاری سوڵتان (ملکشاە) لە دانانی محمودی کوڕە بچوکی بەجێنشینی خۆی [٥٩٠]، کە ناڕەزاییەکی زۆری لەلای توێژی ڕۆشنبیرو خوێندەوارو لایەنگرانی (نظامیة) لێکەوتەوە وەك بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری سەیربکرێت، بە لایەنگری لە (بەرکیاروق) و پشتگیریشی لەشەڕی (تورکان خاتون)ی لە ساڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز) بوو بە بزووتنەوەیەکی چەکدارانە، کە سەرئەنجام لە بەرژەوەندی بەرکیاروق کۆتایی پێهات [٥٩١]، ئەگەر ڕووداني کۆی ئەو ڕووداوانەش لە شاری بروجردی [٥٩٢] کوردی لە بەرچاو بگرین ئەوا ڕۆڵی کورد لەو بزوتنەوەیەدا دەکاتە ئەمری واقیع [٥٩٣]، لەلایەکی دیش لەگەڵ کاردانەوەکانی دیکەی کورد دژی هێزەکان، ئاستی گەشەکردنی هۆشیاری کۆمەڵایەتی مرۆڤی کورد لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژووەکەیدا دەردەخەن.

لە سەردەمی مەغۆلەکانیشدا، دوای ئەوەی تێگەیشتن کە ناتوانن بەو شێوەی شەڕوکوشتار درێژە بە مانەوەیان بدەن، بۆیە هەوڵیاندا بەجۆرێك گونجان لەگەڵ خەڵکدا دروستبکەن، هۆلاکۆ هەنگاوی یەکەمی بە بڕیاری وەستاندنی کوشتار لەبەغدا دا، دوای ئەوەی چل ڕۆژ بەردەوام بوو، بڕیاری بیناکردنەوەی ئەوەی کە وێرانی

---

[٥٨٩] عبدالنعیم حسنین، السلاجقة، ص٨٠.

[٥٩٠] الراوندي، راحة الصدور، ص٢١٥؛ ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١١، ص٢٦٦.

[٥٩١] ابن الجوزي، المنتظم،ج٩،ص٧٤" الحسيني،زبدة التواريخ،ص١٥٦؛ آن لمبتن،تاريخ ميانه ايران،ص٥٤.

[٥٩٢] بروجرد: شارێکە دەکەوێتە نێوان هەمەدان وکەرەج لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیادا، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص٤٠٤.

[٥٩٣] ابو الفدا، مختصر في اخبار البشر، ج٢ص١٨؛عبدالمنعيم حسنين، سلاجقة، ص٨٤.

کـردووه [٥٩٤]، دانیـشتوانە خۆجێیـەکانیش ئامـادەبوون لـەپێناو بوژانـەوەی گیـانی شارستانی و ئاوەدانی هاوکاری لەگەڵ دەسەڵاتی نوێدا بکەن [٥٩٥]، لەبەرئەوەش ئـەوان دەشتەکی بوون و شەڕو شەڕانگێزی خەسڵەتی دیارو حاڵەتێکی ئەقڵی درێژخایەن بـوو لایان و دووربوون لە گیانی ئاوەدانی و شارستانی، ئـەرکی بنیادنانـەوەو کاروبارەکـانی دیکـەیان لـە کـارگێڕی سەرناوچـەکان بـە مـسوڵمانان و خەڵکـە خۆجێیـەکان سپاردەوە[٥٩٦]، ئەوان نەیانتوانی خۆیان لە خوڕافیگەرایی قۆناغی پێشتر دەربازبکەن و شتێکیان نەهێنایە بوون، کە لەڕووی مەعنەوییەوە قابیلی خستنەڕوو بۆ ئەوانی دیکە بێـت، لـەجیاتی ئـەوەی کـە بیروباوەڕەکـەیان بـۆ وڵاتـی دیکـە ببـەن و هـەوڵ بـدەن شارستانیەتی تایبەت بەخۆیان بنیاد بنێن لەهەموو شوێنێك لەماوەی سێ یـان چـوار نەوەدا لە شارستانی ئەو وڵاتانەی کە داگیریـان کردبـوو، بەتایبـەتیش لـە شارسـتانی ئیسلامیدا توانەوە[٥٩٧].

لەکوردستانیشدا شوێنەواری ئەوگۆڕانکاریەی کە بەسـەر سیاسـەتی مەغۆلـدا هـات دەرکەوت، دوای ئەوەی بە شـارەزایی و لێهـاتووی (نـصیرالدین الطوسـي)[٥٩٨] سـاڵی

---

[٥٩٤] الهمذاني، جامع التـواريخ، ج٢، ق١، ص٢٩٥؛ابـو الفـداء، مختـصر، ج٢، ص٣٠٢؛جعفـر خـصباك، العراق، ص٥٧.

[٥٩٥] حافظ احمد حمدي، الدولة الخوارزمية، ص٣٠٤.

[٥٩٦] الهمذاني، جامع التواريخ، ج٢، ق١، ص٢٩٥.

[٥٩٧] محمـد فتحـي امـين، الغـزو المغـولي،ص١٢٩؛یاروسـلاڤ کراچی،شارسـتانیەتی ئاسـیاو ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست،(هەولێر:٢٠٠٧)، ل٤٣٢.

[٥٩٨] ناوی محمد کوڕی محمدی گوسیە (٥٩٧-٦٧٢ك) زێدی ڕەسەنی گوسـە لەهـەرێمی خوراسـان، یـەکێك بوو لە ناودارترین زانایانی سـەدەی حەوتەمی کۆچی و هاوڕێی هۆلاکۆ بووە لە هێرشی بۆ سەر بەغدا، وەك زانایەکی مـسوڵمانیش پشتی پێبەستوە، هەرلەلایەن هۆلاکۆشەوە ڕاسـپێردرا بـۆ دروسـتکردنی مرصـدی مەراغە، لە بەغدا مردووە، الکتبـي، فوات الوفيات، ج٣، ص٢٤٦؛حسن الامين، الاسماعليون، ص٩ وما بعدها.

(٦٥٧ك/١٢٥٩ز)دا بڕیاریان لەسەر دامەزراندنی گەورەترین ڕوانگە (مرصد)ی زانستی لەشاری مراغەدا[٥٩٩]، کە بە یەکەم ئەکادیمیای زانستی بەمانای زانستی ئەمڕۆ (ACADEMIE) دادەنرێت، کە بە ڕوانگەی ئیلخانیشی پێدەگوترێت[٦٠٠]، هەر لەو زانستگەیەدا کتێبخانەیەکی گەورە دروستکرا و بە دەیان هەزار پەرتوك و سەرچاوەی زانستی جۆراوجۆری تێدا کۆکرایەوە، بەشی زۆری لە سەرچاوەکانی بەغدای بۆ گوێزرایەوە[٦٠١]، سەرباری ئەو سەرچاوە بەنرخ و دەگمەنانەی کە لە پاشماوەی ئیسماعیلیەکان لە قەڵای (الموت)[٦٠٢]دەستیان بەسەردا گیرا کۆی هەموو ئەوانە بەنزیکەی نیو ملیۆن سەرچاوە دانراوە[٦٠٣]، جگە لەوەی بەدەیان ئامێری (اسطرلاب)[٦٠٤] و کەلوپەلی ڕووپێوی و پشکنینی گەردوون و چەندان ئامێری زانستی دیکەی بۆ کاری پشکنین و کاروباری زانستی تێدا کۆکردەوە، بوو بە خانەیەکی زانستی

---

[٥٩٩] یەکەم جار بڕیاری دروستکردنی لە مەنغۆلیا درا، بەڵام سەرقاڵیان بەشەڕی (چینیەکان) ئەم نەخشەیەی پەکخست، دواتر بڕیاردرا لە مەراغە دروستبکرێت لە ماوەی دوازدە ساڵدا تەواوکرا بڕی بیست هەزار دیناری تێچو، ئێستاش شوێنەوارێکی بچوکی ماوە, الهمذاني،جامع التواريخ،ج٢، ق١، ص ص٣٠٣-٣٠٤؛عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ص٢٠٦-٢٠٧.

[٦٠٠] الهمذاني، جامع التواريخ، ج٢، ق١، ص٣٠٤؛الكتبي،فوات الوفيات،ج٣،ص٢٥٠؛حسن الامين، الغوزالمغولي، ص١٥٨؛عبدالامير الرفيعي، العراق، ص ص ١٤٤-١٤٥.

[٦٠١] ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١٢، ص٢٨٥؛حسن الامين، الاسماعيليون، ص٤٩.

[٦٠٢] قەڵای (الموت) کەوتۆتە سەرچیایەك لە دەوروبەری (رودبار) لەنێوان قەزوین و دەریای خەزەر، القزويني، آثار البلاد، ص٨٩.

[٦٠٣] حسن الامين، الغزو المغولي، ص١٥٨؛ عبدالامير الرفيعي، العراق، ص ص١٤٤-١٤٥.

[٦٠٤] لەزاراوەی (Astrolabium)ی یۆنانییەوە هاتووە کە بەمانای ئەستێرە بین وە بەمانای گەردونناسیش دێت لە زمانی ئینگلیزیدا، ئەم ئامێرە لەلایەن گەردونناسە مسوڵمانەکان بۆ بواری ئەستێرەناسی و دیاریکردنی کاتەکانی نوێژ و ڕوگەی نوێژ بەکارهاتووە، قادر محمد حسن، اسهامات الكرد، ص٢٩٤، هامش١.

بۆ کۆبوونەوەی سەدان زانای بوارەکانی پزیشکی و فەلسەفە و زانستی ئایینی ... دابینکردنی خەرجی هەموو ئەمانە[٦٠٥]، لە شوێنەوارو بەرەنجامەکانی ئەو ڕوانگەیە و بارودۆخی ژێر سایەی ئیلخانی کە ئازادی هزری و توانا و چالاکی زانا مسوڵمانەکان و گەشەکردنی زانستەعەقڵیەکان و فەلسەفەو زانستی شەقکردن و نەشتەرگەری و تونێکاری و زانستی ئایینی و مێژوو و جوگرافیا ...لێکەوتەوە[٦٠٦]، توێژەران دەستکەوتەکانیان بەرز نرخاندووە و بەجۆرێك بەمزگێنیی سەدەی حەوتەمیان ناوبردووە، کە بووە هۆی سەرلەنوێ بوژانەوەی شارستانی و هەر لەژێر کاریگەری و چالاکی جۆربەجۆری زانایان سیمای کۆمەڵگای مەغۆلیشی لە ئایین زۆرییەوە گۆڕی بۆ یەکتاپەرستی و هاتنە ناو چوارچێوەی ئیسلامەوە[٦٠٧].

بە سەرنجدان لەو گۆڕانکاریە شارستانیە ناکرێت کوردستان لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە دابنرێت سەرباری نەبوونی دەقێکی ورد لەمبارەیەوە، بە تایبەت کە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی هۆلاکۆ شارێکی گەورەی وەك مەراغەبووە، هەمیش گەورەترین دامەزراوەی زانستی هەروەك ئاماژەدرا لەو شارە دامەزراوە، کە لە ئەنجامدا وەچەیەکی نوێی لە زاناو شارەزا پێگەیاند، کە توانییان نوێگەری بەسەر ژیانی عەقڵی و شارستانیدا بێنن[٦٠٨]، بێگومان کورد بەشێك بووە لەو شارستانیە و کاریگەریشی لەسەر بووە، بەڵام ئەوەی لەسەردەمی ئیلخانیدا تێبینی دەکرێت کەمی ڕێژەی توێژی

---

[٦٠٥] ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١٢، ص٢٨٥؛فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص٣٢٥؛ولبر، ايران، ص ص٧٢-٧٣.

[٦٠٦] بۆزانیاری زیاتر بڕوانە :محمد مفيد الياسين، الحياة الفكرية في العراق في القرن(٧ه)،دارالعربية،(بغداد:١٩٧٩)،ص١٣٣ ومابعدها.

[٦٠٧] حافظ احمد حمدي، الدولة الخوارزمية، ص٣٠٥؛حسن الامين، الاسماعيليون، ص٤٧؛المغول بين الوثنية والاسلام، ص ص١٧٦-١٧٧.

[٦٠٨] حافظ احمد حمدي، الدولة الخوارزمية، ص٣٠٧.

زاناو خوێندەوارانە لەژێر سایەی ئەو دەوڵەتەدا، بەڵکو بەشی زۆریان لە شام و مصر لەژێر دەسەڵاتی مەمالیکدا دەرکەوتن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرئەنجامی لەشکرکێشیەکانی مەغۆل، کە بوو بەهۆی کۆچکردنی بەشێکی زۆر لە خەڵك و زانایان لەترسی ژیانیان، ئەو پەیوەندیە مێژووییەی کە کورد لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا هەیبوو بەهۆی دەوڵەتی ئەیوبی و شەڕی خاچدروشمان و بوونی دەسەڵاتێکی ئیسلامی وەك مەمالیك کە ڕێزی تواناو شارەزایی و ئازایەتی کوردیان گرتوو و بەگشتی لە کاروبارەکاندا پشتیان پێبەستبوون[٦٠٩]، تا ئەوکاتیش تێڕوانینی کورد بەرامبەر بە مەغۆلەکان بەهۆی ئەو کوشتارەزۆرەی بەسەر کوردستان و جیهانی ئیسلامییاندا هێنا باش نەبوو، ڕووداوە سامناك و تراژیدیەکانیان لەبیر نەکردو بڕیاریاندا نەگەڕێنەوە کوردستان.

هەر لە سەردەمی ئیلخانیەکاندا لەسەر دەستی (خواجە رشیدالدین فضل الله الهمذاني) وەك بەرپرسێکی باڵاو زانایەکی گەورە لەسەر شێوەی شارۆچکەیەك لە ڕۆژهەڵاتی شاری (تبریز) لە سنوری مەڵبەندی کارگێڕی ویلایەتی کوردستان، دەزگایەکی گەورەی بەناوی (الربع الرشیدی) دامەزراند[٦١٠]، کە چەندین خانو و کۆشك و دوکان و گەرماو و هۆڵی وانە خوێندن و شوێنی دروستکردنی کاغەز و کتێبخانە و نەخۆشخانەی تێدا دروستکرد[٦١١]، لەگەڵ دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیان و گوزەرانی مامۆستا و قوتابیان و دابینکردن و ڕاکێشانی پڕۆژەی ئاو بنیاتنانی

---

[٦٠٩] بگەڕێوە: بۆ قادر محمد حسن، اسهامات الکرد،ص١٤٥ ومابعدها.

[٦١٠] حمدالله مستوفی،نزهة القلوب،ص٧٦؛صادق نشاة، صفحات عن ایران،ص١٤٦؛مهدی درخشان،بزرگان وسخن سرایان همدان،ج١،ص١٨٧.

[٦١١] فؤاد عبدالمطی الصیاد, مؤرخ المغول الکبیر رشیدالدین فضل الله الهمذانی،دار الکاتب العربی، (القاهرة:١٩٦٧)،ص٤٣٣.

باغ و باخچە بۆی[٦١٢]، وەکەوتە گردکردنەوەی زاناو شارەزایان و خوازیارانی زانست لـە هەموو لایەکەوە بەمەبەستی خوێندن ڕوویـان تێکـرد، کـە بـەپێی ویـستی قوتابیـان خۆیان لەبوارە جیاوازەکانی دامەزراوەکە سودمەند دەبوون[٦١٣]، هەر لەو زانـستگەیەدا چەند لێکۆڵینەوەیەکی زانستی جۆراوجۆر ئەنجامدران و بە دەیان سەرچـاوە نووسـران و چەندانیان لەبەر نووسرایەوە بەسەر کتێبخانەو دامـەزراوە زانـستیەکانی سەرتاسـەری سنوری دەوڵەتدا دابەشکران[٦١٤]، جگە لەوەی دەیان قوتابخانـە و ڕوانگـەی زانـستی و کتێبخانـە و نەخۆشـخانە لـە ناوچـە جیاجیاکانـدا بەشـارە کـورد نشینەکانیـشەوە دروستکران[٦١٥]، دەتوانرێت بوترێت کە گەورەترین بزوتنەوەی زانستی لەسەردەستی ئەو جارێکی دی دەستپێکردەوە، کاتێك کاری لەسەر خوێنـدەواریکردن و ڕۆشـنبیریکردنی خەڵك کرد، لەڕێی نووسینەوەو لەبەرگرتنەوەی سەرچاوەی بەسوودو بەبایەخی زانستی و دابەشـکردنیان بـەنرخێکی ڕەمـزی بەسـەر خەڵکـدا، کۆمەڵگـەی لـەو چـالاکییە ڕۆشنبیرییە بەهرەمەند کرد[٦١٦].

ڕەنگـە یـەکێکی دیکـە لـە دەسـتکەوتە کـەلتوری و فەرهەنگیـەکانی کـۆی لەشکرکێشیەکان بۆ کورد، نووسینەوەی مێژوو بووبێ، کە میرو سـوڵتانەکان لـەپێناو دەرخستنی گەورەیی بنەماڵەییان لەکاتی ڕابردوودا بە درووستکردنی مێژووی وەهمی و بەنیازی زیندوو ڕاگرتنی سـەروەری و بیرەوەریـەکانیان، گەیانـدنیان بەنـەوەی داهـاتوو

---

(٦١٢) الهمذانی،جامع التواریخ،مقدمة مترجم،مج٢،ج١،ص٢٣؛حمدالله مستوفی،نزهة القلوب،ص٧٧.

(٦١٣) فؤاد عبدالمطی الصیاد,مؤرخ المغول الکبیر،ص٤٣٤؛ عزیـزالله بیـات, تـاریخ ایـران,ص ص٣٤٦-٣٤٧.

(٦١٤) صادق نشاة، صفحات عن ایران، ص١٤٦؛ ولبر، ایران، ص٦٨.

(٦١٥) ولبر، ایران، ص ص٦٧-٦٨.

(٦١٦) فؤاد عبدالمعطی الصیاد,مؤرخ المغول الکـبیر،ص ص٤٤٨-٤٤٩؛مـصطفی طـه بـدر، المغـول ایـران، ص٤٩.

بۆئەوەی لـەوە تێبگـەن کەئـەوەی بەرهـەم هـاتووە بـەری ڕەنـج و تێکۆشـانی بـاب و باپیرانیانە، داوایان لە ڕەچەڵەك ناس و مێژوونووسان کرد کە هەڵسن بـە نووسـینەوەی ئەو مێژووە[٦١٧]، بەم شـێوەیە و لـە قۆناغـە جیاوازەکانـدا سەرچـاوەی مێـژوویی زۆر نووسراون، کە وەکو پاشخانێکی ئەدەبی و مێژوویی گـرنگ لـەدوایان بـەجێماوە، بـەو هۆیەشەوە کورد بوو بە بەشێك لە ناواخنی فەرهەنگی ئـەو نەتەوانـە کـە بەشـێواز و گوزارشتی جیاجیا لەنازایەتی و نەبەردی و یانیش وەکو ڕێگرو دەشتەکی و دواکـەوتوو ناوبراوە[٦١٨]، کۆی ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی لەنێوان کـورد و هێزەکانـدا ڕوویـداوە تۆمارکراون، ئەمڕۆ بوونەتە سەرچاوەیەك بۆ نووسینەوەی مێژوو، وە هۆکارێك بوون بـۆ تێکەڵاوبوونی کەلتوری و ناساندنی کورد لەلای ئەم نەتەوانە، کە دەکرێت لەسەر ئـەو بنەما مێژووییەش بەڕوویەکی دیدا بکرێنە ئامرازێك بۆ دروستکردنی پردی پەیوەنـدی نێوان کورد و ئەوانی دی و ڕاستکردنەوەی بۆچوونە هەڵەکان لەسەر کورد.

ئـەوە سـەرباری ئـەوەی کـە نووسـینەوەی مێـژوو ئاڕاسـتەیەکی جیـاوازی لـە سەردەمەکەی پێش خۆی وەرگرت، بەر لەهەموو شتێك مێژوو چـیتر بریتـی نـەبوو لـە مێژووی گشتی کە تەواوی ڕووداوەکانی جیهانی ئیسلامی لەسەر یەك و بە پێـی سـاڵ بنووسرێتەوە، بەڵکو مێژووی نێـو خـۆیی گەشـەی سـەند وەك نووسـینەوەی مێـژووی شارێك یان هەرێمێك یان کەسایەتی و بنەماڵەیەکی دیاریکراو[٦١٩]، سەرهەڵدانی ئەم جۆرە مێژووەش گوزارشتی لـە هەسـتی کۆمـەڵ و گروپـەکان دەکـرد، بەتایبەتمەنـدی

---

[٦١٧] فاروق عمر، تاريخ ايران، ص١٤٩؛عزيزيبات،تاريخ ايـران،ص٣٢٧؛ موسـى محمد خـضر، کـورد لـە مێژوونووسی فارسیدا، ل٢٤.

[٦١٨] لەم بارەیەوە بڕوانە: حيدر لشكري،الكرد في المعرفة الاسلامية،ص١١٧؛موسى محمد خضر، کـورد لـە مێژوونووسی فارسیدا، ل٥٨.

[٦١٩] لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد مفيد الياسين،الحياة الفكرية في العراق،ص٣٠٣.

خۆیان، یاخود ئەو دەڤەرو شارەی تیایدا ژیاون کە بێگومان شـانازی هەرێمایـەتی لـە پشت ئەو کارانەوە بوو[٦٢٠].

هاوڕێ لەگەڵ ئەوگۆڕانکاریە زانستی و ڕۆشنبیرییە، لایەنی جوگرافیش پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینی وە ژمارەی شارناس و گەڕیدەکان زیـادی کـرد، ڕێبـاز و شـێوازی نووسینەکانیشان گۆڕانی بەسەرداهات، ئاشنابوون بە ڕێگاکان و دیاریکردنی پێوانـەی دووری شارەکان، وە زانینی نەریت و دەرامـەتی خـەڵك وکۆکردنـەوەی بـاج و خـەراج و چەند زانیاریەکی دی لەسەر بارودۆخی گشتی هەرێمەکان وای خواست هێزەکان زیـاتر بایەخ بەو زانستە بدەن[٦٢١]، ئەوەی گرنگە بۆ فەرهەنگی کورد، ئەو زانیاریە بەبایەخ و بەسودانەیە کە ناواخنی بەشێکی یاداشتنامە و سەرچاوە و وڵاتناسـی و شارناسـەکانی پێکهێناوە، بۆتە چاوگەیەکی بە پێزو دەوڵەمەندیش بۆ مێژووی کـورد[٦٢٢]، بەشـێکی ئەمـەش بە شوێنەوارێکی گرنگی لەشکرکێشیەکان دادەنرێت.

بەبارێکی دیدا، لەشکرکێشییەکان کاریگەری خراپیـشیان کردۆتـە سـەر لایـەنی فەرهەنگی، بەهۆی وێرانبوونی شار و لادێیەکان، بەشێکی زۆر لەدەستنوس و سەرچاوە زانستیەکان سوتاون یان لەناوچوون، بەمـەش نەوەی داهاتووی لەوەدەستکەوتە بەنرخانـە بێ بەشکردووە، لەم بارەشـەوە کلتـوری کـورد لاواز بـووەو داتـەپیوە[٦٢٣]، بەتایبـەت لەشکرکێشییەکانی خوارزمیەکان و مەغۆلەکان کاریگەری خراپیان بۆ سەر ئەولایەنە زیاتر بووە، سەرباری کوژرانی سەدان زانا و قوتابی دامـەزراوە ئـاینی و زانـستیەکان، ئـاوارەبوون و کۆچـی دەیـانی دیکـە لـە ترسـی کوشـتاری ئـەوان بـەرەو تاراوگـە

---

[٦٢٠] موسی محمد خضر، کورد لە مێژوونووسی فارسیدا، ل٢٥.

[٦٢١] بۆ هۆکارەکانی سەرهەڵدانیان بڕوانە: حکیم احمد خوشناو، الکرد وبلادهم، ص ص١٨-١٩.

[٦٢٢] بەگشتی لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: حکیم احمد خوشناو، الکرد وبلادهم.

[٦٢٣] ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارو، ل١٤.

لێکەوتۆتەوە[٦٢٤]، بە نموونەی ئاوارەبوونی زانایانی شارێکی وەك هەولێر و شارەکانی دی هەرێمی جزیرە[٦٢٥]، کاتێکیش بڕیاری سوتاندن و وێرانکردنی هەموو شتێکی بەردەم لەشکرەکانیاندا لەگوندو شارو مزگەوت و مەڵبەندە زانستیەکان (مدارس) شوێنەوارێکی خراپیان لەسەر چارەنوسی ئەم لایەنە بەجێهێشت[٦٢٦]، ئەو کارەساتەی خوارزمیەکان بەسەر ئەو لایەنەیان داهێنا لە داخستنی فێرگەکان و دەرکردنی یاسای دەست بە سەرداگرتنی مزگەوت و فێرگەو ماڵ و سامانی زانایان و تێکدانیان بت پەرست و ناموسڵمانان کارەساتی وایان نەخوڵقاندووە[٦٢٧]، لەشکری مەغۆلیش کارەساتی گەورەتریان خوڵقاند، کە دەشێ سەردەمی لەشکرکێشی ئەوان بەچەرخی چەپگەڕ ناو ببرێت، بەهۆی ئەوەی کەدامەزراوە زانستیەکان لەگەڵ زەوی تەخت کران و زانست و زانیاری و هونەر لەنێوچوون و بوون بەژێرخاکەوە و نەزانی و تاریکی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا[٦٢٨]، کە هەر لەسەرەتای هێرشەکانیان بۆ سەر شارە کوردیەکان کەوتنە وێرانکردن و کوشتاری خەڵك، وەك هێرشەکانی سەر شاری همدان و شارەکانی

---

[٦٢٤] ابوالفداء،المختصر في اخبار البشر،ج٢،ص٢٢٣؛ عبدالعظيم رضايي،تاريخ ده هزار ساله ايران،ج٣،ص٢٣١.

[٦٢٥] بڕوانە: سامي الصقار،أربل،ص٢٠٨؛ اميد جوزةلي،الحياة العلمية في اربيل،ص ص٣١-٣٢؛ عبدالله الحارثي،الاوضاع الحضارية،ص٥٥.

[٦٢٦] ابن الاثير، الكامل، ج ١٠، ص٣٤٠؛ ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١٢، ص١٨١؛ بدرالدين العيني،عقد الجمان،ج١،ص١٧٥ "محمد مفيد الياسين، الحياة الفكرية في العراق في القرن(٧هـ)،ص ص١١٩-١٢٠.

[٦٢٧] الراوندي، راحة الصدور، ص٥٥٣.

[٦٢٨] ابن عرب شاه،فاكهة الخلفاء،ص٣٠٥؛عباس اقبال،تاريخ المغول،ص٤١٣؛مرتضى راوندى، سير فرهنگ و تاريخ تعليم،ص٩٠.

هەردوو هەرێمی ئازربیجان و جزیره[٦٢٩]، ئەو هەستە دوژمنکاریەش کە بەرامبەر بە شارستانی ئیسلامی هەیانبوو، وای لێکردن وەك دوژمنێکی سەرسەخت مامەڵەی لەگەڵ بکەن وسڵ لە کوشتنی زانـاو دانـا و بەهرەمەنـدان (جگـە لەوانـەی خۆیـان پێویستیان پێبوون) نەکەنەوە و دەستکەوتی چەند سەد ساڵەی ئەو شارستانیەتە وێران بکەن[٦٣٠]، بە داگیرکردنی بەغداش دەستیان گرت بەسەر گەورەترین مەڵبەندی شارستانی ئیسلامیدا، کوردستانیش وەك بەشێك لەو شارستانیەتە زیانی زۆری لێکەوتووە.

## سێیەم/ ئاواکاری و بیناسازی:

هەلومەرجی ڕەخساوی دوای لەشکرکێشیەکان و ئەو گۆڕانکاریەی کە بەسەرلایەنی زانستی و ڕۆشنبیری داهات بەتایبەت لە سەردەمی سەلجوقیەکان و مەغۆلەکان، لایەنی هونەری بیناسازیش گۆڕانی بنچینەیی تێدا بەدیهات، لە گۆڕانی شێوازەکانی و داهێنانی هونەری تەلارسازی لە دروستکردنی کۆشکی ناودارو سەرنج ڕاکێش، بەتایبەت لە بیناکردنی دامەزراوە ئایینی و زانستیەکان ڕەنگی دایەوە، کە هەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی سەلجوقی بە کوردستانیشەوە گرتەوە[٦٣١]، هونەری بیناسازی سەلجوقی بە داهێنان و بەکارهێنانی زەخرەفەو کاشی ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاندنەوەی دیوار و دەرگاو بنمیچی کۆشکەکان و نووسینی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەسەر دیوار و

---

[٦٢٩] بروانە: ابن الأثير، الكامل، ج١٠،ص٣٧٠،ص٤٤٨.

[٦٣٠] ابن كثير، البداية والنهاية، مج٦، ج١٢، ص١٨١؛سلمان التكريتي، بغداد، ص٢٣٨.

[٦٣١] حسين امين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٣٠٧؛نعمت اسماعيل علام، فنون الشرق الأوسط في العصور الإسلامية، الطبعة السادسة،(دار المعارف،د.ت)، ص١٣٤.

بەکارهێنانی وێنەی سروشتی بۆ گوزارشتکردن لە جوانی گۆڕانکاری لە دروستکردنی گومبەز و منارە و فراوانکردنی ڕووبەری بیناکانیان، تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە[٦٣٢]، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامیدا قوتابخانە (فێرگە)ی تایبەت بەو هونەرە بەناوی (مدرسە بغداد) دامەزرا[٦٣٣]، کە لە وێنەکاری و دروستکردنی کەلوپەلەکاندا، کاریگەری هونەری ئێرانی و مەسیحیەکانیان بەسەرەوە بوو[٦٣٤]، کاریگەری ئەو هونەرە لە کوردستانیش بەڕوونی لە دروستکردنی مزگەوت و منارەو گومبەز[٦٣٥] بەکارهێنانی زەخرەفەو هونەری جوانکاریدا دەرکەوت[٦٣٦]، بۆ نموونە مزگەوتی دیاربەکر کە لەسەر شێوازی بیناسازی سەلجوقی و بەکاشی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازێنراوەتەوەو گومبەزی جوان و سەرنجڕاکێشی لەسەر دروستکراوە، کە ئەولیا چەلەبی بە هاوشانی مزگەوتە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی داناوە[٦٣٧]، ئێستاش شوێنەواری ئەو هونەرە لە کوردستان بە شێوەیەکی بەرچاو لە دروستکردنی مزگەوتەکاندا تێبینی دەکرێت.

---

[٦٣٢] بڕوانە: ابن الجوزي،المنتظم،ج٩،ص ص١٠٩-١١٠؛البنداري،تاريخ دولة ال سلجوق،ص ص٧٠-٧١؛احمد كمال الدين،السلاجقة،ص٢٣١؛برنار أوكان،كنوز الاسلام (روائع الفن فى العالم الاسلامى)،ترجمة نورما نابلسي،مؤسسة محمد بن راشدال المكتوم،(الامارات العربية:د.ت)،ص١١٤.

[٦٣٣] صادق نشأة، صفحات عن ايران، ص ص٢٧٦-٢٧٧؛ زكى محمد حسن مصرى،تاريخ نقاشى در ايران،چاپ دانش،(١٣٢٨ش)،ص٣١.

[٦٣٤] زكى محمد حسن مصرى،تاريخ نقاشى در ايران،ص٣٦.

[٦٣٥] ئەگەرچی توێژەرێك پێی وایە کە هونەری دروستکردنی گومبەز مێژووەکەی بۆ بەر لە ئیسلام دەگەڕێتەوە لە ئەرمینیا بڵاوبۆتەوە وەپێدەچێت لە مەسیحیەکانی ئەرمینیا وەرگیرابێت،بڕوانە: عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكية، ج٢، ص٣٠٠، بەڵام هەرچۆنێك بێت لە چاخەکانی ناوەڕاست پێشکەوتنی زۆری بەخۆوە بینیوە بەشێوەیەکی بەرچاویش لە کوردستان بڵاوبۆتەوە.

[٦٣٦] حسين امين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٣٠٧.

[٦٣٧] سیاحەتنامە، ل٤١.

لەڕاستیدا ئەو پێشکەوتنەی بەگشتی لەسەردەمی سولْتان ملکشاه بەسەرلایەنی ئاواکاری داهات، ڕەنگدانەوەی گەشەکردنی لایەنی زانستی بوو، هەروەك (ابن خلدون)یش پێشکەوتنی زانستی و بیناسازی (عمران)ی بەیەکەوە بەستۆتەوە، پێی وایە بەگەشەکردنی یەکەمیان لایەنی شارستانی و ئاواکاری پەرەدەستێنێ و پێشدەکەوێت[٦٣٨]، بەم شێوەیە زۆربەی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیان لە عێراق و کوردستان و شام کەوتنە ژێرکاریگەری ئەو هونەرەی سەلجوقیەوە[٦٣٩].

ئەگەرچی شاڵاوەکانی مەغۆل بەتەنها کارەساتی مرۆییان نەخوڵقاند، بەڵکو لایەنی ئاوەدانی و شارستانیش زیانی گەورەی پێکەوت و بەجۆرێك کە (ابن الاثیر) بڕوای وایە مێژوو شتی وای بەخۆوە نەبینیوە[٦٤٠]، بەڵام دوای ئەو قۆناغە و لە سەردەمی ئیلخانیدا وەك سروشتی هەر لەشکرکێشیەك کە دەکرێت لەڕووی دووەمیدا گۆڕانکاری بەسەرلایەنەکانی هونەری بە گشتی دابێت، بەهەمان شێوە لەو ماوەیەشدا دەستکرا بە بیناکردنەوەو بوژاندنەوەی هونەری بیناسازی و نیگارکاری و بەرەو پێشبردنی هونەری گلکاری[٦٤١]، ئیلخانیەکان تازەگەرییان بەسەر شێوازەکانی تەلارسازی و هونەری بیناسازیدا هێنا، بە داهێنانی هونەری سواخکردنی ڕەنگاوڕەنگ و گەشەپێدانی کاشی سازی و فەخفوری و جوانکاریەکانی هونەری گلکاری کە تائێستاش ئێران پێی بەناوبانگە[٦٤٢].

ڕەنگە دروستکردنی شاری (سلطانیه) لەنزیك چیای بێستون لەلایەن سولْتان (الجالتو)(٧٠٣-٧١٦ك/ ١٣٠٣-١٣١٦ز)وە، کە بە (سلطان آباد یان چمچمال)یش

---

[٦٣٨] مقدمة، ص٤٧٢.

[٦٣٩] احمد كمال الدين، السلاجقة، ص٢٣٤.

[٦٤٠] الكامل، ج١٠، ص٣٣٣سەرەوەبڕوانە: ابن كثير، البداية والنهاية، ج ١٢، ص١٨١.

[٦٤١] حافظ احمدحمدي، الدولة الخوارزمية، ص٣٠٤؛صادق نشاة، صفحات عن ايران، ص٢٧٩.

[٦٤٢] ولبر، ايران، ص ص٧٣-٧٤؛مرتضى راوندي،تاريخ اجتماعى ايران،ج٧،ص٥٢٥،ص٥٢٧.

ناوبراوه، له دیارترین شوێنەواره ئاواکاریەکانی مەغۆلەکان بێت له کوردستاندا[٦٤٣]، که لەسەر جوانترین تەرزی هونەری بیناسازی مەغۆلی دروستکرابوو[٦٤٤]، دواتریش کرا بەمەڵبەندی کارگێری ویلایەتی کوردستان، که پێشتر شاری (بهار)بووه[٦٤٥]، لەراستیدا دروستکردنی ئەو ویلایەتەش بەیەکێك له دیارترین شوێنەواره کارگێری و شارستانیەکانی مەغۆلەکان دادەنرێت.

بارودۆخی ڕەخساوی دوای لەشکرکێشیەکانی مەغۆل تەنها کاریگەری نەکردە سەر تێکەڵاوبوون و کار لەیەکترکردنی هەردوو هونەری ئیسلامی و چینی، بەڵکو بەریەککەوتنی ئەو دوو شارستانیەی بەشێوەیەکی بەرفراوانتر له جاران بەهۆی هێنان و بردنی دەستڕەنگین و هونەرمەندان له چینەوه بۆ ئێران و بەپێچەوانەشەوه لە لایەن مەغۆلەکانەوه، بەڵکو کاریگەریشی کردەسەر شارستانی ئەورووپا (ڕۆژئاوا) که تا ئەوکات بەدەست دواکەوتوویی و نەزانییەوه دەتلایەوه، هێرشەکانی مەغۆل بۆسەر ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، ئەورووپیەکانیشی بەئاگاهێناو ئەوانیش دەستیان کرد بە ناردنی موژدەدەره مەسیحیەکان و چالاکی جوگرافی ناسانیان زیاتر کرد، بۆ گەیشتن بەو شارستانیەت و پێشکەوتنەی که لە ڕۆژهەڵات هەیە و سودمەندبوون لێی و

---

[٦٤٣] القزوینی،لب التواریخ،ص١٤٦؛کارل بروکلمان،تاریخ الشعوب الاسلامیه،ص٢٩٢،بڕوانە پاشکۆی ژ.(١)، ل١٤٧.

[٦٤٤] العمری،مسالك الابصار،ج٣،ص١٩٩؛زکی محمد مصری،تاریخ نقاشی در ایران،ص٣٧؛برنار أوکان،کنوز الاسلام،ص١٢٤.

[٦٤٥] ئەم ویلایەتە لەشازده شارۆچکەی کوردنشین پێکهاتبوو، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:حمداللە مستوفی،نزهة القلوب،ص١٠٧؛لسترنج، بلدان الخلافة الشرقیة،ص ص٢٢٧-٢٢٨؛زرار صدیق،کوردستان فی القرن الثامن،ص٤٧.

گواستنەوەی بۆ ئەورووپا[٦٤٦]، توێژەرێکیش پێی وایە لەشکرکێشی مەغۆل کاریگـەری ناڕاسـتەوخۆی لــە بوژانــەوەی ئــەورووپادا کــردووەو لەخــەوی غەفڵــەت بەخەبــەری هێنـاوە[٦٤٧]،کـە سـەر ئـەنجام لەسـەر ئاستی جیهـانی بەیەکداکێـشانی ئـەم سـێ شارستانیەی لێکەوتەوە.

---

[٦٤٦] بەدوور نازانرێت لەڕیشەی مێژووی ململانێ و بەیەکداکێشانی هەرسێ شارستانی ئیسلامی و چینی وڕۆژئاوا بۆ ئەو قۆناغەی مێژوو بگەڕێتەوە، کە ئەمڕۆش توێژەران و پسپۆڕانی ئەم بوارەی سەرقاڵ کردوە و دەیان لێکۆڵینەوە و نووسینی جۆربەجۆریان لەوبارەوە نووسیوە، دیارترینیـان نووسـینەکەی (سـامۆیل هانتنکتون) بەناوی (بەیەکداکێشانی شارستانیەتەکان) کـە ڕێـك ئامـاژەی بـۆ ململانێـی سـەختی ئەوسـێ شارستانیە کردووە.

[٦٤٧] حافظ احمد حمدي، الدولة الخوارزمية، ص ص٣٠٥-٣٠٦.

## باسی سێیەم/ شوێنەوارە ئایینی و مەزهەبییەکان:

بەرئەنجامەکانی لەشکرکێشی هێزەکان هەر تەنها ئەوانە نەبوون کە لە تـەوەرەکانی دیدا باسکران، بەڵکو بواری ئـاییـنی و مەزهـەبیش وەك کایـەکی گـرنگ و بەرچـاوی کۆمەڵایەتی کەوتنە ژێرکاریگەری ملململانێ سیاسیەکان و بارتەقای شەڕە خوێناویەکان شوێنەواری لەسەر ئەم لایەنەش بەجێهێشتووە، کە لەم باسـەدا گـرنگترین لایەنـەکانی دەخەینە ڕوو.

## یەکەم/ شوێنەوارە مەزهەبییەکان:

بوەیهییەکان هەر لەگەڵ دەستگرتنیان بەسـەر بەغـدا دا، بـە خـوێن گەرمییـەوە سیاسەتێکی توندی شیعەگەرییان پەیڕەوکرد، کە لە ئەنجامدا سـەرباری قوڵبوونـەوەی پەیوەندی دوژمنکارانەی مەزهەبی و تیرەگەری، کارەساتی گەورەی خوێناوی لـە نێـوان شیعەو سوننەدا لێکەوتەوە، کاولکاری و تالآنکاری زۆری بەدوای خۆیـدا هێنـا، ئـەوان هەر لەبەر جیاوازی مەزهەبی دانیان بەڕەوایی خەلافەتی بنەماڵەی عەبباسیدا نـەدەنا، پێیـان وابـوو ئـەوان بـەزۆر خەلافـەتیان زەوتکـردووە[٦٤٨]، لەبەرئـەوە بەدرێـژایی فەرمانڕەوایی خۆیان سوکایەتی زۆریان بە خەلافەتی عەبباسی کرد[٦٤٩]، زیاتر لەوەش

---

[٦٤٨] ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص١٦٠؛فاضل الخالدي،الحياة السياسية،ص١٠؛محمدحسين الزبيدي،العراق فى العصر البويهى،ص٣٤.

[٦٤٩] (معزالدولە)ی بوەیهی بەداناني( معزالدين لله العلوى) بە خەلیفە بیری لـە هەڵوەشـاندنەوەو گۆڕینی خەلافەتی عەبباسی بەخەلافـەتێکی عەلـەوی (شـیعە)کردەوە، بـەڵام لـە دەرئەنجامـە خراپـەکانی ئاگـادار کرایەوە بۆیە جێبەجێی نەکرد،ابن الأثير،الكامـل،ج٧،ص١٦٠،یـانیش لەرێگـەی هاوسـەرگیری سیاسـیەوە هەوڵیاندا ئەم کارە بکەن،بڕوانە: ابن الطقطقى،الفخرى،ص٢٥٤.

دوژمنایەتی خۆیان بۆ بنەماڵەی (ئومەوی) دەربڕی، کاتێک معزالدولە ساڵی(٣٥١ك/٩٦٢ز) بڕیاری سوکاتی پێکردنیانی دا بە نووسینی نامەو هەڵواسینی بە دیواری مزگەوتەکاندا، کە تیایدا نەفرەت لە (معاویەی کوڕی ابی سفیان) و کۆمەڵێ لەیارانی (پێغەمبەر)(د.خ) بە ناڕاستەوخۆ کرابوو[٦٥٠]، ئەو سیاسەتە شیعەگەرییە توندەی میرەکانی بوەیهی بە تایبەت لە بەغدا شەڕ و ئاژاوەی زۆری لێکەوتەوە، بە جۆرێك کە دوژمنایەتی نێوان شیعە و سونە پێی نایە قۆناغێکی نوێوە هەرجارەو ڕووداوێکی سادە دەبوو بەهۆی شەڕو ئاژاوەیەکی گەورە و خوێناوی و سوتانی بازاڕو مزگەوت و تاڵانکاری و بەڕەوا دانانی ڕشتنی خوێنی یەکتری[٦٥١].

بوەیهیەکان بە ئامانجی بە شیعەکردنی کۆمەڵگە هەوڵی زۆری خۆنزیککرنەوەو پشتگیریکردنی زانایانی شیعە بە نووسین و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانیان و دروستکردنی دەیان مەڵبەندی زانستیاندا، کە بەشێوەیەکی لۆژیکیانە بیروڕاکانی شیعەیان تێدا دەخوێندرا و بڵاودەکرانەوە[٦٥٢].

لە بەرامبەر پرۆسەی بە شیعەکردنی کۆمەڵگای ئیسلامیداو لە سەردەمی خەلیفە القادربالله (٣٨١-٤٢٢ك/٩٩١- ١٠٣٠ز) جیاواز لە خەلیفەکانی دی بەهەستکردنی بە مەترسی ئەنجامەکانی ئەم پرۆسەیە بە زراندنی ڕەچەڵەك و بیروباوەڕەکانی فاتمیەکان و بڵاوکردنەوەی ئەو پڕوپاگەندانەش لە گشت ناوچەکانی سنووری قەڵەمڕەوی

---

[٦٥٠] ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٧؛النويري،نهاية الارب،ج٢٦،ص١٠٩؛ السيوطي،تاريخ الخلفاء،ص٣١٥.

[٦٥١] بۆ نموونە بڕوانە:ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٨٨،ص١٥٣،ص١٦٣،ص ص١٦٨-١٦٩؛ بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: فهمي سعد،العامة في بغداد في القرنين الثالث والرابع للهجرة،ص ص٤٨٠-٤٨٧.

[٦٥٢] لەم بارەیەوە بڕوانە: الماوردي،قوانين الوزارة، مقدمة محقق،ص٤٠؛عبدالعظم رضايى،تاريخ ده هزارساله ايران،ج٢،ص٣٨١؛ رشاد بن معتوق، الحياة العلمية في العراق خلال العصر البويهي،ص١٠٢ وما بعدها.

خەلافەتی عەبباسیدا[٦٥٣]، خەلافەت چەند هەنگاوێکی بۆ بەرپوودا وەستانەوەی هەژموونی فاتمیەکان و شیعە هەڵێنا[٦٥٤]، هەموو ئەو هەنگاوانەش بە بێداربوونەوەیەکی چالاکی سوننە دادەنرێن لە بەرامبەر ئایینزای شیعەدا[٦٥٥].

کوردستان لەو رووداو و گۆڕانکاریانەی کە بە گشتی بەسەر جیهانی ئیسلامی و بەتایبەت بەسەر مەڵبەندی خەلافەتی عەباسیدا هاتوون بەدوور نەبوو، بەڵام رادەی کاریگەری و شوێنەواری سیاسەتی بە شیعەگەرایی بوەیهیەکان وەك یەك كاری لە هەموو ناوچەکانی کوردستان نەکردووە، بەڵکو بەگوێرەی دوورو نزیکییان لە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی بوەیهیەکان و شانۆی رووداوە سیاسیەکان گۆڕاوە، سیاسەت و پەیوەندی میرە کوردەکانیش رۆڵی لە کەوتنە ژێر کاریگەری سیاسەتی مەزهەبی دەوڵەتەدا بینیوە، لەو نێوەندەدا رەنگە ناوچەکانی هەرێمی چیاکان و رۆژئاوای هەرێمەکە دیارترینی ئەو هەرێمانەبن کە کاریگەری ئەو سیاسەتەی بوەیهیەکانیان بەسەرەوە دەرکەوتووە، لەوانەش ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی میرنشینی حەسنوەیهی و هۆزی (بەرزیکانی)، بەتایبەت سەردەمی فەرمانڕەوایی میر بدر (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٤ز)، کە چەند ئاماژەیەك لەسەر بە شیعەبوونی ئەو میرە کوردە هەن، پەیوەندی بەهێزیشی بەبوەیهیەکانەوە بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایی، پێدەچێت وەك وەفایەك بەرامبەر بە عضدالدولة بووبێ، کە هاریکاری سەرەکی میرایەتی میر بدر بوو[٦٥٦]، قبوڵی مەزهەبی شیعەشی کردبێت، هەربۆیە ساڵانە پارەیەکی زۆری بۆ

---

[٦٥٣] ابن الجوزي، المنتظم،ج٧،ص ص٢٥٥-٢٥٦.

[٦٥٤] الماوردي، قوانين الوزارة،ص٥٠؛ابراهيم خليل السامرائي،تاريخ الدولة العربية،ص١٦١؛محمود عرفة محمود،الأحوال السياسية والدينية،ص٦٣.

[٦٥٥] الماوردي،قوانين الوزارة،ص٧١؛فهمي سعد،العامة في بغداد،ص٤٨٧.

[٦٥٦] الروذراوري،ذيل تجارب الأمم،ج٦،ص ص ١١-١٢؛ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٢٧٢.

نوێکردنەوەو خزمەتکردنی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە لە کوفە و بەغدا و خانەدانەکان و زانایان خەرج دەکرد[٦٥٧].

سەرەڕای هەموو ئەوانەش میر بدر جیاواز لەمیرەکانی دی، لەلایەن بنەماڵەی بوەیهییەوە زۆر لە چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانیان، گوێڕایەڵی ڕاوڕاوێژی ئەو میرە کوردە بوون[٦٥٨]، زیاتر لەوەش (ابوعلی الخطیر) وەزیری ناوداری (مجد الدولە)ی بوەیهی میر بدری بە(سیدنا) بانگ دەکرد[٦٥٩]، دەشکرێت قبولکردنی مەزهەبی شیعە لەلایەن ناوبراوەوە و ئەو هەنگاوانەش کە لەم بارەوە هەڵیهێنا، تاکتیکێکی سیاسی و بەمەبەستی سۆز ڕاکێشان و بە دەستهێنانی پشتگیری میرەکانی ئەو بنەماڵەیە بووبێت، ناشتنیشی لە نارامگای (ئیمام علی)(خوالێی ڕازی بێت) لەکوفە[٦٦٠]، زیاتر ئەو ئەگەرانە دەسەلمێنێ کە میر (بدر) لەسەر مەزهەبی شیعە بووبێت ، دەشێ هەڵکەوتەی جوگرافی ناوچەکەو هاوسنووری لەگەڵ بوەیهیەکان هۆکارێکی یارمەتیدەری دی بووبێت، بۆ تێکەڵاوبوون لەگەڵیانداو کەوتنە ژێرکاریگەری و بە شیعەبوونی دانیشتوان، بەتایبەتیش لوڕستان[٦٦١]، توێژەرێکیش مێژووی بڵاوبوونەوەی ئەو مەزهەبەی بەگشتی گێڕاوەتەوە بۆ سەدەی (چوارەم کۆچی/دەیەمی زایینی)[٦٦٢]،

---

[٦٥٧] الروذراوري،ذیل تجارب الأمم،ج٦،ص١٧٢؛ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٢٧٢.

[٦٥٨] بۆنموونە ڕۆڵی لەکێشەی نێوان (سیدە)و شمس الدولە دا، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا،بگەڕێوە بۆ شوێنەوارە سەربازیەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[٦٥٩] هلال الصابی، جزء الشامن من تاریخ هلال الصابی،ج٧,ص٦٨؛ حسام الدین نەقشبەندی،شارەزوور،ل٠٣٩.

[٦٦٠] ابن الجوزي،النتظم،ج٧،ص٢٧٢؛ابن الأثیر،الكامل،ج٧،ص٥٩٦؛ابن كثیر،البدایة والنهایة،ج١١،ص١٥٤.

[٦٦١] رمضان الداودي،لورستان الكبری،ص١٣٩.

[٦٦٢] حسام الدین نەقشبەندی،شارەزوور،ل١٧٩.

لەسەرچاوەیەکیشدا ئاماژە بۆ دانیشتوانی شاری (نهاوند) کراوە لە سەدەی (هەشتەمی کۆچی/چواردەمی زایینی)دا کە دانیشتوانی لەسەر مەزهەبی (شیعە) بوون[٦٦٣]، پەیوەستبوونی بەشێك لە دانیشتوانی گۆران و لورستان و دەوروبەری کرماشان و سنە و خانەقین تا ئەمڕۆش بەو مەزهەبەوە[٦٦٤]، ڕادەو شوێنەواری ئەو کارتێکردنە دەردەخەن کە باسیانکرا.

موسڵمانبوونی سوڵتانەکانی ئیلخانی لایەکەوە و پیادەکردنی مەزهەبی شیعە لە لایەکی ترەوە کاریگەری هەبوو لەسەر سەرلەنوێ بوژانەوەی ئەو مەزهەبە، لەوانەش سوڵتان غازان (٦٩٤-٧٠٣ك/١٢٩٤-١٣٠٣ز)، بەڵگەی زۆریش هەن باسیان لە شیعەبوونی کردووە، لە بایەخدانی و ئاوەدانکردنەوەی شوێنە پیرۆزەکانی شیعەو سەردانی بەردەوامی بۆ (نەجەف و کەربەلا) و بوژانەوەی بیری شیعەگەری بەتایبەتی لە ئێران، بەڵگەی شوێنەواری ئەو سیاسەتەیە[٦٦٥]، دوای ئەویش سوڵتان (خربندای کوڕی ئەرغون) (٧٠٣-٧١٦ك/١٣٠٣-١٣١٦ز)ی برای جێگەی گرتەوەو دوای موسوڵمان بوون و گۆڕینی ناوی خۆی بۆ (محمد)، بە سەرسەختیش مەزهەبی شیعەی پەیڕەوکرد[٦٦٦]، لە ئەنجامی هەموو ئەمانەشدا دواتر چەند گروپێکی شیعەگەری دەرکەوتن، کەداوای چاکسازی کۆمەڵایەتییان دەکردو هەندێکیشان بوونە جوڵانەوەیەکی چەکداری (جهادی)، کە دواجار گەشەکردنی مێژوویانەی ئەم جۆرە بزوتنەوانە بوو، بزاڤی شیعەگەری (صفوی) لێ بەرهەم هات[٦٦٧]، هەموو ئەمانەش بە شیعەمانەوەی ئێرانیەکانی لێکەتەوە تاکو ئەمڕۆ، ئەو

---

[٦٦٣] القزويني نزهة القلوب،ص٧٤.

[٦٦٤]) فیلیپ کرینبروك، کولتور و ناسنامەی کورد،ل ١٤٩.

[٦٦٥] القزويني،تاريخ گزيده،ص٦٠٢؛ بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە:مصطفى طه بدر،مغول ايران،ص٣١ ومابعدها.

[٦٦٦] ابن خلدون،العبر،ج٥،ص٦٤٩، القلقشندي،مآثر الإنافة،ج٢،ص١٢٨.

[٦٦٧] ناديا إيبو جمال، الناجون من الغزو المغول،ص ص١٤٤-١٤٥.

سیاسەتەش کە لەم بارەیەوە پەیڕەودەکرا کاریگەری کردۆتە سەر پەرەگرتنی مەزهەبی شیعە لەنێو کوردو بەشیعەمانەوەی بەشێکی دانیشتوان، بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەمەش بە شوێنەواری چالاکی شیعەگەری دەزانرێت کە هەر لە سەردەمی بوەیهیەکانەوە دەستی پێکرد و تادواتریش درێژەی کێشاوە.

لەکۆتایی سەردەمی بویهیەکان کوردستان کەوتە ژێر کاریگەری ڕووداوە سیاسیەکان و ململانێی نێوان شیعەو سونە بەتایبەت فاتمیەکان و بزووتنەوەی بساسیری، کە بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعەو هەوڵدان بۆ گۆڕینی مەیلی میرو سەرۆك هۆزەکان بەلای فاتمیەکاندا لە چالاکیدابوو[٦٦٨]، ئەو بزووتنەوەیە سەرباری ئەوەی لە ڕووی سەربازی و سیاسییەوە کاری کردە سەر کورد، لە ڕووی مەزهەبیشەوە کاریگەری خۆی هەبووە، ئەم کارتێکردنە بەڕوونی لەسەر میر ابوالفتح بن ورام الجاوانی و هۆزی (جاوانی-گاوانی) دەرکەوت، بەچوونە ناو بزووتنەوەکە، بەدووریش نازانرێت کە مەزهەبی شیعەشیان قبوڵکردبێت[٦٦٩]، بەتایبەت ئەو بەشەی هۆزی گاوانی کەلەپاڵ مەزیدیەکان لە شاری حیللە نیشتەجێبوون[٦٧٠]، کە هەروەك (ابن بطوطة) ئاماژەی کردووە، کە دەڵێ: ((خەڵکی شاری حیللە هەموویان دوازدەئیمامی بوون، کە لە دوو تیرە پێکهاتبوون یەکێك لەوانە بە کورد ناسراون[٦٧١]))، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەشیعە مانەوەیان تانیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی کۆچی/چواردەمی زایینی.

بەڵام، میر نصرالدولەی مەڕوانی نەکەوتە ژێر کاریگەری سیاسەتی مەزهەبی بزووتنەوەکەو بەردەوامیش بوو لە خوێندنەوەی وتار بۆ خەلیفەی عەبباسی و سەلجوقیەکان

---

[٦٦٨] المقريزي، اتعاظ الحنفا،ج٢،ص٢٣٢.

[٦٦٩] بڕوانە: المؤيد في الدين: سيرة المؤيد،ص ص ١٣١-١٣٢،ص١٤٤؛ آواز محمد عبدالكريم،الكورد الجاوانيون،ص ص٧١-٧٢؛خانزا صباح محيي الدين، علاقة الدولة الفاطمية بالكرد،ص ص٧٠-٧١.

[٦٧٠] السبكي،طبقات الشافعية الكبرى،ج٣،ص٣٩١.

[٦٧١] رحلة ابن بطوطة،ج١،ص١٩٦.

و ناردنی یارمەتی بۆ سوڵتان طغرل بك[٦٧٢]، هەڵوێستی ئەو لەپێناو پاراستنی ناوچەکە لە شوێنەوارە خراپەکانی ململانێی نێوان هەردوو لایەنی ناکۆك زیاتر سیاسی و تـاکتیکی بووە، کەچی هەندێ ناوچە هەرکەوتنە ژێرکاریگەری بزووتنەوەکە، بۆ نموونە شارێکی وەکو سنجار واپێدەچێت، کە شالاوی غوزە تورکمانیەکانی ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز) یان بۆ سەر شارەکە لەبیرنەچوو بێتەوە[٦٧٣]، بۆیە لەشەڕی سنجاری نێوان سوپای سەلجوقی و بساسیریدا ساڵی (٤٤٨ك/١٠٥٦ز) پاڵپشتیاندایە پاڵ بزوتنەوەی ناوبراو و چالاکی دیاریان دژی سـوپای سەلجوقی پیشاندا، کەتیایدا سوپای سەلجوقی خـراپ شـکا[٦٧٤]، لـەژێر کاریگـەری ئـەو ڕووداوانە مـەزهەبی شـیعەش لـەناو خـەڵکی شـارەکەدا بڵاوبۆتـەوە[٦٧٥]، سـەربارەت بـە ناوچەکانی دی ژێر قەڵەمڕەوی میرنشینی مەڕوانی توێژەرێك بەدووری نازانێـت سیاسـەتی مـیانڕەوانەی میرەکانی میرنشینەکە بەرامبەر بە ئاین و مەزهـەب و کەمینـە نەتـەوەکان بووبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی مەزهەبی شیعە لە ناوچەکانی دیاربکر و میافارقین...، یـانیش لەژێر کاریگەری سیاسەتی بەشیعەکردن و چالاکیەکانی فاتمیەکان لە ناوچەکەداو وە یـان لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی وەزیر بنەماڵەی مەڕوانی (ابوالقاسم حسین بن علی المغربی)[٦٧٦] کە لەسەر مەزهەبی شیعە بووە[٦٧٧].

---

[٦٧٢] ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص١٤٣؛عبدالرقیب یوسف،الدولة الدوستکیة،ج٢،ص٣٧.

[٦٧٣] ابن الأثیر،الکامل،ج٧،ص٧٢٢؛ابن العبری،تاریخ الزمان،ص٩٣.

[٦٧٤] المؤید فی الدین, دیوان المؤید فی الدین,ص٤٤؛المقریزی، اتعاظ الحنفا،ج٢,ص٢٣٤؛خانزاد صباح محی الدین،علاقة الدولة الفاطمیة بالکرد،ص٧١.

[٦٧٥] موسی الحسنیاني،سنجار،ص١٤٦،ص١٦٤.

[٦٧٦] حسین کوڕی علی(٣٧٠-٤١٨ك/٩٨٠-١٠٢٦ز) کە خـەڵکی مـصربووەو کەسـایەتیەکی شـارەزاو عـاقڵمەندبووە,ماوەیەك خزمەتی بوەیهیـەکان و وەزیـری نـصرالدولەی مـەڕوانی بـووە، ابـن خلکان،وفیـات الأعیان،ج١،ص٢٧٦.

[٦٧٧] عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة،ج٢،ص ص١٦٣-١٦٤.

**دەرکەوتنی سەلجوقیەکان بەسەردەمی زێڕینی سونە و شکستی شیعە لەڕووی سیاسی و فکری دادەنرێت، بەتایبەت کە ئەوان سیفەتی دەشتەکیەتی لەسەر لایەنی ئایینیشیاندا ڕەنگی دابۆوە، سورو دەمارگیری بوون لەسەر پەیوەست بوون بە ئیسلام و سۆزو مەیلیان بۆ مەزهەبی سونەش بەهێز بوو[٦٧٨]، بۆیە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە چالاکانە ڕووبەڕووی پرۆسەی بە شیعەکردنی کۆمەڵگای ئیسلامی وەستانەوە، بۆیە دەشێ بووترێ کە لە سەر ئاستی سیاسی لەناوبردنی بزووتنەوەی بساسیری و کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی بوەیهی ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) وەك دوو سومبولی مەزهەبی شیعە، چەندە شکست بوون بۆ وەستاندنی چالاکی شیعەگەری ئەوەندەش سەرکەوتنی مەزهەبی سونەی دەگەیاند.**

**لەسەر ئاستی هزریش بەکردنەوەی فێرگەکانی (نظامیة) بۆ پێگەیاندنی وەچەیەکی ڕۆشنبیرو زانا لەسەر بنەماکانی ئەو مەزهەبەو ناردنیان بۆ هەموو ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی سەلجوقی و بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شافعی ڕووبەڕوبونەوەی بیرو باوەڕەکانی شیعەو گروپی ئیسماعیلیە (باطني)[٦٧٩]، وەرچەخانێکی گەورەیان بەسەر بوژانەوەی**

---

(٦٧٨) الراوندي، راحة الصدور،ص ص١٦٠-١٦١؛عبدالنعيم حسنين،سلاجقة،ص٢٠؛اربرى والأخرون،تاريخ اسلام،ص ص٢١٤-٢١٥.

(٦٧٩) ئیسماعیلیەکان: گروپێکی توندڕەوی (علوي)بوون، ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ (اسماعيل بن جعفر الصادق)، مێژووی دەرکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (٢ك/٨ز)، درێژەیان بە چالاکیەکانیانداو بەناوی جیاجیا دەرکەوتوون لەوانەش بە(باطني)ناسرابوون، کە بڕوایان وابوو بۆ هەر دیار(ظاهر)ێك نادیار (باطن)ێك هەیە، لەسەردەستی الحسن الصباحي سەرکردەیان لەسەدەی(٥-٦ك/١١-١٢ز)دا بوون بەگەورەترین گروپی غافلکوژی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، وەبە(حشاشيەکان)یش ناسرابوون،البغدادي،الفرق بين الفرق،حقق اصوله محمد محيي الدين،دار الطلائع،(القاهرة:٢٠٠٥م)،ص٢١١؛نظام الملك،سياست نامة،ص ص ٢٤٨-٢٧٢؛برناردلويس،الحشاشون (فرقة ثورية في تاريخ الإسلام)،تعريب محمد العزب موسى،الطبعة الثانية،مكتبة مدبولي،(القاهرة:٢٠٠٦م).

مەزهەبی شافعی داهێنا، نظام الملك دەركی بە مەترسی بیروباوەڕەكانی ئەم ڕێبازەوە كرد لەسەر كۆمەڵگای ئیسلامی، كە ڕێگاو شێوازی زانستی و فیكرییان، بۆ تێكدانی بیروهۆشی خەڵك و سۆز جوڵاندیان بەلای خۆیاندا پەیڕەو دەكرد، لەبەرئەوە نظام الملك پێی وابوو ڕووبەڕووبوونەوەی لۆژیك بە لۆژیك دەبێت و شێوازی توندو تیژی و خوێناوی سەركەوتن مسۆگەر ناكات، بۆیە عەقلانی و زانستییانە بەرووریاندا وەستایەوە، ئەویش بە كردنەوەی دەیان فێرگەی لەو جۆرە لەناوچە جیاجیاكانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا[٦٨٠]، گەشەكردن و بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی مەزهەبی شافعیش لە دیارترین بەرئەنجامەكانی ئەو كارەی بووە[٦٨١].

لەڕاستیدا ئەو سیاسەتەی وەزیری ناوبراو لەسەر ئاستی مەزهەبیی، كاریگەری و شوێنەواری زۆری لەسەر كۆمەڵگای كوردی بەجێهێشت، شافعی بوونی زۆرینەی كورد، ڕەنگە لە دیارترینی ئەو شوێنەوارانە بێت، كە بەهۆی كردنەوەی فێرگەكانی (نظامیة) و خوێندنی زانایانی كورد لەسەر بنەماو پێڕۆكانی و كاركردن بەڕاو بۆچوونەكانی (ئیمام شافعی) لە چارەسەركردنی كێشە وگرفتەكانی خەڵك و مەراسیمە ئایینیەكانی دیدا، هۆكاری یارمەتیدەربوون بۆ بڵاوبوونەوەی لە كوردستاندا[٦٨٢]، كە دواتر هەر لەژێر ئەوكاریگەریە ئەیوبیەكانیش بەتایبەتیش صلاح الدین (م.لە٥٨٩ك/١١٩٣ز) پەیڕەوی لەو ڕێبازە كردووە، كە لەسەردەستی زانایانی (نظامیة) وەری گرتووە[٦٨٣]،

---

[٦٨٠] السبكي،طبقات الشافعية،ج٣،ص٦؛حسين أمين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي،ص٢٢٣؛ مريزن سعيد مريزن،الحياة العلمية في العراق،ص٢٦٢.

[٦٨١] اليافعي،مرآة الجنان،ج٣،ص٦٠؛ابن العماد الحنبلي،شذرات الذهب،مج٢،ج٣،ص٢٩٥.

[٦٨٢] بۆ نموونە بڕوانە: سامي بن خماس الصقار،أربيل،ص ص١٧١-١٧٥.

[٦٨٣] صلاح الدين لەلای زانای گەورەی شافعی (قطب الدين النيسابوري) (مردووەلە٥٧٨ك/١١٨٢ز) كە دەرچوویەكی نظامیة بووە،زانستی وەرگرتووە،هەرلەلایەن ئەو زانایەشەوە پوختەی بیروباوەڕەكانی (عقیدە) ئیسلامی لەسەر بنەماكانی مەزهەبی (شافعی)پێ وتراوە و لەبەریكردووەو لەژیانیشیدا ڕەنگی داوەتەوە،

بەکردنەوەو دامەزراندنی فێرگەی زانستی سەر بەو مەزهەبەو بایەخدانی بە بوژانـەوەی ژیانی زانستی و شارستانی بە تایبەتیش لایەنی ئـاییـنیش رۆڵـی گرینگـی گێـڕا لـە بلاوکردنەوەیدا، ئەمەش کوردی زیاتر وابەستەی ئـەو مەزهەبـە کـرد، بـەجۆرێك کـە توێژەرێك پێی وایە هۆکارێکی دی شافعی بوونی کـورد کاریگـەری دەوڵـەتی ئـەیوبی بووە کە ئەو مەزهەبەیان بەفەرمی وەك ڕێبـاوەڕی دەوڵـەت پـەیڕەو کـردووە[٦٨٤]، ئـەو کاریگەریەش شوێنکارێکی ئەرێنی لەسەر باری ئایینی کورد بەجێهێـشتووە، کـە لـە پەیوەستبوونی بە بیروباوەڕی ئیسلام و جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینیـەکان و دڵـسۆزی و خەمخۆری و خزمەتکردنی لـە بـواری پراکتیکـی و زانـستی (واتـایی)دا دەرکـەوتووە، چونکە ئەو مەزهەبە جیاواز لەوانی دی بەزۆری لـە ڕاڤـەکردن و شـیکردنەوەی ڕێـسا ئایینی و کۆمەڵایەتیـەکان پـشتی بـە تێکـستەکانی قورئـانی پـیرۆز و فـەرمودەکان بەستووە و کەمترین لای لە (نەریت) کردۆتەوە، ئەمەش وایکردووە کە کورد موسڵمانی تۆخ و باش بن[٦٨٥].

---

بهاءالدين ابن شداد،سيرة صلاح الدين الأيوبي (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية)،تحقيق محمد حسني مصطفى،دارالقلم العربي،(حلب:٢٠٠١م)،ص١٤.

[٦٨٤] انور مائي، الأكراد في بهدينان،ص ص٩٤-٩٥.

[٦٨٥] رشاد ميران،ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لەکوردستاندا،ل٥٥.

## دووەم/ سۆفیگەری:

سۆفیگەری (تصوف)[٦٨٦]یش وەك ڕێگایەك بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئـارامی و ئاسوودەیی دەروونـی، سـەرهەڵدان و گەشـەکردنی پەیوەندییـەکی زۆری بـەبارودۆخی خولقاوی دوای لەشکرکێـشی هێزەکانـەوە هـەبووە، وەك بزووتنەوەیـەکی ناڕەزایـەتی و بێزاری خەڵك، دژ بەدۆخی کۆمـەڵایەتی و ئـابوری داسـەپاو و ڕۆچـوونی دەسـەڵاتداران بەژیانی ڕابواردن و هەوەسبازی و شەڕو ململانێی نێوان گروپ و مـەزهەبە ئایینیـەکان و لادان لە ڕاستە ڕێ و کرۆکی ئاییـنـدا، لەبەرامبەریـشدا فەرامۆشـکردنی کاروبـاری خەڵك ڕووبەڕووبوونەوەیان بە ژیانێکی هەژاری و پڕ لەکێشەو باڵکێـشانی ڕەشـبینی و بـێ ئومێـدبوون لـە چارەسـەری ئـەو بارودۆخـە[٦٨٧]، بۆیـە شـتێکی ئاسـاییە کـە سەرهەڵدانی سۆفیگەری بەسترابێتەوە بە بارودۆخی کۆمـەڵایەتی، بەشێوەیەك عیرفان و سۆفیگەری بەرهەمی هەژاری و نائومێدی و لاوازی و بێتوانایی ئەنـدامانی کۆمـەڵ و ئەو چینانە بووبێت، کە لـە تـام و چـێژوەرگرتن و خۆشـیەکانی ژیـان بێبەشـن و بـە پۆشینی جلوبەرگی شڕو خوری و خۆ دوورە پەرێزگرتن لەخەڵك و ڕۆچوون لە ئەندێـشە و خەیاڵدا لە خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ ژیـانی (خواپەرسـتی) و زوهـد واقیعـی حـاڵی خۆیان ڕاگەیاندبێت[٦٨٨]، تا ئەو ڕادەی پەیوەستبون بەژیانی هـەژاری و دوورکەوتنـەوە

---

[٦٨٦] زاراوەی سۆفی لەوشەی(صوف) واتە (خوری) وەرگیراوە, کـە بـەهۆی لەبـەرکردنی جلوبـەرگی خـوری لەلایەن سۆفیەکانەوەئەم ناوەیان لێنراوە،ابن خلدون،مقدمـة،ص٥٢٢؛نیكلـسون، فـی التـصوف الاسـلامی وتاریخه، مطبعـة لجنـة التـألیف والترجمـة، (القـاهرة:١٩٦٩م)،ص١؛محمـد رئـوف توکلي،تـاریخ تـصوف در کوردستان،گلبان چاپ،چاپ دوم،(تهران:١٣٨١)،ص٢٨.

[٦٨٧] عبدالنعیم حسنین،سلاجقة،ص١٧٣؛احمد کمال الدین،السلاجقة،ص١٩٨.

[٦٨٨] ابن خلدون،مقدمة،ص٥٢٢؛ محمدرئوف توکلي، تاریخ تصوف در کوردستان،ص٣٩.

له خۆشیەکانی ژیان بەیەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی سۆفیزم دانراوە[٦٨٩]، ئەو جۆرە (خواناسی)و زوهدەش لە بنەڕەتدا بریتی بوو لە جۆرە ناڕەزایەتیەك بە دەربڕینی لە فۆڕمی گۆشەگیری و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگا و پەنابردن بۆ هێزێکی نادیار تاچارەسەری کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتیەکانی بۆ بکات، بەو مانایە لە جیاتی ئەوەی لە هەوڵدابێ بۆ گۆڕینی بارودۆخی خراپی داسەپاوو ستەمی باوی ناو کۆمەڵگە بەبارێکی ئەرێتیدا، زیاتر مرۆڤ دەکاتە بوونەوەرێکی خەیاڵاوی و چەندە لەواقیع دووری دەخاتەوە ئەوەندەش چاوی پێدەبڕێتە ئاسمان و هیوای خۆشگوزەرانی و بەختیاری و دنیایەکی باشتری لەوەدا بۆ بەرجەستە دەکات کە بەیەکتاپەستی و عیرفان پێی دەگات[٦٩٠]، وە تەواوی ژیان و مردنی بە(خوا)وە پەیوەست دەکات[٦٩١].

ئەو ڕاستیەش لەگەڵ سەرهەڵدان و گەشەکردنی مێژوویانەی سۆفیگەری لە کوردستان گونجاوە،کە بەتایبەت لە(سەدەی چوارەمی کۆچی/دەیەمی زایینی)یەوە بەهۆی شەڕو شۆڕو ئاتوقری و ناهەمواری بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە سایەی لەشکرکێشی و داگیرکاریە دەرەکیەکان، وێڕای ڕۆچوونی میرانی بوەیهی لەنێو ڕابواردن و ئارەزووبازی و لادان لە بنەماکانی ئایین و وەسەریەکنانی سەروەت و سامان و پروپاگەندەی مەزهەبگەرایی، لە بەرامبەردا خەڵکانێك بۆ تێوەنەگلان لەو ڕەوشە، دەستگرتنیان بەئایین و ژیانی سادەو ساکاری گۆشەگیری سۆفیگەرییان هەڵبژارد، لە چەرخی (پێنجەمی کۆچی/یازدەیەمینی زایینی)یشدا جارێکی دی شەڕو ململانێی سەلجوقی و زوڵم و زۆری وایکرد فەرهەنگی سۆفیگەری بەرەو پەیدابکاتەوە، ڕووداوە دڵتەزێن و هێرشە پڕکارەسات و زۆرداریەکانی مەغۆلیش لە چەرخی (حەوتەمی

---

[٦٨٩] السهروردي،عوارف المعارف،دار الكتب العلمية،(بيروت:٢٠٠٥م)،ص٣٧؛الجرجاني،التعريفات،مكتبة لبنان،(بيروت:١٩٨٥)،ص٦٢.

[٦٩٠] ابن خلدون، مقدمة،ص٥٢٢؛نيكلسون،في التصوف الاسلامي،ص١٠١.

[٦٩١] السهروردي، عوارف المعارف،ص ص١٩٩-٢٠٠.

کۆچی/سیّزدەیەمی زایینی)دا، کە بوونە هۆی تێکڕمانی باری کۆمەڵایەتی و نزمبوونەوەی ئاستی گوزەرانی خەڵك، سەرهەڵدانەوەو نوێبوونەوەی بیری سۆفیگەری بەدواوەبوو، کە هەڵگری پارێزەری بیروڕای عیرفانی و فەلسەفی چەرخی ڕابردوو بوون، بوونە هۆی ئەوەش کە ئەو ڕێبازە ڕەنگی تازە بەخۆوە بگرێ و ڕۆڵێکی کاراو گرنگیشی لەو سەردەمانەدا گێڕا[٦٩٢]، کەواتە ڕێبازی سۆفیزم هەربریتی نەبوو لە بانگەشە بۆ پەیڕەوکردنی کتومتی شەریعەت، بەڵکو لەهەمان کاتدا نیشانەی هاتنی چەرخ و قۆناغێکی تازەبوو کە مۆرکی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و ئایینی پێوەبوو، چونکە ئایینیش وەك هەر دیاردەیەکی تری کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ژێرکارتێکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەڕەوشی ئابووری و کەلتوری و فکری کۆمەڵگادا ڕوودەدەن[٦٩٣].

هەرچەندە ناتوانرێت بوترێت کەدەرکەوتنی سۆفیگەری دەرئەنجامی لەشکرکێشیەکان بووە، چونکە سەرهەڵدانی کۆنترەو هەرتایبەتیش نیە بە پانتایی کورد، بەڵام بەدڵنیایەوە ئەو ناسەقامگیری و ناهەمواریە کۆمەڵایەتی و ئابووریانەی لە سۆنگەی ئەو بارودۆخەوە هاتنە گۆڕێ کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر پەرەگرتنی سۆفیگەری، جێی ئاماژەیە کە لەنێوبزاڤی سۆفیگەری ئیسلامیدا دەیان سۆفی و پیاوچاك و زاهیدی کورد هەبوون، کە بوونەتە پێشەنگ و ڕابەری ئەم بزاڤە لە کوردستانداو ڕۆڵی گەورەیان لە بلاوکردنەوەی هزری سۆفیگەری و (خواناسی)دا گێڕاوە، تەنانەت شارو ناوچەی وا هەبوون لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بەزۆری ڕێژەی

---

[٦٩٢] ذبیح الله صفا، تاریخ ادبیات ایران،ج١،ص١٧٧؛مهدی قادر خضر،الحیاة الفکریة والعلمیة فی غربی اقليم الجبال في القرنين (٤-٥هـ/١٠-١١م)، رسالة ماجستير غير المنشورة،مقدمة الى مجلس كلية اداب جامعة الصلاح الدين،(اربيل:١٩٩٤م)،ص١١٧.

[٦٩٣] ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی،ل٥٦.

سۆفیەکانی ناوبانگی دەرکردووە، شاری الدینور نموونەیەکە لەو شارانەو (الثعالبی) لەبەر زۆریان لە شارەکە وەك چۆن دەوترێت (داناکانی یۆنان و زەڕەنگەرەکانی حران و...) ناوی سۆفیەکانی دەینەوەریشی دێنێت[٦٩٤]، کە جگەلەوە بەزۆری وەك ڕێژەزان و فەرمودەناس و زاناش ناوبانگی دەرکردبوو[٦٩٥]، (محمد بن داود الصوفی)یش (م.لە٣٦٠ك/٩٧٠ز) سۆفی و زاهیدێکی گەورەی شارەکە بوو، ماوەیەك لە بەغداو پاشان کۆچی کرد بۆ شام و بە (الدقی) ناسراوە[٦٩٦]، وە (ابونصر احمد بن فرج عمر الدینوری) (م.لە٥٠٦ك/١١١٢ز) سۆفیەکی دی لە خواترس و دنیا نەویست و چاکەکاری تری شارەکەبووە[٦٩٧]، ئەمانەو دەیان سۆفی دی لە ناوچەکانی تری کوردستان هەبوون، کە کۆی ژیانی خۆیان بۆ خواپەرستی تەرخانکردووەو ژیانی هەژاری و دوورەپەرێزییان هەڵبژاردووەو لەگۆشەی تەکیەو خەڵوەتگاکان ژیانیان گوزەراندووە[٦٩٨]، بەڵام لە مێژووی سۆفیزمی کوردییدا کەسایەتی واش بەرچاو دەکەوێت کە ئەگەر هەر بەتەنها بەوەبیربیهێنانەوەی ترسی (خوا)ش بوو بێت لەبەرامبەر سوڵتان و دەسەڵاتداران، وەك چاکەکارێکی کۆمەڵایەتی ڕووبەڕووی نادادگەری و زوڵم بۆتەوە، لەمبارەیەوە ڕەنگە سۆفی گەورەی کورد (باباطاهر

---

[٦٩٤] ثمار القلوب، تحقيق محمد ابوالفضل ابراهيم،دارنهضة،(مصر:١٩٦٥م)،ص،٢٣٨.

[٦٩٥] ياقوت الحموي،معجم البلدان،ج٢،ص٥٤٥.

[٦٩٦] ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٥٦؛ الذهبي،تاريخ الاسلام(حوادث ٣٥١-٣٨٠ه)،ص٢١٧؛ ابن كثير،البداية والنهاية،ج١١،ص٨٦.

[٦٩٧] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٥٩٣.

[٦٩٨] بگەڕێوە:مهدي قادرخضر، الحياة الفكرية والعلمية في الغربي الإقليم الجبال،ص١١٧؛ اكويرهان محمد،الحياة العلمية في دياربكر،ص١٣٦.

همدانی)[699] نموونەیەکی دیاریی، کە (الراوندی) گفتوگۆی نێوانی لەگەڵ سولتان طغرل بگ دەگێڕێتەوە، لەکاتی تێپەڕبوونی بەسوپاکەیەوە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)بە(همدان)دا بەرەو (بەغدا)، (باباطاهر) داوا لە سولتان دەکات کە بەدادگەری و چاکە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوت بکات[700]، وەك فەرمانێکی (خوای گەورە) ئایەتی ((إِنَّ اللَّـهَ يَـأْمُرُ بِالْعَـدْلِ وَالإِحْـسَانِ))[701] بەبیردێنێتەوە، سولتانیش بەڵێنی پێدەدات کە کار بەئامۆژگاریەکانی بکات[702]، لەو گفتوگۆیەدا چەند خاڵێك جێگای سەرنجن:-

(١) پێگەوناوبانگی(باباطاهر) لە ناوچەکەداو پلەوپایەی بەرزی لای سولتان (طغرل بگ) لەکاتێکدا سۆفی تریش لەهەمان کاتدا لە همدان هەبوون[703]. (٢) ڕۆڵ و پێگەی سۆفیگەری دەردەخات لە ڕووبەڕووبوونەوەی نادادگەری کۆمەڵایەتی و زوڵم و زۆری وەك چاکەکاری کۆمەڵایەتی، ئەگەر بە تەنها ئامرازی بەرەنگاریشیان ترساندنی دەسەڵاتداران بووبێت بە هەڕەشەو فەرمانەکانی (خوای گەورە)، نەك بە خۆ دووره پەرێز گرتن، لە واقع ڕابکەن وەك بەشێکی زۆر لە سۆفیەکانی دی ئەو ڕێچکەیان گرتۆتەبەر. (٣) (باباطاهر) سەرکەوتنی سولتانی بەستۆتەوە بە دادگەری

---

[699] هەرچەندە بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ساڵی لەدایکبوون و مردنی، بەڵام توێژەران کۆکن لەسەر ئەوەی کەدوای ساڵی(٤٤٧ك/١٠٥٥ز)مردبێت، بەبەڵگەی ئەوەی لەو ساڵەدا هەروەك (الراوندي) باسیکردووە چاوی بە (طغرل بگ) کەوتووە، بەهەر حاڵ (باباطاهر) کە بە (عوریانی)ش ناسراوە شاعیرو سۆفیەکی ناوداری کوردبووە، یەکەم شاعیری کوردە کە بەشێوەی زاری لوڕی شیعری نووسیوە، وەخۆشی لوڕییەو سەربەهۆزی کەڵهوڕە،دیارە لەشاری همدان مردووەو ئارامگاکەشی هەر لەوشارەیە.مهدی درخشان،بزرگان وسخن سرایان همدان،ج١،ص٦٢؛محمد امين زكي،مشاهير الكرد وكردستان،ص١٣٣.

[700] راحة الصدور، ص ص١٦٠-١٦١.

[701] سورة النحل، آية ٩٠.

[702] الراوندي، راحةالصدور،ص٦١؛ مهدی درخشان، بزرگان وسخن سرایان همدان،ج١,ص ص٦٥-٦٦.

[703] الراوندي، راحة الصدور،ص٦٠.

له نێوان خەڵکدا، وەکودەریش کەوتووە بە بەراورد لەگەڵ سوڵتانەکانی دی سەلجوقیدا (طغرل بگ) نەرم و نیانترو چاکەکارتربووە[٧٠٤]، لە پەیوەندیەکانیشی لەگەڵ کورددا، تارادەیەك باشتر بووە، بەوەندە ڕازی بوو کە میرەکان بەناوی ئەوەوە وتار بخوێننەوە و دیاری و یارمەتی دارایی بۆ بنێرن.

له ئەنجامی گەشەکردنی سۆفیگەریش لە کوردستاندا، دەیان خەڵوەتگە (زاوی[٧٠٥]و خانەق[٧٠٦] ربیات (رباط)[٧٠٧]سەریانهەڵداوە و دامەزراون و زۆر لەسۆفیەکان و پیاوچاکانی کورد خاوەنی خەڵوەتگەی خۆیان بوون چ لەکوردستان یان شام ومصر، هەریەك لەو مەڵبەندانەش لە هاندنی خەڵك بۆ زانست و زانیاری و دوورکەوتنەوە لەژیانی ئارەزووبازی و ڕابواردن و بووژاندنەوەی گیانی جەنگی خۆبەختکاری دژی ناموسڵمانان، بەتایبەت ئەوانەی لە ناوچە کەوشەنەکان هەڵکەوتبوون، ڕۆڵی دیاری هۆشیارکردنەوەیان بینیوە[٧٠٨]، لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە بوونە لانەیەك بۆ هەژارو نەدارو منداڵانی بێباوك، وەك خانەیەکی چاودێری کۆمەڵایەتی ڕۆڵیان گێڕاوە، لە کوردستانیشدا دەیان خەڵوەتگەو خانەی لەو جۆرە

---

[٧٠٤] الصفدی،الوافی بالوفیات،ج٥،ص٧٠؛ابن خلکان،وفیات الأعیان،ج٣،ص٣٤؛القرماني،أخبار الدول والآثار الأول،ص٢٧١.

[٧٠٥] زاویە: واتە دیاریکردنی شوێنێکی مزگەوت بۆئەوەی بکرێتە بازنەی زانست و زیکر و کۆبونەوەی ئاینی، آکو برهان،الحیاة العلمیة،ص١٠١.

[٧٠٦] خانەقا: وشەیەکی فارسیە بەمانای ماڵی سۆفیەکان دێت بۆ خواپەرستی، آکو برهان،الحیاة العلمیة،ص١٠٠.

[٧٠٧] دامەزراوەیەکی ئاینی بووە بۆ خواپەرستی و کۆبوونەوەی سۆفیەکان و ماناکەی لە ئایەتی ((وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ))(سورة الأنفال،الآية،٦٠) داهاتووە کە گرنگییان لەشەڕی بێباوەڕان دەردەخات.

[٧٠٨] اکتمال اسماعیل،الحملات المغولیة وآثارها،ص١٩٦؛توفیق سلطان الیوزبکي،الثغور،ص ص٣٢-٣٣.

دەرکەوتوون، کە ڕۆڵی دیاری خۆیان لە مێژووی سۆفیگەری و زانستی و کۆمەڵایەتیدا گێڕاوە[٧٠٩].

لەئەنجامی هەلومەرجی ڕسکاوی دوای دەرکەوتنی سۆفیگەری و قۆناغە جیاجیاکانی گەشەکردنیدا، ڕێگاو شێوازی سۆفیزم دەرکەوتن کە بە (تەریقەت) ناسراون، کە بریتین لە شێوازێکی ڕێنیشاندانی پراکتیکی بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێبازێك کە بە چەندین پلەو قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕدەبێت، لە ڕێگەی بیرو هەست و کردارەوە بۆ چۆنیەتی دەرککردن و پەیبردن بە ئەزمونی (یەزدان)ی ڕاستەقینە[٧١٠]، لیکۆڵینەوەش لە مێژووی سۆفیزم لە کوردستاندا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە عارفانی کورد لە ڕابەرایەتی کردن و پەرەپێدانی تەریقەتدا لە قۆناغەکانی دیدا جێدەستیان دیارە[٧١١]، هەر تەریقەتێکیش زنجیرەیەکی ڕەچەڵەکی تایبەت بەخۆی هەبووە، کە ئەندامانی بە دامەزرێنەرەکەوە دەبەستەوە، ئەم زنجیرەش شوناس و ناسنامەی پلەوپایەی تەریقەتەکەو دامەزرێنەرانی بوو، بۆیە هەمیشە بەمەبەستی پێدانی هێزێکی گەورەی ڕوحی و مەعنەوی هەوڵدراوە زنجیرەکانی ڕەچەڵەك (نەسەب) بۆ کەسایەتیە ڕوحانیە ناودارو پێشەنگەکانی مێژووی ئیسلامی بگەیەندرێتەوە، بەم جۆرە زۆر زنجیرە ڕەچەڵەکی مێژوویی ڕوحانی نادرووست و وەهمی بۆ تەریقەکانی سۆفیزم درووستکراون تا گەیەنراونەوە سەر کەسایەتی (پێغەمبەر)(د.خ)[٧١٢]، ئەمەش وەك شوێنەوارێکی

---

[٧٠٩] بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بگەڕێوە: سلام حسن خۆشناو،جزیره ابن عمر،ص١٥٢؛زرار صدیق،چەند لێکۆڵینەوەیەك،ل١٧٩؛ آکو برهان، الحیاة العلمیة،ص٩٨.

[٧١٠] جەعفەر عەلی ڕەسول،سۆفیزم وکاریگەری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ،مەڵبەندی کوردۆلۆجی،(سلێمانی:٢٠٠٨)،ل٣٩.

[٧١١] بۆ زانیاری لەسەر تەریقەتەکان بگەڕێوە،محمد رئوف توکلی،تاریخ تصوف در کوردستان،ص٩٥.

[٧١٢] جەعفەر عەلی ڕەسوڵ،سۆفیزم،ل٤٠.

خراپی سۆفیگەری لە کوردستاندا تێبینی دەکرێت، تا ئەمرۆش لەناو زۆرێك لە مورید و بنەماڵەکاندا ئەم جۆرە نەسەبانە هەن کە بە (الشجرە) ناودەبرێن.

بەم شێوەیە سۆفیگەری کوردی سەرەتا جگە لە ئەزمونی عیرفانی و توانەوە لە بیری (خوا)دا یان پەیبردن و گەیشتن بەڕاستی هیچ ئارەزوویەکی تریان نەبووە، داوایان لە خەڵك دەکرد واز لە موڵك ماڵ بێنن و ژیانێکی سادەو هەژارانە بەسەربەرن و خۆ بەدووربگرن لە هەرکارێکی دونیایی[٧١٣]، ئەمەش تایبەتمەندی سۆفیگەرییە لە کوردستاندا، بەجۆرێك توێژەری واهەیە وشکە بیروڕای بەشێك لە کۆمەڵگەی کوردی بۆ ئەو کاریگەری و بایەخەی سۆفیزم گێڕاوەتەوە[٧١٤]، بە تێپەڕبوونی کاتیش بەشێك لە سۆفیەکان لە ڕێبازی ڕاستەقینەی (خواپەرستی) لایانداو بیروبۆچوونەکانیان تێکەڵ بە دونیای خورافیات و وەهم بوون و لەشێوەو ناوی جیاجیادا دەرکەوتن و زیادەڕۆییشیان کرد لە پیرۆزکردن و گەورەکردنی ڕابەرەکانیان، ڕەنگە مورید و شوێن کەوتوانی (شیخ عدی بن مسافر الهکاری)[٧١٥] کە بە (العدویە) ناسراون، نموونەیەکی دیارین لەمبارەیەوە، کە لە ڕێبازە ڕاستەقینەکەی لایاندا و ئارامگەکەشیان کردە شوێنی

---

[٧١٣] الجرجانی،التعریفات،ص٦٢؛ نیکسون،فی التصوف الاسلامی،ص ص٩٨-٩٩؛ محمد رئوف توکلي،تاریخ تصوف،ص٥٦.

[٧١٤] ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی،ل٥٧.

[٧١٥] سۆفیەکی لەخواترسی کوردی ناوچەی هەکاری بوو، خەڵوەتگەیەکی لەم ناوچەیە دروستکردووەو سۆفی و موریدێکی زۆری هەبووە، ساڵی (٥٥٥ك/١١٦٠ز) کۆچیدوای کردووەو هەر لەو خەڵوەتگەیە نێژاوە، ابن خلکان، وفیات الاعیان،ج٢،ص ١٢١.

سـەردان و کۆبونـەوە و لـە خۆشەویـستنیدا زیـادە ڕۆیـان کـرد[٧١٦]، زیـاتر لـەوەش کوردەکانی دەوروبەری موسڵ وەك (پێغەمبەرێك) بۆیان دەڕوانی[٧١٧].

## سێیەم/ بیرۆکەو نەریتی خراپ:

هەرلەژێر کاریگەری ئەو ڕەوشە نالەبارە سیاسی و فیکریەی کە باڵی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا کێشاو سەرقاڵ بوون بە ململانێی مەزهەبی و لاوازبـوونی گیـانی ئـایینی لای بەشـێك لـە خـەڵك، دەرفـەتی بـۆ سـەرهەڵدان و دەرکـەوتنی هەنـدێ نـەریت و بیروبـاوەڕی پڕوپوچـی وەك پڕوپاگەنـدەکردنی هەنـدێ کـەس بـۆ (خوایـەتی و پێغەمبەرایەتی) ڕەخساند، کە شوێنەواری خراپیان لەسەر باری ئایینی و هزری خەڵك بەجێهێشت، بەهۆیەوە پڕوپاگەندەکاران کەوتنە هەڵخەڵەتاندن و کۆکردنەوەی کەسانی سادە لەدەوری خۆیان، بـۆ نمونـە سـاڵی (٣٤٠ك/٩٥١ز) لـەژێر سـایەی دەسـەڵاتی بوەیهیدا لە بەغدا کەسێك دەرکەوت کە پڕوپاگەندەی (خوایـەتی-ربوبیـە)کـرد، کـە گوایە گیانی (پێغەمبەران وپیاوچـاکان) لـەودا بەرجەسـتەبووە، لایـەنگیری زۆریـشی لەناو خەڵکدا بۆخـۆی پەیـداکرد، کـاتێکیش (ابومحمـد المهلبـی)[٧١٨] وەزیـر ویـستی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات و سزای بدات، معزالدولەی بـوەیهی پارێزگـاری لێکـرد، چـونکە دەرکـەوت کـابرا شـیعەیە، هـەر لـەو ماوەیـەدا گـەنجێکی دی دەرکـەوت

---

[٧١٦] ابن المستوفی،تاریخ أربل،ج٢،ص١٧١.

[٧١٧] ابن العبری،تاریخ الزمان،ص٣٣٢، ابن خلکان، وفیات الاعیـان،ج٢،ص١٢١، جعفرحـسین خـصباك، العراق فی عهد المغول الایلخانیین، ص٢٤١.

[٧١٨] محمد کوڕی حسن کوڕی محمدی مهلبـی (٢٩١-٣٥٢ك/٩٠٣-٩٦٣ز) کـە سـێکی شـارەزاو لێهـاتوو بوو، کە وەزیری معزالدلـەی بـوەیهی بـووە، الکتبـی، فویـات الوفیـات،ج١،ص٣٥٣؛ابـن خلکان،وفیـات الاعیان،ج١،ص٢٥٣.

پڕوپاگەندەی ئەوەی کرد کە گوایە ڕوحی (علی) تێدا بەرجەستەبووە، ئافرەتێکیش لاشەی خۆی بەهەڵگری گیانی (فاطمة)ی کچی (پێغەمبەر)(د.خ) دەزانی، پیاوێکی تریش خۆی وانیشاندا، کە ئەو فریشتەی (میکائیلە)[719].

ئەو جۆرە کارانە ئەوە دەردەخەن، کە بەشێکی زۆری ئەو بیروباوەڕە پڕوپوچانە زادەی بیری شیعەگەری بووەیهیەکان بوون، بەهەر ئامرازێك بووبێت ویستوویانە بەجێگیرکردنی بیری گەورەی کەسایەتی (ئیمامی علی) لەزەینی خەڵکدا، کۆمەڵگا بەرەو شیعەگەری بێنن، دەسەڵاتی سیاسیش لەپشت پشتگیریکردنی ئەم جۆرەکەسانەبوو، کە خزمەتی ئەو ڕەوشەیان دەکرد تەوەتا ابومحمد المهلبی لە ترسی لەدەستچوونی پۆستەکەی وازی لە سزادانی ئەو جۆرە کەسانە هێنا[720].

لە ژێرسایەی دەسەڵاتی سەلجوقیشداو لە ساڵی (٤٩٩ك/١١٠٥ز) لەدەوروبەری نهاوند کەسێك دەرکەوت، کە بانگەشەی (پێغەمبەرایەتی) کرد و توانی سەرنجی خەڵکێکی زۆری ناوچەکە بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، بەڵام هەر لەهەمان ساڵدا کوژراو بانگەوازەکەشی کۆتایی پێهات[721]، ئەندامانی خێڵە کوردەکانیش زۆرجار لەوانە بوون کە پشتگیریان لەو جۆرە بزوتنەوانە کردووە[722].

پێدەچێ سەرقاڵی سەلجوقیەکان بەشەڕی ناوخۆیان دەرفەتی بۆ سەرهەڵدانی ئەم جۆرە بۆچوونانە ڕەخساند بێت، چونکە ئەوان لەبەردەمارگیری زۆریان بۆ ئاین و مەزهەبی سونە ڕێگەیان بە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە بۆچوونانە نەدەدا، لەلایەکی تریش زۆربەی کات ئافرەتان و کەسە نەشارەزا و لاوازەکان دەکەوتنە ژێرکاریگەری ئەو جۆرە

---

[719] ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص ١٩٧ ؛ابن كثير،البداية والنهاية،ج١١،ص٤٧.

[720] ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص١٩٧.

[721] ابن الجوزي،المنتظم،ج١٠،ص١٤٥؛ نیشتمان بشیر،الأحوال الإجتماعية،ص٩٤.

[722] موسى محمد خضر، کورد لە مێژوونووسی فارسیدا ،ل٥٤.

بۆچوونانه و شوێنکەوتەی بانگەوازی کارانی[٧٢٣]، هەندێ جاریش کوردستان کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جۆرە بزووتنەوانەی کە لەناوچەکانی دی جیهانی ئیسلامی دەردەکەوتن، بەهۆی نزیکی سنووری جوگرافی و کاریگەری خودی بزووتنەوەکە، وەك بزووتنەوەی (بابا) کە لە ساڵی (٦٣٨ك/١٢٤٠ز) لە ئاسیای بچووك دەرکەوت و بانگەشەی (پێغەمبەرایەتی) کرد، بەبەرزکردنەوەی درووشمی (لااله الاالله بابا رسول الله) مژدەی ژیان و سەردەمێکی نوێی بەدانیشتوان دا، دژی دەسەڵاتی سوڵتان (غیاث الدین کیخسرو) (٦٣٤-٦٤٣ك/١٢٢٦-١٢٤٥ز)ی سەلاجیقەی ڕۆم وەستایەوە، خەڵکێکی زۆر چوونە پاڵ بزووتنەوەکەی[٧٢٤]، بانگەوازەکەی ناوچەکانی (خلاط و سیواس وآماسیا)شی گرتەوە بزووتنەوەکەی دووساڵی خایاندو دوای هەوڵێکی زۆر لەشەڕێکدا کە بەکوژرانی (بابا) کۆتایی هات و بزووتنەوەکەشی لەناوچوو[٧٢٥].

دەشێ خراپی بارودۆخی ئابووری و زۆرداری دەسەڵاتداران هۆکارێکی گرنگی بەرفراوانبوونی ئەو بزووتنەوەیە بووبێ، بەتایبەت کە سەرباری ئەوەی (بابا اسحاق) بانگەوازی یەکسانی و دروشمی دژی دەرەبەگایەتی بەرزکردبۆوە، بەمەش کاریگەری کردبێتە سەر خەڵك بەتایبەتی چینی جوتیار و هەژاران.

بەهۆی شەڕ و لەشکرکێشی بەردەوام دەرفەت بۆ گروپ و سێکتی ئایینی ڕەخسا کە لە کوردستان چالاکی بنوێنن، ڕەنگە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکان و چالاکیەکانی گروپی باتنی لەناوچە کوردنشینەکاندا، وەك مەترسیدارترین چالاکی گروپی ئایینی دەربکەوێت، کە شوێنەواری خراپیان لەسەر هزر و جەستەی کۆمەڵگەی کوردی

---

[٧٢٣] بروانە:ابوالفداء،مختصر فی اخبار البشر،ج١،ص ص٥٤٢-٥٤٣.

[٧٢٤] مؤلف مجهول،اخبار سلاجقة الروم،ص ص٢٧١-٢٧٥؛ زبدة عطاء،الترك في العصور الوسطى،ص١٣١.

[٧٢٥] ابن العبری، تاریخ مختصر الدول،ص٤٣٩؛ المقریزی،السلوك،ج١،ص٤٠٩؛محمد شافي المغربي،آسياالصغرى،ص٢٨٢.

بەجێهێشت، سەرقاڵی سەلجوقیەکان بە شەڕە ناوخۆیەکانیان هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ بەرفراوانبوونی پێگەی جەماوەریان، بەتایبەت لە ناوچەکانی عێراق و هەرێمە چیاکان[٧٢٦]، سەرباری کاریگەری خراپیان لەسەر تێکدانی بیروباوەڕی خەڵك[٧٢٧]، دەستیان بەسەر چەند قەڵایەکی ناوچەی (اصفهان وهمدان)ش داگرت و توانییان ساڵی(٥٠٢ك/١١٠٨ز) (عبدالله بن علي الخطيبي)ی دادگەری (اصفهان) بکوژن[٧٢٨]، چالاکیەکانیان ناوچەکانی دیاریکریشی گرتەوەو ماوەیەك (حسن الصباح) (م.لە٥١٨ك/١١٢٤ز)ی سەرکردەیان لەناوچەکە بانگەوازی بۆ بزووتنەوەکە کردووە، زۆربوونی ژمارەشیان لە ناوچەکەدا بەڵگەیە لەسەر چالاکی ئەو سەرکردەیە[٧٢٩]، بەمەش مەترسییان لەسەر ناوچەکە دروستکرد تا لە هەمان ساڵی مردنی سەرکردەیان خەڵکی شاری ئامەد لێیان ڕاپەڕین و نزیکەی حەوسەد کەسیان لە باتنیەکان کوشت[٧٣٠]، ئەم ڕووداوە کاریگەری کردە سەرکەمبوونەوەی هەژموونیان لە ناوچەکەدا.

مەترسی بڵاوبوونەوەی باتنیەکان لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مەترسی بێباوەڕان زیاتر بوو[٧٣١]، بەتایبەت کە ئەوان بە دەستپێکردنی هەڵمەتی غافلکوژی سەرکردەو کەسایەتیە دیارەکان بەبێ جیاوازی ڕەگەز و مەزهەب، ڕەوشێکی ترسناك و

---

[٧٢٦] اليافعي،مرأة الجنان،ج٣،ص١١٩.

[٧٢٧] البنداري،تاريخ دولة ال سلجوق،ص ص٦٨-٦٩.

[٧٢٨] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٥٧٤؛ الذهبي،العبر،ج٤،ص٤.

[٧٢٩] الذهبي،دول الإسلام،ج٢،ص٢٣؛عمادالدين خليل،الإمارات الأرتقية،ص ص٤٩٤-٤٩٥.

[٧٣٠] ابن الجوزي،المنتظم،ج٩،ص٢٤٩؛الذهبي،دول الاسلام،ج٢،ص٢٣؛ عمادالدين خليل،الإمارات الأرتقية،ص٤٩٥.

[٧٣١] البغدادي،الفرق بين الفرق،ص٢١١.

ناثارامیان درووستکردبوو[٧٣٢]، تا وای لێهات گومان دەکرا لە هەر بارودۆخ و شوێنێکدا هەر میرو سولتان و دادگەرو سەرکردەیەکی سەربازی مەبەستیان با غافڵکوژ بکرێ، ئەو جۆرە شێوازەی ئەوان گرتیانەبەر بەجۆرێك بوو خۆپارێزی لێ نەدەکراو هیچ شوێنێکیش دڵنیایی بەخش نەبوو، بەسەرنجدان لە شوێنی ئەنجامدانی بەشێکی زۆر لە چالاکیەکانیشیان ئەو ڕاستیە بەرجەستە دەبێت، بۆ نموونە وەك ڕووداوی کوشتنی میر ئەحمدیلی کوردی[٧٣٣]، وەك یەکەم قوربانی میری کورد بەدەستی باتنیەکان ساڵی (٥١٠ك/١١١٦ز) لە ماڵی سوڵتان محمد (٤٩٨-٥١١ك/١١٠٤-١١١٧ز)ی سەلجوقی لە بەغدا[٧٣٤]، ڕادەی بەهێزی و سەرکەوتوویی ئەوان نیشان دەدات کە لە ماڵی سوڵتاندا کاری وا ئەنجام بدرێت!، هەرچەندە ئەمە جێگای گومان و قسە لەسەرکردنە، چونکە میر ئەحمدیل خاوەن هەژموونێکی فراوان و سوپایەکی گەورەی پێنج هەزار سوارەیی و ناوچەیەکی زۆری لە مراغەو ئازربیجان لەبەردەستدابوو[٧٣٥]، کوژرانی ئاقسنقر ئەحمدیلی[٧٣٦] جێگرەوەشی بەدەستی هەمان گروپ لەشاری

---

[٧٣٢] باتنیەکان لەپێناو گەیشتن بەمەبەست گیانی خۆیان دەبەخشی، چونکە کوشتنی موسڵمانانیان زۆر لا پیرۆز کرابوو بەجۆرێك واتێگەیەنرابوون کە کوشتنی کەسێك پاداشتی گەورەترە لە کوشتنی (حەفتا) بێباوەڕی ڕۆم بۆ ئەم مەبەستەش گروپی خۆبەختکاری تایبەتیان ڕادەهێنا!، بۆیە نزیکەی تەنها لەماوەی ساڵی (٤٨٥-٥١٨ك) زیاتر لە پەنجا کەسایەتی ناوداریان کوشت،خەنجەرو چەقۆو حەرپەش باشترین چەکی غافڵکوژکردنیان بوو، برنارد لویس، الحشاشون،ص٨٠،ص٨٥؛ سعید عبدالفتاح عاشور،تاریخ العلاقات بین الشرق والغرب،ص٣٤٠.

[٧٣٣] احمدیل: کوڕی ابراهیمی کوڕی و هسوزانی کوردیە، سەرداری مراغەو چەند ناوچەیەکی دی بوو لە ئازربیجان، ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص٦١٢؛مینورسکی،دائرة المعارف ،مادة(احمدیل)،ج٢،ص ص٣٩٩-٤٠٢.

[٧٣٤] ابن القلانسي، ذیل تاریخ دمشق،ص١٩٨؛ابن الأثیر،الکامل،ج٨،ص٦١٢ ؛ امین زکی,مشاهي زکي،مشاهیرالکرد،ص١٠٩.

[٧٣٥] ابن الجوزي،المنتظم،ج٩،ص١٨٥؛الذهبي،العبر،ج٤،ص١٥؛محمد امین زکی،مشاهر الکرد،ص١٠٩.

همدان ساڵی (٥٢٧ك/١١٣٢ز) کە بۆچوونی واش لەئارادایە بەدەسیسەی سوڵتان مسعود (م.لە٥٤٧ك/١١٥٢ز)ی سەلجوقی کوژرابێت[٧٣٧]، کوشتنی میر ئەحمەدیلیش بەفێڵێکی لەم جۆرە بەدوور نازانرێت، چونکە دەکرێت سەلجوقیەکان هەرکەسێك نەیاریان بوایە یان مەترسییان لە پەرەسەندنی دەسەڵاتی بکردبایە بڕیاری کوشتنیان دابێت و تۆمەتەکەشیان دابێتە پاڵ باتنیەکان بۆ لابردنی گومان لەسەر خۆیان.

هەندێ جاریش خۆبەختکارانی باتنی لە شوێنە گشتیەکاندا چالاکیەکانیان ئەنجامدەدا، وەك کوشتنی سوڵتان (داود)ی سەلجوقی لەناو بازاڕی شاری تبریز ساڵی (٥٣٩ك/١١٤٤ز)[٧٣٨]، وەیان کوشتنی زانای پایەداری عەلەوی (نورالهدی سلیمان بن عمر العلوی) لە ڕۆژی هەینیداو لەناو مزگەوتی شاری (اسعرد)[٧٣٩] ساڵی (٥٤٦ك/١١٥١ز)[٧٤٠]، ئەمانەو دەیان چالاکی دی جۆربەجۆر کە شوێنەواری خراپیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت، لە نموونەی چالاکی گروپە ئاژاوەچی و تاڵانچیەکانی وەك تاڵانکاریەکانی گروپی (عیاریەکان) کە لە بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەدا باسیانکراوە.

---

[٧٣٦] اقسنقر: یەکێك بووە لە بەردەستە نزیکەکانی میر احمدیل کە دوای کوژرانی ئەو میرە کوردە بوو بەجێنشینی،احمد کسروی،شهریاران،ج٢،ص٢٣٢.

[٧٣٧] ابن الجوزي،المنتظم،ج١٠،ص٢٩؛الحسینی،زبدة التواریخ،ص٢٠٣؛النویری،نهایة الارب،ج٢٧،ص٢٥.

[٧٣٨] الفارقي،تاریخ آمد ومیافارقین،الموسوعة الشامیة،ج١١،ص٢١٨.

[٧٣٩] اسعرد: شارۆچکەیەکی هەرێمی جزیرەیە کەوتۆتە نزیك میافارقین، ابوالفداء،تقویم البلدان،ص٢٨٩.

[٧٤٠] الفارقی،تاریخ آمد و میارفارقین، الموسوعة الشامیة،ج١١،ص٢٤٠.

## چوارەم/ زیادبوونی دەمارگیری ئایینی:

هەر لە ئەنجامی بەشێك لە لەشكركێشیەكان و ئەو بارودۆخەی لەژێر سایەی هێـزە داگیركەرەكاندا هاتە ئاراوە، زیادبوونی هەژموونی ئایینی هەندێ گروپـی لێكەوتـەوە، بۆ نموونە وەك زیابوونی چالاكی (مەسـیحیەكان) كـە بـەردەوام لـە هـەوڵی گـۆڕینی بیروباوەڕی خەڵك و بڵاوكردنـەوەی ئایینەكـەیان دابـوون، بـە تایبـەتی لەشكركێـشی مەغۆل لەم بارەیەوە كاریگـەری كـردە سـەر زیـادبوونی چـالاكیان لـە كوردسـتاندا، بەمەسیحی بوونی (توقوزخاتون)ی هاوسەری (هۆلاكۆ) رۆڵی هەبوو لەسەر بوژانەوەی مەسـیحیەكان و باڵادەسـتبوونی ئـەو ئایینـە بەسـەر ئایینـەكانی دیـدا[741]، تـەنها ڕەگەزێكیش بوون كە لە زۆربەی شارەكاندا لە كوشتاری مەغۆل پـارێزراو بـوون[742]، وەبوونە چاوساغ و هاوپەیمانی مەغۆل دژی موسڵمانان لەپێناو گێڕانـەوەی هـەژموونی سیاسی و ئایینیان لە ناوچەكەدا[743]، دواتریش سوودیان لەو ڕەوشە وەرگـرت كـە لـە سەردەمی دوای لەشكركێشیەكە هاتـە ئـاراوە و تیایـدا دەرفـەت بـۆ ئـازادی بـیروڕاو مەزهەبی ئایینیی لای خەڵك ڕەخسا، چونكە مەغۆلەكان جیاواز لە هێزەكـانی پێـشتر دەمارگیرنەبوون بۆ بیروباوەڕی خۆیان و بایەخیان بـە گـۆڕینی بـاوەڕی خـەڵك نـەداوە، كەشێكیان بۆ گفتوگۆ و مشتومڕی ئایینەكان دروستكرد و پانتاییەكیان پێكهێنا كە ئاین و مەزهەبە جیاوازەكان دەیانتوانی ڕووبەڕووی یەكتربن و گفتوگۆ لەگـەڵ یـەكتری

---

[741] ابن كثیر،البدایـة والنهایـة،ج١٣،ص٣١١؛بدرالـدین العینی،عقـد الجمـان،ج١،ص٤١٤؛آربری،تـاریخ الاسلام،ص٢٢٨.

[742] بڕوانە: ابن العبري،تاریخ الزمان،ص٣٠٨؛ابن الفوطی،الحوادث الجامعة،ص٢٣٦؛بدرالدین العینی،عقد الجمان،ج١،ص١٧٤.

[743] موسى مصطفى الهسنیانی،السنوات الأخیرة من حیاة الدولة الكوردیة،ص ص٤٦٢-٤٦٣.

بکەن،[٧٤٤] بێگومان لەوەها بارودۆخێکیشدا کار لە یەکترکردن و بەریەککەوتنی کەلتووری و ئایینی زیاتر دەبێ، بۆیە دەشێ هەر ئەو ڕەوشە وایکردبێ کە بەشێکی زۆر لە مەغۆلەکانیش بەرەو ئیسلام بێن و بکەونە ژێر کاریگەری شارستانی ئیسلامی و موسڵمانبوونی خۆیان ڕابگەیەنن.

ئەو بارودۆخە کاریگەری کردە زیادبوونی چالاکی مەسیحیەکان و لەڕێگەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیشیان لەگەڵ سوڵتانەکانی ئیلخانی وەك شوێنەوارێکی ئایینی-سیاسی، توانییان متمانەی بەرپرسیاریەتی چەند شارێکیان پێ بسپێردرێ، لەوانە سپاردنی والیەتی سەر هەردوو شاری موسڵ و هەولێر لەلایەن سوڵتان آباقاخان(٦٦٣-٦٨٠ك/١٢٦٤-١٢٨١ز) بەمسعود برقوتی مەسیحی[٧٤٥]، وە بەرپرسیاریەتی شاری جزیرەی ئیبن عومەر بە (مرحسیا) ساڵی (٦٦٠ك/١٢٦١ز)[٧٤٦]، لە سەردەمی سوڵتان أرغون کوری آباقانیش بۆ جاری دووەم ساڵی (٦٨٣ك/١٢٨٤ز) سپاردنەوەی بەرپرسیارێتی موسڵ و دەوروبەری بە مسعود برقوتی[٧٤٧].

ئەو سیاسەت و پەیوەندیەی نێوان مەغۆل و مەسیحیەکان کاریگەری پێچەوانەی لای کورد لێکەوتەوە، ئەوەبوو لە یەکەم کاردانەوەدا ژمارەیەك لە جەنگاوەرانی کورد ساڵی (٦٦٠ك/١٢٦١ز) پەلاماری مەسیحیەکانی دەوروبەری موسڵیانداو کوشتارو

---

[٧٤٤] الجويني،جهانطشاى،ج١،ص٦٣؛ناديا إيبوجمال،الناجون من الغزوالمغولي،ص ص١٣٧-١٣٨؛يارۆسلاڤ کراچی،شارستانیەتی ئاسیا،ل٤٣٢.

[٧٤٥] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص ص٣٢٤-٣٣٥؛بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: علی عادل حسین، أربل،ص ص١٠٤-١١١.

[٧٤٦] ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص٢٥٠.

[٧٤٧] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٣٤٨.

تالانکــاری زۆریــان لێکــردن[748]، ئەمـــەش دەشـــێ وەك رقێکـــی کـــۆن بەرامبـــەر هاوکاریکردنی مەغۆلەکان لێکبدرێتەوە، وە بەپێچەوانەوە مەسـیحیەکان بـەم کارانـە خۆشحاڵ سوود مەندەبوون، لە کاردانەوەیەکی لەم جۆرەشـدا، جـارێکی دی لـە سـاڵی (٦٧٢ك/١٢٧٣ز)دا دانیشتوانی قەڵای هەولێر رێگەیان لە مەسیحیەکان و ژمارەیەك لە مەغۆلە هاوکارەکانیان گرت لـە چـونە نـاو قـەڵاو بەشـداربوون لـە ئاهـەنگێکی تایبەت بەخۆیان و لە قەڵاوە بەرد بـاران کـران[749]، وە لـە سـاڵی (٦٨٥ك/١٢٨٥ز) ژمارەیەك جەنگاوەری کوردو عەرەب و تورکمان پەلاماری دێری (مارقی) لە موسـڵ و مەسیحیەکانی هەولێریانداو و ژمارەیەکیان لێکوشتن و پاشـان جـەنگاوەرەکان بـەرەو بەغدا رایانکرد[750].

شایەنی باسە مێژوونووسی مەسیحی (ابن العـبری) لـەو نێوەنـدەدا سیاسـەتی سـوڵتان (أحمـدتکودار)(٦٨٠-٦٨٣ك/١٢٨١-١٢٨٤ز) وەك سـوڵتانێکی ئیلخـانی موسڵمان باش نرخاندووە، بە پیـادەکردنی سیاسـەتی لێبـوردنی ئـایینی و رێزگرتنـی مەسیحیەکان، زیاتر لەوەش بە فەرمانێکی فەرمی بڕیاری بەخشینی کەنیسـەو دێـرو پیاوانی ئایینی مەسیحی دا لەباج و خەراج[751]، ئەمەش هەڵقوڵاوی ناوەڕۆکی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کە مـافی هـەموو کەمایـەتی و ئـایینێکی پاراسـتووە، بـەڵام ئـەوە دەسەڵاتدارەکانن کە مومارەسەی هەڵەی ئاین دەکەن زۆرجـار بەرامبـەر کەمینـەکان، نەك خودی ئیسلام خۆی، دەشێت ئەو بۆ هێورکردنـەوەی بارودۆخەکـەش سیاسـەتێکی لەم جۆرەی پەیرەو کردبێت.

---

[748] ابن العبري،تاريخ الزمان،ص٣٢٠؛تاريخ مختصر الدول،ص٤٩٥.

[749] ابن العبرى،تاريخ الزمان،ص٣٣٠.

[750] ابن الفوطى،الحوادث الجامعة،ص٣٠٧؛ عباس العزاوى،اربل فى مختلف العصور،ص٨٥.

[751] بڕوانە: تاريخ الزمان،ص٣٤٤.

ئالۆزی پەیوەندی نێوان کورد و مەسیحیەکان درێژەی کێشاو ناوچەکانی تریشی گرتەوە، لەوانە شاری مراغە، ئەوەبوو لە ساڵی (٦٩٤ك/١٢٩٤ز) دانیشتوان پەلاماری کەنیسەی شارەکەیاندا و تالآنیانکرد، دووساڵ دواتریش بەهەمان شێوە شەڕوئاژاوی لە نێوانیاندا ڕوویداو کەنیسەی شارەکەیان وێرانکرد، ئەمجارەیان بطریق (مارجیلاهای دووەم) سکالأی گەیاندە سوڵتان غازان (٦٩٥-٧٠٣ك/١٢٩٥-١٣٠٣ز) ئەویش بڕیاری بەگێڕانەوەی کەلوپەلەبراوەکانی و چاککردنەوەی کەنیسەکەدا[752]، دوای ئەم ڕووداوانەش جارێکی دی ساڵی (٦٩٦ك/١٢٩٦ز) نائارامی لە هەولێر سەریهەڵدایەوە، بەتایبەت دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی (نوروز)[753]، کە یەکێك بوو لە سەرکردە سەربازیە دیارەکانی سوڵتان غازان، و بەدوژمنێکی سەرسەختی مەسیحیەکانیش ناسرابوو[754]، لایەنگرانی لە هەولێر پەلاماری هەردوو کەنیسەی یعقوبیەکان و نستوریەکانیاندا و تالآنکران و تێکدران، ئەم ئاژاوەیە چەند ساڵێکی خایاندو دواتر مەسیحیەکان لە قەڵای هەولێر کرانە دەرەوە[755].

---

(752) حمداللە مستوفی،تاریخ گزیدە،ص٦٠٢؛ مصطفی طە بدر،المغول ایران،ص٥٤.

(753) ئەم ڕووداوەی هەولێر ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە، کە دوورنییە نوروز کورد بووبێت، هەرچەندە دەقێکمان دەستنەکەوت ئەمە بسەلمێنێ، بەڵام بەناوەکەی و کاردانەوەی خەڵکیش دژی کوژرانی دەکرێت وەك سۆزێکی نەتەوەیی پێی هەڵسابن دژی مەسیحیەکان و پارێزەری مەغۆل لەشارەکە، بەتایبەت کە پەیوەندی نێوان غازان و نوروز لەسەر هەڵوێستی بەرامبەر بەمەسیحیەکانی مراغە تێکچوو، هەرچەندە هۆکاری تریش باسیان لێوەکراوە کە لەپێشت کوشتنیەوە بوون، دەشکرێت ڕاپەڕینەکە لەژێر کاریگەری سۆزێکی ئایینی بووبێت. حمداللە مستوفی ،تاریخ گزیدە،ص٦٠٤، ابن خلدون،العبر،ج٥،ص ٦٤٧، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مصطفی طە بدر،مغول ایران،ص ص٥٨-٦١؛علی عادل،أربل،ص ص٢٠٢-٢٠٦.

(754) جعفر حسین خصباك،العراق في عهد المغول،ص١٩٥.

(755) محمد امین زکي،خلاصە،ج١،ص١٥٣؛مصطفی طە بدر،مغول ایران،ص٥٣.

## بەشی سێیەم:

## شوێنەوارە ئابوورییەکان

### باسی یەکەم/

### شوێنەوارەکان لەسەر کشتوکاڵ

### باسی دووەم/

### شوێنەوارەکان لەسەر بازرگانی

### باسی سێیەم/

### لەسەر پیشەگەری و هەندێ شوێنەواری دی

## بەشی سێیەم/ شوێنەوارە ئابوورییەکان

لەراستیدا بەرەنجامی لەشکرکێشی هێزە داگیرکەرەکان جۆراوجۆر بوون، ژیانی ئابووریش کە لەکایە گرنگەکانی کۆمەڵگابووە، بە پرۆسەی لەشکرکێشیەکان و ئەو پێشهاتانەی لە ئەنجامی گۆڕانکاریەکانی دوای شەڕەکان هاتنە ئاراوە کاری تێکرا، بەتایبەت کە زانیمان زۆری ژمارەی دانیشتوان و خراپی باری ئابووری و نزمی ئاستی گوزەرانی هەندێ لە نەتەوە داگیرکەرەکان، هۆکاری گرنگی لەشکرکێشی کردنە سەر کوردستان و وڵاتانی دەوروبەر بوون، گوێ نەدانی هێزە داگیرکەرەکانیش بەباری گوزەرانی خەڵك و تێکدانی پڕۆژەو کاولکاریەکانیان و زیادکردنی باج و سەرانەو چەندین دەرئەنجامی دی تێکرا شوێنەواریان لەسەر ژێرخانی ئابووری و سەرچاوەکانی داهات بە هەرسێ کەرتەکەیەوە بەجێهێشتووە، کە لەم بەشەداو لەسێ تەوەرەی جیادا باسیان دەکەین.

### باسی یەکەم/ شوێنەوارەکان لەسەر کشتوکاڵ:

کشتوکاڵ بەهەردوو لایەنەکەیەوە (بەروبوومی ڕووەکی و ئاژەڵداری) سەرچاوەی بنەڕەتی ژیانی ئابووری میللەتی کورد بووە، بەجۆرێك کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە شادەماری ئابووری کوردستان دانراوە و هیچ گوندێك نەبووە دانیشتوانی بە کشتوکاڵەوە خەریك نەبووبن، لە پابەندبوونی کوردیش لەسەر ئەم پیشەیە دووبنەمای سەرەکی ڕۆڵیانگێڕاوە، یەکەم: هەمەجۆری و بەبرشتی کشتوکاڵ لە کوردستان، بێجگە لە بەرهەمی ڕوەکی سرووشتی، دووەم: لەباری ژینگەی سرووشتی و باری ئاووهەوا کە

پیشەی کشتوکاڵی پێوەبەندە[٧٥٦] ، ئەمەش وایکردووە لەلایەك ژێرخانی ئابووری و ئاستی گوزەرانی دانیشتوان باش بێت، لەلایەکی تریشەوە هەرئەمە وایکردووە کە کورد نەتوانێت بەئازادی و بەبێ کێشەو گرفت درێژە بە ژیانی ئابووری خۆی بدات، بەڵکو بۆتە مایەی چاوتێبڕینی هێزە داگیرکەرەکان و بەدرێژایی مێژوو بەرستەمی ئەو هێزانە کەوتووەو شوێنەوارو کاریگەری خراپیشیان لەسەر ئەم لایەنە جێهێشتووە، کەلەم تەوەرودا بەشێکی ئەو نەهامەتیانە دەخەینە ڕوو.

پەلاماری بەنۆرەی هێزە داگیرکەرەکان و ململانێی نێوانیان کاریگەری کردۆتە سەر تێکچوونی باری ئاودێری و لەناوچوونی بەروبوومی کشتوکاڵ و هاتنە ئارای کەشێکی نائارام، کە جوتیاران نەتوانن کێڵگەکانیان بەرهەم بێنن، وەك ئەو بارودۆخە نائارام و پڕ لەشەڕەی کە هەر لە سەرەتاکانی سەدەی (چوارەمی کۆچی/دەیەمی زاینی) زەیاریەکان لە هەرێمی چیاکان دروستیانکرد، بەتایبەت مرداویج، کە هیچ بایەخ و گرنگی بە بەرژەوەندی خەڵك نەدەداو بەردەوامیش هێرشی سەربازی دەکردە سەر شارەکان، بۆیە دەکرێت کشتوکاڵ وەك لایەنێکی ژیانی ئابووری لە چالاکی کەوتبێت، چونکە لە شاڵاوەکانی بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان پیاوەکانی کوشت و ژن و منداڵی بەتاڵان بردو دەستی بەسەر ماڵ و موڵکی خەڵکداگرت و ئەوەی تریشی ئاگر

---

[٧٥٦] شارناس و گەڕیدە موسڵمانەکان زۆرباسی ئەم دوو بنەما سەرەکیەی کشتوکاڵیان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا کردووە، بۆ نموونە (مسعر بن مهلهل) لەباری شارەزووردا نووسیویەتی ((کێڵگەی بەپیتی زۆرەو شەست هەزار ماڵ لەسەری دەژی))، (ابن حوقل) لە باسی جزیرەدا دەڵێ: ((بەرهەمی جۆراوجۆرەو سەرچاوەکانی ئاوو زەوی بە پیتی زۆرە...)) ئەمانەو دەیان وەسفی تری لەم جۆرە، الرسالة الثانیة،ص١٨؛صورة الأرض،ص١٩١؛ بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: حکیم أحمد خوشناو، الکرد وبلادهم،ص٢٢١ ومابعدها.

تێیەردا(٧٥٧)، ئەو نەك هەر كشتوكاڵ بەڵكو سەرجەم كایەكانی دیكەی ژیانی پەكخست، هەر بۆیە (ابن الأثیر) كوژرانی مرداویجی بە ئاسودەبوونی خەڵك داناوە(٧٥٨).

لەشكركێشی بوەیهیەكان بەجۆرێكی دی كاریگەری كردە سەر كشتوكاڵ، كە خۆی لە كاولبوون و تێكدانی بواری ئاودێری بینیوەتەوە، چونكە بەهۆی شەڕو ململانێی نێوانیان و كەمی هۆشیاری ئابووری هەوڵێك بۆ بایەخدان بە بوژانەوەی پرۆژەكان و پەیڕەوكردنی سیاسەتێكی گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندی جوتیاراندا، كەئامانج لێی ئاوەدانكردنەوەی زەویەكانیان و ڕاكێشانی جۆگەو پرۆژەی ئاودێری بێت، جگە لە عضد الدولە لە لای هیچ میرێكی تریاندا، لەگۆڕێدا نەبوو(٧٥٩)، پرۆژەكانی ئەویش كوردستانیان نەگرتۆتەوە و كورد لێیان سودمەند نەبووە، ئەوەی زیاتریش كشتوكاڵی دواخست و كاری كردە سەر كەمبوونەوەی بەرهەم، زیادەڕۆییكردنی بوەیهیەكان بوو لە بەخشینی زەوی بەهێزی سەربازی و نیشتەجێكردنیان لەسەر ماڵ و موڵكی خەڵك و دەستگرتنیان بوو بەسەر زەوی جوتیاران لە لادێیەكاندا(٧٦٠).

كاریگەریە نەرێنیەكانی لەشكركێشیە بیانیەكان لەسەر كوردستان دوای بویهیەكانیش بەردەوامبوو، غوزەكانیش لە هێرشەكانیاندا سەرباری تێكدانی پرۆژەكانی ئاودێری و وێرانكردنی زەوی و كێڵگەی جوتیاران دەستیان لە سامانی ئاژەڵیش نەپاراست و وەك تالآنی جەنگ هەژماریان كرد، بەم هۆیەشەوە زیانی زۆریان بەم كەرتە گەیاندووە(٧٦١)، سەلجوقیەكانیش نەك هەر كاروبار و پرۆژەكانیان

---

(٧٥٧) بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ص٣٤٠؛ابن الأثیر، الكامل، ج٦، ص٧٥٨.

(٧٥٨) الكامل، ج٧، ص٣٦.

(٧٥٩) بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: عبدالعزیز الدوري، تاریخ العراق الإقتصادي، ص٤١ومابعدها؛ محمد حسین الزبیدي، العراق في العصر البویهي، ص١١٣.

(٧٦٠) ابن الأثیر، الكامل، ج٧، ص٥٧.

(٧٦١) بۆنموونە بڕوانە: ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص١٣٠؛ابن الأثیر، الكامل، ج٨، ص٥٧.

فەرامۆشکرد ، بەڵکو سوپاکەشیان بوو بە مایەی مەترسی و هەڕەشە لەسەر جوتیاران، لەبری هۆکارێك بن بۆ پاراستنی ژیان و سامانیان، بەپێچەوانەوە لە هەر بارودۆخێکدا پەلاماری گوندەکانیان دەداو بەروبووم و سامانی ئاژەڵی جوتیارانیان بەتالانبردووە[٧٦٢]، (ابن الجوزي) لەوەسفی ئەو ڕۆژگارەدا نووسیویەتی: کاروبارەکانیان فەرامۆشکرد و خەڵك زیانی زۆریان پێگەیشت[٧٦٣]، بەهۆی بوونی کوردستان بەمەیدانی شەرە ناوخۆیەکانیشیان زیانی زۆریان بەم کەرتە گەیاند[٧٦٤]، زیانەکانی لەشکرکێشی خوارزمیەکان لەم بارەیەوە زۆر زیاتر بوو، ئەوان هاوکات لەگەڵ بردنی سەروەت و سامانی خەڵك ئاژەڵەکانیشیان بە بەرچاوی خاوەنەکانیانەوە سەر دەبڕی[٧٦٥]، بواری کشتوکاڵ لە ئەنجامی لەشکرکێشی مەغۆل و بەسوتاندن و لەناوبردنی کێڵگەکان و وێرانکردنی شارو لادێکان و کوشتنی بە کۆمەڵی خەڵك گەورەترین زیانی بەرکەوت[٧٦٦]، بەم شێوەیەکۆی ئەو ڕووداوانەی کە بەگشتی بەسەر ناوچەکەدا هاتوون، شوێنەواری نەرێنیان لەسەر کشتوکاڵ لێکەوتۆتەوە[٧٦٧]، بە جۆرێك کە تەنها هەڵمەتە سەربازیەکان کاریگەری خراپیان نەکردە سەر ئەم لایەنە، بەڵکو ئەو سیاسەتە ئابووریەش کە هەندێ لە هێزە داگیرکەرەکان دوای جێگیرکردنی دەسەڵاتیان پەیڕەویانکرد شوێنەواری جیاوازی لە مێژووی نزیك و دوری کورددا بەجێهێشتووە، کە لێرەدا باسیان دەکەین.

---

[٧٦٢] بدري محمد فهد، العامة ببغداد، ص٩٠.

[٧٦٣] المنتظم، ج١٠، ص١٤٥.

[٧٦٤] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الاثير،الكامل،ج٨،ص٣٦٩؛عبدالله رشيد الجميلي،امارة الموصل،ص٢٩٣.

[٧٦٥] الراوندي،راحة الصدور،ص٥٢٢.

[٧٦٦] بڕوانە: ابن الأثير، الكامل، ج١٠، ص ص٤٤٨-٤٥٣.

[٧٦٧] احمد علي الصوفي،ارض السواد،مطبعة الاتحاد،(الموصل:١٩٥٥م)،ص ص٧٣-٧٤.

## یەکەم/ باج وسەرانە:

ڕەوشی نائارامی دوای لەشکرکێشییەکان و ئەو سیاسەتە ئابوورییەش کە هێزەکان پەیڕەویانکرد، هێندەی دی ئەرکی سەرشانی جوتیارانی قورس کرد و کاریگەری و شوێنەواری خراپیشی لەسەر بواری کشتوکاڵ بەجێهێشت، چونکە هێزەکان ئەوەندەی بایەخیان بە کۆکردنەوەی سامان دەدا، کە لە ڕێگەی (باج وخەراج)[٧٦٨]ەوە دەستیان دەکەوت، ئەوەندە بەخەم چاکسازی و دروستکردنی ئامرازەکانی ئاودێری زەویەکانەوە نەبوون، لەکاتی تووشبوون بە کێشەی کەمی داهات و نابوتبوونی خەزێنەی دەوڵەتیش، پەنایان دەبردەبەر بەخشینی زەوی دەرەبەگی یان ناوچەیەکیان بەزامنکردن (الضمان) دەدا بە کەسێك (میرێك یان سەرکردەیەکی سەربازی) بۆ کۆکردنەوەی باجی ساڵانەو ناردنی بڕێکی بۆ خەزێنەی دەوڵەت[٧٦٩]، ئەمە سیاسەتێکی دیاری بوەیهەکان بوو، چونکە ئەوان هەر لە سەرەتای دەستگرتنیان بەسەر عێراقدا ڕووبەڕووی کێشەی دارایی بوونەوە و نەیانتوانی موچەی هێزی سەربازی دابین بکەن و لەم ڕێگایەوە ویستیان بەشێك لە کێشە ئابوورییەکان لەسەر حسابی بەرژەوەندی دانیشتوان چارەسەربکەن و دەنگی ناڕەزایی هێزی سەربازیش دامرکێننەوە[٧٧٠]، لە پرۆسەی وەرگرتنی باجیشدا ڕێگاو ئامرازی جیاجیا لە توندوتیژی و چەوسانەوە دەگرایەبەر، بێ ئەوەی دەوڵەت لە زامنکەر (ئەوکەسە) بپرسێتەوە، ستەمی کۆمەڵایەتی و دادۆشینی

---

[٧٦٨] خەراج: بەبری ئەودراوە یان بەرهەمە دەوترێت کە لە جوتیاران وەردەگیرێت، بەپێی جۆری موڵکایەتی و بەروبومەکە دەگۆڕێت، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: الماوردي،الأحكام السلطانية،ص٣٨٨؛القلقشندي،صبح الاعشى،ج١٣،ص١٢٣.

[٧٦٩] سوادي عبد محمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية، ص٢٦٤.

[٧٧٠] بۆ نموونە بڕوانە: مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٢٨٢؛ عبدالجبار ناجي، الدولة العربية في العصر العباسي، ص٣٣٧.

جوتیاران له دیارترین بەرئەنجام و سیما ئابووریەکانی ئەو جۆرە بارودۆخەبوون[771]، بەم شێوەیە میەکانی بوەیهی باج و خەراجیان وەك ئامرازێك بەکاردەهێنا بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن و کەڵەکەکردنی سەروەت و سامان، کە هەمیشە بوونەتە ئامرازێك بۆ چەوساندنەوەی خەڵك، بەم هۆیەشەوە میەکانیان سامانێکی زۆریان کۆکردۆتەوە[772]، سەرچاوەیەك وەك ڕۆژگارێکی پڕ لە گەندەڵی و زوڵم و زۆری و نەهامەتی وەسفی ئەو بارودۆخەی کردووە[773]، دەشێ هەمان بارودۆخ ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتبێتەوە، بۆنموونە معزالدولەی بوەیهی لەبەرامبەر دەست هەڵگرتنی لە هێرشەکەی بۆسەر موسڵ و شارەکانی دی هەرێمی جزیرە، داوای باجێکی ساڵانەی بەبڕی (یەك ملیۆن) درهەم ساڵی (٣٥٥ك/٩٦٥ز) لە سیف الدولەی حمدانی کرد، ئەویش بەوە قایل بوو[774]، بڕێکی زۆری ئەو باجەی لە شارە کوردنشینەکان کۆکردەوە، بەبەڵگەی ئەوەی بەشێك بوون لە قەڵەمڕەوی ئەو، ئەمەش وایکردوە کەبەر لەوادەی خۆی باج وەربگرن، بەوەش ناسراون کە توندوتیژ و بێبەزەیین لەوەرگرتنیدا[775]، سەرباری دەستگرتن بەسەر زەوی جوتیاراندا[776].

سیاسەتی سەلجوقیەکانیش لەم بارەیەوە لە سیاسەتی هێزەکانی دی باشتر نەبوو، ئەوان سەرباری شەڕە کاولکاریە ناوخۆییەکانیان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئابووری جوتیاران و ڕەوشی ژیانیان، ڕێژەی باجەکانیان زیادکردو بەزۆریش بڕیارەکانیان

---

(771) مسکویە، تجارب الأمم، ج٥، ص٢٨٣؛نزار محمد قادر النعیمي، الجیش وتأثیراته، ص٢٨٩.

(772) آدم متز،الحضارة الاسلامیة،مج١،ص ص٥٤-٥٥؛شوقي ضیف،عصر الدول والامارات،ص٤٤٩.

(773) المقدسي، أحسن التقاسیم، ص١١١.

(774) ایلیا برشینایا،تاریخ ایلیا برشینایا،ص١٩٦؛ابن الاثیر،الکامل،ج٧،ص ص٢٤٨-٢٤٩؛درویش هروری،بلاد هکاري،ص٨٢.

(775) عبدالعزیز الدوري،تاریخ العراق الاقتصادي،ص١٩٠.

(776) هاله عبدالحمید ابراهیم الوریکات،الحیاة الاجتماعیة والاقتصادیة،ص١٢٨.

بەسەرخەڵکدا سەپاندووە[777]، باجی سەر کشتوکاڵیش گرنگترین سەرچاوەی داهاتی خەزێنەی دەوڵەتەکەیان بوو[778]، سەرباری بەکارهێنانی توندوتیژی لە سەپاندن و وەگرتنیاندا، ئەوان سڵیان لە وەرگرتنی باجی زیادەو نادروستیش (مکوس)[779] نەکردۆتەوە[780]، نەبوونی سیستەمێکی ڕێکوپێك و بنەمایەکی گونجاو بۆ دیاریکردنی ڕێژەی باجەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە، ئەوەندەی تر جوتیارانی تووشی تەنگەژەی ئابووری کردۆتەوە، بەجۆرێك هەر میرەو (سوڵتانە) بەپێی ئارەزووی خۆی گۆڕانکاری بەسەر ڕێژە و جۆرەکانیدا هێناوە، بۆ نموونە لەسەردەمی سوڵتان ملکشاە (٤٦٥-٤٨٥ك/١٠٧٢-١٠٩٢ز) (مکوس) لەسەر خەڵك لابرا[781]، بەڵام دواتر دانرایەوە، لەوانەش سوڵتان سنجر(٥١١ -٥٥١ك/١١١٧-١١٦٨ز) بە ئارەزووی خۆی بەبێ جیاوازی باجی لەسەر هەموو شارەکانی عیراق داناوە[782]، دەوڵەمەندی خەزێنەکانی ئەو سوڵتانە بە سەروەت و سامان و زێڕ و زیو شتە گرانبەها و سەرنجڕاکێشەکان، بەڵگەن لەسەر زۆری ڕێژەی باجەکان ، کە بێگومان کوردستانیش بەشێك لە سنوری قەڵەمڕەوی ئەوی پێکهێناوە[783]، بەتایبەت لەکاتی شەڕەکاندا وەرگرتن و زیادکردنی باج ببوو بەدیاردەیەکی ڕۆژانە لەگەڵ پەلاماردان و کشانەوەی هەر هێزێکدا بەگوند و

---

[777] ابن الجوزي، المنتظم، ج٩، ص ص١٣٧-١٣٨.

[778] آن لمبتن،تاريخ ميانه ايران،ص١٧٤.

[779] مکوس:ئەو باجانە دەوترا کە لەسەر کاڵاکان دانرابوو لە بازاڕەکاندا، وە بەنادروست دانراوە، سوادي عبد محمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية، ص٢٦٠.

[780] ابن الجوزي، المنتظم، ج٩، ص٢١٨.

[781] ابن القلانسي، ذيل تاريخ الدمشق، ص١١٨؛ابن الأثير، الكامل، ج٨، ص٣١٣.

[782] الراوندي، راحة الصدور، ص٢٦٠.

[783] كرماني،سلجوقيان وغز در كرمان،ص٢٧٠؛ بدرالدين العينى،السيف المهند،ص ص١٧٧-١٧٨.

شارەکاندا بەزۆر لە خەڵکیان وەردەگرت[٧٨٤]، بەبێ گوێدانە تێپەڕبوونی وادەی ساڵێك بەسەر وەرگرتنیدا، کە هەموو ئەمانە ڕادەی چەوساندنەوەی جوتیاران بە تایبەت وەك زۆرینەی دانیشتوانی کوردستان دەردەخات و شوێنەوارو بەرئەنجامی خراپیشیان لێکەوتەوە.

مەغۆلەکانیش سەرباری شاڵاوە کارەساتبارەکانیان لەپێناو دەستکەوتنی داهاتی زیاتردا چەند باجێکی جیاجیایان بەسەر دانیشتواندا سەپاند، لە ساڵی (٦٤٢ك/١٢٤٤ز) لەژێرناوی پاراستن لە مەترسی دەرەکی بەناوی باجی (تەتەر-یرالیغ)[٧٨٥] دراوێکی زۆریان بەسەر شارەکانی (ماردین و جزیرەی ئیبن عومەر وحصین کیفاو موسڵ..)دا سەپاند[٧٨٦]، باجەکان بوونە ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی داهات و چەوساندنەوەی دانیشتوان بەجۆرێك لەسەر هەموو کەلوپەلێکی بازرگانی و کشتوکاڵی و خواردەمەنیەکان باجیان دانابوو[٧٨٧]، بەتایبەت لە وەرگرتنی (خەراج)ی سەرکشتوکاڵ زۆر توندوتیژ بوون، تەنانەت لەسەر لەوەڕگەکانیش باجێکی زۆردارانەیان لەسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دانابوو، کە بە (القوبجور-

---

[٧٨٤] بۆ کاریگەری خراپی هێزی لەسەر باری ئابووری بڕوانە: نزار محمد النعيمي، الجيش وتأثيراته،ص ص٢٩٣-٣١٠؛ صالح رمضان حسن،مقاومة الخلافة العباسية،ص١٠٥.

[٧٨٥] يراليغ: وشەیەکی مەغولیە (يرليغ) تاکەکەیەتی، بەمانای (بڕیاردان یان فرمان)دێت، العمري،مسالك الابصار،ج٣،ص١١٨،هامش(٤).

[٧٨٦] ابن شداد،الاعلاق الخطيرة،ج٣، ق١، ص٢٣٧؛ أحمد ماهرحمادة، وثائق الحروب الصليبية والغزو المغولي،ص٣٤٣.

[٧٨٧] بروي،تاريخ الحضارات العام،ص٣٧٧؛ محمد سهيل طقوش،تاريخ المغول العضام،ص١٥٧؛صالح احمدالعلي،تسلط الاجنبي،بحث ضمن الكتاب العراق فى التاريخ،دار الحرية،(بغداد:١٩٨٣م),ص٥٥١.

قبچور)[٧٨٨]ناسرابوو، لەبەرامبەر لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان لە هەر (سەد) سەر ئاژەڵێکیان وەك باج لە خاوەن ئاژەڵەکان وەردەگرت[٧٨٩]، ئەمەش زیانی زۆری بەجوتیاران گەیاندووە و بەناچاری بۆ ڕزگاربوون لەو بارودۆخە بۆ شارەکان یان ناوچەکانی دەوروبەر کۆچیانکردووە[٧٩٠].

## دووەم/ بڵاوبوونەوەی دەرەبەگایەتی:

لە ڕاستیدا بەتەنها باجەکان نەبوونە بەربەست لەبەردەم گەشەکردنی کشتوکاڵ و ئەرکی گران بەسەر شانی جوتیارانەوە، بەڵکو ئەو شێوازو ئامرازانەش کە هێزەکان بۆ کۆکردنەوەیان پیادەیان کرد، کاریگەری خراپیان کردە سەر دوارۆژی ئەم لایەنەو لە مێژووی دوور و نزیکی کوردا شوێنەواریان بەجێهێشتووە[٧٩١]، ڕەنگە شێوازی بەخشینی زەوی دەرەبەگی، کە دواتر گەشەی کردو بوو بەسیستەمێکی ئابووری بەربڵاوی ناو کۆمەڵگای کوردی، بەناوی دەرەبەگایەتی، کاریگەری گەورەی کردە سەر

---

[٧٨٨] قبچور(qubchur): زاراوەیەکی مەغولیە بەمانای باجی سەر مەڕو ماڵات یان باجی لەوەڕاندن دێت،آن لمبتن،تاریخ میانه،ص٢١٨.

[٧٨٩] ابن العبری،تاریخ المختصر الدول،ص٤٥٩؛جعفر حسین خصباك،العراق في عهد المغول الإلخانيين،ص١١١؛علی عادل,أربل,ص٢٥٤.

[٧٩٠] حمدالله مستوفی،تاریخ گزیده،ص٤٠٤؛آن لمبتن،تاریخ میانه ایران،ص٢١٩.

[٧٩١] بەگشتی سێ شێواز لە کۆکردنەوەی باجدا پەیڕەودەکرا، دوو جۆری یەکەمیان بەخشینی بە (الإقطاع والضمان)کە ناوچەیەك دەدرا بەکەسێك لەبەرامبەر کۆکردنەوەی باجەکەی و ناردنی بەشێك بۆدەوڵەت، ڕێگەی کۆکردنەوەی ڕاستەوخۆش (الجباية المباشرة)، دوو جۆری یەکەم زیاتر پیادە دەکرا، سوادی عبد محمد، الأحوال الإجتماعيه والإقتصاديه، ص ص٢٦٤-٢٦٥؛علاو محمود خليل، المغول في الموصل و...، ص١٨٦.

دابەشـــكردنی چـــینەكانی كۆمـــەڵ لەســـەر بنـــەمای هێـــزی ئـــابووری و دەركـــەوتنی جیاوازیەكی چینایەتی تاقەت پڕوكێن، بۆیەیەكانیش لە پێشینەی ئەو هێزانەبوون كە پیادەی ئەو سیاسەتەیان كرد، بێ لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی گـشتی جوتیـاران و لـە پێناو كۆكردنەوەی سامان و ڕازیكردنی هێـزی سـەربازی ڕێژەیـەكی زۆریـان لـە زەوی دەرەبەگی بەخشی[٧٩٢]، ئەمە بوو بە بەشێك لە سیاسـەتی ناوەنـدی سـەلجوقیەكانیش، كاتێك بڕیاریان لـە سـەر بەخـشینی زەوی دا بەسـەر مـیرو سـەركردەكانی سـوپا لـە بەرامبەر پێشكەشكردنی بڕی باجی داواكراو و یارمەتی سـەربازی بـە دەوڵـەت و بـە گوێرەی پلەوپایەیان گوندێك یان چەند گونـدێكیان بـۆ بڕیـەوە[٧٩٣]، وەك بەخـشینی ناوچەی ماردین بە (اكسب كوڕی ارتق)ی توركمانی لەلایەن سوڵتان ملكـشاه وە[٧٩٤]، دواتـریش دەسـەلاتی دەرەبـەگی خـۆی فراوانكـردو دەسـتی بەسـەر دیـاریكرو چـەند ناوچـەیەكی دیـشدا گـرت، لەسـەر ئـەو بنەمایـەش میرنـشینەكانی ئـەرتقی لـێ پێكهـات[٧٩٥]، بۆچـوونی واش لـە ئارادیـە كـە بـۆ ئاسـان بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت و پیادەكردنی جۆرێك لە دەسەلاتی ناوەندی (لامركـزی) دەرەبـەگی لەشكرسـازی بـرەوی پەیدا كردبێت[٧٩٦]، لەگەڵ لاوازبوونی دەسـەلاتی ناوەندیـشدا ئـەو جـۆرە دەرەبەگانـە سنوری قەڵەمڕەوی خۆیان فراوانكرد[٧٩٧]، مەغۆلـەكانیش بـە دابڕینـی شـارێك یـان

---

[٧٩٢] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص ص٢٨٢-٢٨٣؛ النويري،نهاية الارب،ج٢٦،ص١٠٧.

[٧٩٣] الاصفهاني،تاريخ دولة ال سلجوق،ص٢٢٠؛السبكي، طبقات الشافعية، ج٣، ص٩؛محمد عبدالعظيم، السلاجقة، ص٣٧٦.

[٧٩٤] القلقشندي،صبح الاعشى،ج٤،ص٣١٩.

[٧٩٥] عبدالسلام الماردينی،تاريخ ماردين،ص٥٤.

[٧٩٦] ابراهيم علي طرخان، النظم الأقطاعية، ص٢٢؛محمد عبدالعظيم، السلاجقة، ص ص٣٩١-٣٩٢.

[٧٩٧] آن لمبتن،تاريخ ميانه ايران،ص١١٩.

ناوچەیەك بۆ سەركردەو كەسە نزیكەكانی سەر بە بنەماڵەی خۆیان درێژەیان بەو شێوازەدا[798].

هەربەم شێوەیەش بەشی زۆری زەوی و زاری كوردستان بە میر سەركردە سەربازیەكان بەخشران، لەوانە بەخشینی هەندێ لە ناوچەكانی رۆژئاوای هەرێمی چیاكان بە میر حسنویە لە بەرامبەر پێشكەشكردنی یارمەتی سەربازی بە ركن الدولەی بوەیهی[799]، وە بەخشینی چەند ناوچەیەكی جزیرە بە میر (باد)[800]، رەنگە هەر بچێتە خانەی جۆرێك لە دەرەبەگایەتی، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش پەرەیان بە دەسەلاتی خۆیان داو سنووری قەڵەمرەوییان فراوانكرد، بەمەش دەكرێت زەمینەی دامەزراندنی بەشێك لە میرنشینەكان بەریشەیەكی دەرەبەگییەوە ببەسترێتەوە، كە دواتر بەشێوازی دەرەبەگی میراتگری (بۆماوەیی) دەسەلاتیان بۆ كورو نەوەكانیان گوازرایەوە[801]، هەرلەسەر ئەو بنچینەیەش لە زامنكاران و پارێزگاریكاران جیا دەكرێنەوە، چونكە ئەمانە بە میرات نەدەمانەوە، بەڵكو هەركاتێك میر یان سوڵتان مەبەستی بوایە بەرپرسیارێتیەكەی لێ وەردەگرتنەوە[802].

گەشەكردنی مێژووی ئەو سیستەمە بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین بنەماڵەی دەرەبەگی لە كوردستاندا، هەر بنەماڵەو لەناو هۆزێكی دیاریكراو و دەسەلاتی خۆی

---

[798] بڕوانە: حمدالله مستوفی،تاریخ گزیدە،ص٦٠٢؛جعفر حسین خصباك، العراق في عهد المغول الإلخانیین، ص ص١٠٤-١٠٥.

[799] مسكویه، تجارب الأمم، ج٥، ص ٣٧١؛ محمد امین زكی،تاریخ الدول والامارات الكردیة،ص٨٩.

[800] الفارقي، تاریخ الفارقي، ص٥٤؛ابن الأثیر، الكامل، ج٧، ص ص ٤٠٥-٤٠٦.

[801] زەوی دەرەبەگی چەند جۆرێكی هەبوو، لەوانە سەربازی و میراتگری و مەدەنی و تایبەتی و سیاسی و...) بڕوانە: عبدالعزیزالدوري، تاریخ العراق الإقتصادي، ص ص٢٨-٢٩؛سوادي عبدمحمد، الأحوال الإجتماعیة والإقتصادیة، ص٢٤٠.

[802] حسام الدین نەقشبەندی، شارەزوور، ل٤٤٨.

بەسەر ئەوانی دیدا سەپاندووەو سەرۆکی بنەماڵە وەك (دەرەبەگ-ئاغا) دەرکەوتووە، کە هەتا زاراوەکەش تورکیەو بەخاسیەتە کانیشیەوە وەك شوێنەوارێك لەناو کورد دا ماوەتەوە، کە بۆخاوەن گوند و مولکی زۆر بەکارهاتووە[٨٠٣]، وە هەمیشە بە متمانەکردنە سەر هێزێکی گەورەتر لە هێزەکەی خۆی، کە ئەویش هێزی دەوڵەت بووە، وەك پەنابردنی هەندێك لە میرەکوردەکان بۆ هێزی داگیرکەرو خواستنی یارمەتی لێیان لە کاتی پێویستدا لە هەوڵی پاراستنی دەسەڵاتی بنەماڵەیی و مولکەکانیدا بووە[٨٠٤]، بەمەش مانەوەی خۆیان پاراستووەو زەوی و زاری زیاتریشیان خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و بەهۆی دانانی باج و خەراجیش لەسەر خەڵك سەروەت و سامانی زۆریان کۆکردۆتەوە، رەنگە دانان و زیادکردنی باج لەلایەن میر حسنویهی لەسەر خاوەن زەوی و دەوڵەمەند و کاروانە بازرگانیەکان، کە بەهۆیەوە لەگەڵ (سهلان بن مسافر الکردی) فەرمانڕەوای شاری نەهاوەند پەیوەندی تێکچوو و بریاری هێرشکردنە سەر سهلانی دا[٨٠٥]، دەشێ دەوڵەمەندی و سامانی زۆری ئەو میرە کوردەش کە پێی ناسراوە[٨٠٦]، بەڵگەیەکی دیاریێت لەم بارەیەوە.

لە سنوری قەڵامڕەوی هەمان میرنشیندا دەرەبەگەکان رۆڵێکی خراپیان لە چەوساندنەوەی جوتیاران و تێکدانی کێڵگەو رەزو باخەکانیاندا گێراوە، میر بدریش لە خوانێکی نان خواردنی خۆیدا بانگهێشتی دەرەبەگەکانی کرد، ئەوەی پێ راگەیاندن کە روخساری ناشرین و بەدکارن و داوای لێکردن کە دەست لە چەوساندنەوەی جوتیاران هەڵگرن، وەهەرەشەی کوشتنی لە هەریەکێکیان کرد کەدەست لە کارە خراپەکانی

[٨٠٣] هەژار، هەنبانە بۆرینە، ل٩.

[٨٠٤] بۆزانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بگەرێوە: شوێنەوارە سەربازیەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[٨٠٥] مسکویه، تجارب الأمم، ج٥، ص٣٧٢؛ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص ص ٢٩١-٢٩٢.

[٨٠٦] ابن الجوزي، المنتظم، ج٧، ص١٠١؛بدلیسي، شەرەفنامە، ل٣٤.

هەڵنــەگرێت، بــەکرداریش ئــەوەی جێبــەجێکردو چــەند کەســێکیانی لــەناوبرد[٨٠٧]، ئەمــەش کاریگەری کردە سەر گەڕانەوەی جوتیاران بۆ سەر کێڵگــەکانیان و بوژانــەوەی کشتوکاڵ و زیادبوونی بەرهەمیان، داهاتی میر بدریش زیادی کرد[٨٠٨]، واپێدەچێت کە میری ناوبراو ڕێگەی لە دەرەبەگەکان گرتبێت لە وەرگرتنی باجی سەر جوتیاران و خۆی ئەوکارەی ئەنجامدابێت.

هەرچەندە سەرهەڵدان و گەشەکردنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی پەیوەنــدی بەسروشــتی پێشکەوتنی کۆمەڵگاوە هەبووە، وەك قۆناغێکی نوێی دی سیستەمی ئــابووری، بــەڵام هێزە داگیرکەرەکان ڕۆڵی گرنگیان لە بەهێزکردنی ئەم ڕژێمە لە کوردستاندا بینیــوە، بۆیە دەکرێت وەك شوێنەوارێکی خراپی لەشکرکێشیەکان دیاری بکرێت، کە هــەر لــە سەدەی (چوارەمی کۆچی/دەیەمی زایینی) پیادە کراو لە سەردەمی ئیلخانیشدا بــرەوی زیاتری پەیداکردو بەشێکی زۆری زەویــەکانی هەرێمــە کوردنــشینەکانی ئازربیجــان و ئاران و جزیرەیان بە خانەوادەی مەغۆلی بەخشی و بوونە درێژەدەری ئەو بارودۆخە[٨٠٩]، کە کاریگەری خراپی کردەســەر ئاســتی گــوزەرانی خــەڵك و کەمبوونــەوەی توانــستی بەرهەمــداری زەویــە کــشتوکاڵیەکان و ســەرهەڵدانی ئــاژاوەو ملمڵانــێ لەســەر بەدەستهێنانی زۆرتــرین ڕێــژەی زەوی و زیــادبوونی هــەژمونی هەنــدێ لــە ســەرکردە سەربازیەکان و توندوتیــژی نوانــدن بەرامبــەر جوتیــاران، کــە تێکڕایــان شــوێنەواری

---

[٨٠٧] الروذراوری،ذیل تجارب الامم،ج٦،ص١٧٣؛ابن الجوزی،المنتظم،ج٧،ص٢٧١.

[٨٠٨] الروذراوری،ذیل تجارب الامم،ج٦،ص١٧٤.

[٨٠٩] الهمــذانی،جامع التــواریخ،مج٢،ج١،ص٣٣٨؛حمــدالله مــستوفی،تــاریخ گزیــده،ص٦٠٢؛عــلاء محمودخلیل،المغول في الموصل والجزیرة، ص١٨٦.

خراپیان لەسەر باری ئابووری بەتایبەتیش کشتوکاڵ بەجێهێشتووە[٨١٠]، ئەوەی کە زیاتریش زیانی بەکەرتی کشتوکاڵ و بواری ئاودێری گەیاند، سپاردنی بەڕێوەبردنی زەویەکان بوو بە نوێنەرو خزمەتکارەکانیان کە بەئارەزووی خۆیان کێڵگەکانیان بەکاردەهێنا و گوێیان بە چاککردنیان نەدەدا[٨١١]، هەموو ئەمانەش بوونە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەژاری و پەرەگرتنی جیاوازی چینایەتی و چەوساندنەوەی زۆرینە لەلایەن چینی باڵادەست و بنەماڵەی دەرەبەگەکان و خانەوادە دەسەڵاتدارەکانەوە کە (البنداری) وەك باڵاترین چینی ناو کۆمەڵگا و بە (أفضل أهل زمانهم) ناوی بردوون[٨١٢]، کورد لەمانەوەی ئەو دۆخە زیان هێنەرە زیانی زۆری لێکەوتووە، بە تایبەت کە دەرەبەگەکان تەواو دەستیان بەسەر سەرچاوەکانی داهاتدا گرتووە، بەمەش ناچوونیەکی و ناکۆکی لەناو هۆز و دەرەبەگەکان خۆشیاندا پەیدا بووە، هەندێ جاریش هێزە داگیرکەرەکان بەجیاوازی خستنە نێوان دەرەبەگەکان و بەخشینی زەوی دەرەبەگی بەهۆزێك لەسەر بەرژەوەندی هۆزێکی دی، شەڕی خێڵەکیان هەڵگیرساندووە[٨١٣]، تاچەند سەدە دواتریش کاریگەری خراپی ئەو سیستەمە وەك نەریتێکی خراپی کۆمەڵایەتی پشتاوپشت بۆ نەوەکان ماوەتەوەو کاری گرانیشی کردۆتە سەر ژیانی کورد، سەرباری چەوساندنەوەی سەختی هێزە داگیرکەرەکان، دەرەبەگە خۆماڵیەکانیش هێزی بەرهەمهێن و پەرەپێدانی کوردیان تێکشکاندووە و ڕێیان لە بەرەوپێشچوونی گرتووە، کاریگەری خراپیشی کردۆتە سەر ئاستی هۆشیاری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا.

---

[٨١٠] محمد عبدالعظيم، السلاجقة، ص ص ٣٩٥-٣٩٦؛عبدالله رشيد الجميلي،امارة الموصل،ص ص٢٩٣-٢٩٤.

[٨١١] مسكويه، تجارب الأمم، ج٥، ص٣٨٢؛ابراهيم علي طرخان، النظم الاقطاعية، ص٢٣.

[٨١٢] تاريخ دولة ال سلجوق، ص٦٥.

[٨١٣] بۆ نموونە بڕوانە: آواز محمد عبدالكريم،الكرد الجاوانيون،ص٤٢،ص٦٧.

## سێیەم/ پەرەگرتنی برسیەتی و قاتوقڕی:

بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئابووری و ڕێژەی داهاتی کوردستان بەر لەهەندێ لەشکرکێشیەکان و دواتر زیاتر کاریگەری خراپی پرۆسەکە دەردەکەوێت ئەسەر کەرتی کشتوکاڵ و ئاستی داهاتی دانیشتوان، لەم بارەیەوە سەرچاوەیەك لە سەدەی (چوارەمی کۆچی/دەیەمی زاینی)دا ئاماژەی بۆ ئەوەکردووە، کە تەنها خەراجی هەرێمی چیاکان ساڵانە بیست و دوو ملیۆن درهەم بووە[٨١٤]، سەرچاوەیەکی دیش لە باسی شارێکی وەك میافارقین[٨١٥] ئاماژەی بۆ دەوڵەمەندی دانیشتوان و زۆر و زەبەندی بەرهەمی کشتوکاڵی کردووە[٨١٦]، ئەمانەو دەیان ئاماژەی دی لە سەرچاوەکاندا بەرچاودەکەون، کە بەڵگەن لە سەر ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵی و دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی کوردستان[٨١٧]، بەڵام دوای لەشکرکێشیەکان ڕادەی بەرهەم زۆر کەمی کردووە، بەتایبەت لەشکرکێشی سەلجوقیەکان و مەغۆل زیانی زۆریان بە کورد گەیاندووە، بە نموونە ئەگەر سەرنج لە داهاتی ناوچەکانی موسڵ و دەوروبەری بدەین، لەسەردەمی ئەتابکیەکان و دوای لەشکرکێشی مەغۆل، بە لەبەرچاوگرتنی ڕێژەی ئەو داهاتەی لەرێگەی خەراجەوە کۆدەکرایەوە، بەروبوومی کشتوکاڵیی کەمی کردووە[٨١٨]، لەکاتێکدا ڕێژەی باجەکانی مەغۆل زیاتریش بووە.

---

[٨١٤] ابن حوقل، صورة الأرض، ص٣١٣.

[٨١٥] لەژێر سایەی میرنشینی مەروانیدا ئەمە بەدی هاتووە.

[٨١٦] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص١٩٩.

[٨١٧] بۆ زانیاری لە سەر ڕێژەی خەراجی هەندێ لە شارە کوردیەکان بڕوانە: قدامە بن جعفر،الخراج،ص ص٢٤٤-٢٤٥.

[٨١٨] بڕوانە: حمدالله مستوفى، نزهە القلوب،ص ص١٠٢-١٠٣؛ علا محمود خليل، المغول فى الموصل والجزيرة،ص١٥٨.

بـەڵام لەشکرکێـشییەکان لـە قۆناغـە جیاوازەکانـدا بـارودۆخێکی خراپیـان خوڵقاندووە، نەیان هێشتووە ئەو ڕەوشە بەو شێوەیە بەردەوام بێـت، ئـیتر برسـێتی وەك بەهێزترین دوژمنی شاراوەی مرۆڤایەتی سەری دەرهێناوەو تەنگی بـەژیان هەڵـچنیوە، بەهۆی کەمبوونەوەی دەستی کار بەتایبەت بۆ کشتوکاڵ کەکاری سەرەکی کورد بووە و پێویستی بەهێزی بازووی زۆر هەیە[819]، بۆیە لەسەر پێکهاتەی تەمەنیش کاریگـەری خراپیان بەجێهێشتووە، بەوەی کە ئەوانەی دەتوانن کاربکەن بەهۆی شەڕەکانەوە زۆریـان لەناوچوون، ئەمەش وایکردووە ئاستی گوزەرانی خەڵك لاوازبێت و هەژاری و نەخۆشـی بڵاوبێتەوە، وە بەهۆی پەرەسەندنی برسێتی و گـرانیش ڕێـژەی مـردن زیـادی کـردووە، ڕەنگە خەرجکردنی بڕی بیست هەزار درهەم ساڵانە لەلایەن میر بدرەوە بۆکڕینی کفن و بەڕێکردنی مەراسیمی تازیەی مردوان[820]، بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی ئاسـتی گـوزەرانی خەڵکێك گەیشتۆتە ڕادەیەك کە نەتوانن تەنانـەت کفنـی مـردنیش بـە داهاتەکـەیان بکڕێت، یان بێ سەرپەرشـت و بێـدەرەتان ماونەتـەوە، وەیـان پێـدانی یارمـەتی (وەك پێشینەی خانوبەرەی ئەمڕۆ) بە جوتیاران و ئەوانەی توانای دروستکردنی خانوبـەرەیان نیە وەك زامنکردنی کۆمەڵایەتی[821]، ڕادەی کاریگەری خراپی ئـەو ڕەوشـە سـەربازیە دەردەخـەن کـە لـە سـۆنگەی هێرشـی زەیاریـەکان و بوەیهیـەکان بەسـەر بەشـێکی کوردستاندا هاتووە، لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەو ڕەوشە هەر بەردەوامبووە و ئەمەش وای لە مرۆڤە بێدەرەتانەکان کردووە ڕێگای کـۆچ بگرنەبـەر، هەندێکیـشیان لـەپێناو دەستخستنی بژێوی ڕۆژانەیان پەنا بـۆ دزی و ڕێگـری بـەرن، بەتایبـەت لـە هـەرێمی

---

[819] موسى مصطفى الهسنياني،سنجار،ص١٣٠.

[820] سبط ابن الجوزي،مرآة الزمـان،ص٢٩٧؛ابـن كثير،البدايـة والنهايـة،ج١١،ص١٥٣؛الحنبلي،شـذرات الذهب،مج٢،ج٣،ص١٧٤.

[821] ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٢٧٢؛ محمد امين زكي، تاريخ الدول والامارات الكردية،ص١٠٣.

چیاکاندا زۆر پەرەی سەند و هەرزوش دەنگی بێزاری دانیشتوان لە دژیا بەرزبۆوە[822]، دەشێ ئەو خزمەتە کۆمەڵایەتیە گرنگانەش کە مضفرالدین کوکبری سەرداری هەولێر پێشکەشی خەڵکی هەژارو هەتیو و بێوەژن و بێدەرەتانەکانی کرد، لە سۆنگەی ئەو بارودۆخە سەربازیەوە بوو بێت کە لەسەر دەستی خوارزمیەکان و مەغۆل بە سەرناوچەکە هاتووە، بۆ ئەو مەبەستەش چەند خانەیەکی تایبەتی بۆ هەر یەك لەوانە کردووە و دراوێکی زۆری لە کارە خێرخوازیەکان خەرجکرد[823]. ئەوە سەرباری کارەساتە سروشتیەکان کە سەرجەمیان شوێنەواری خراپیان لەسەر ژیانی تاکی کورد بەجێهێشتووە.

لە نموونەی ئەو رووداوە سەبازیانەی کە کارەساتی مرۆییان لە دوای خۆیان بەجێهێشتووە، شەڕ وململانێی نێوان بویهیەکان و حەمدانیەکان بوو، کە سەرباری بەرزبوونەوەی نرخی کاڵاکان، حەمدانیەکان ستەمی زۆریان لە دانیشتوانی شارەکانی جزیرە کردووە[824]، هەروەها لە ئەنجامی خراپەکاریەکانی غوزەکانیش وڵات دووچاری برسیەتی و قاتوقڕی هاتووە، بە تایبەت دوای تاڵانکردنی ناوچەکانی شارەزوور ساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٨ز) دانیشتوانی دووچاری برسیەتی هاتن و نەخۆشی و کولیرای تێدا بڵاوبووەوە و بەشێکیش لە دانیشتوان بەرەو بەغدا کۆچیانکرد[825]، لەم بارەیەوە بزوتنەوەی بساسیریش ئەنجامی خراپی لێکەوتەوە و نرخی شتومەك بەرزبۆوە و گرانیەکی مەترسیدار هەرێمی جزیرەو موسڵ و ناچەکانی دی عێراقی گرتەوە[826]، وە

---

[822] مسکویه،تجارب الامم،ج٥،ص٣٧٨.

[823] بروانه: ابن خلكان، وفيات الاعيان،ج٢،ص٢٩١؛ سامی بن خماس الصقار، أربل،ص ص٨٤-٨٦.

[824] ابـن حوقـل، صـورة الأرض، ص١٩١؛ ابـن الأثـير، الكامـل، ج٧، ص ١٦١، ص١٧٠؛احمـدعلی الصوفی،الارض السواد،ص٨٨.

[825] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٦٨؛حسام الدين نەقشبەندی،شارەزوور،ل٤٢٢.

[826] ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص١٧٠؛ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص ص١٤٤-١٤٥.

لەئەنجامی هێرشی سەلجوقیەکانیش لە ساڵی (٤٤٨ك/١٠٥٦ز) بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان، ڕێگاکان پەکیان کەوت و نرخی کاڵاکانیش بەرز بۆوەو گرانییەکی مەترسیدار ڕووی لە جزیرەو موسڵ و شام کرد، بەجۆرێك کە خەڵك ناچار بەخواردنی لاشەی مرۆڤە مردووەکان بوون و ڕێژەیەکی بەرچاوی دانیشتوان لەناوچوون[٨٢٧]، بەمەرکەزیکردنی دەوڵەت و لەناوبردنی میرنشینە کوردیەکان و ئەو ڕەوشەی لە ژێر سایەی سەلجوقیەکاندا هاتە ئاراوە، کاریگەری خراپی کردە سەر کشتوکاڵ و بارودۆخی ئابووری بەگشتی، بەجۆرێك کە بوژانەوەی ئابووری لەئاستی دەیەکی سەردەمی میرنشینێکی وەك مەڕوانیدا نەبووە[٨٢٨]، ئەمەش بەڵگەیەکی دیارە لەسەر خراپی بارودۆخی ئابووری کوردستان لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا.

لە ئەنجامی لەشکرکێشی خوارزمیەکانیشدا ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز) بۆ سەر کوردستان و وێرانکردنی شارو گوندەکان و بەتاڵانبردنی بەرهەمی جوتیاران، گرانییەکی سەخت ناوچەکەی گرتەوەو بەهای کاڵاکان بەتایبەت (گەنم و جۆ) کە پێویستی ڕۆژانەی خەڵکن، چەند قات زیادی کرد[٨٢٩]، وە هێرشەکانی ساڵانی (٦٢٧-٦٢٨ك/١٢٢٩-١٢٣٠ز)ش بۆ سەر شاری خلاط و دەوروبەری گرانییەکی سەختتری بەدوای خۆیدا هێنا[٨٣٠]، بەهۆی بەردەوامبوونی ئابلۆقەی سەر شارەکەش هەژاری باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاو برسێتی هەڕەشەی لە ژیانی دانیشتوان کردو گوندەکان

---

[٨٢٧] ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص١٨٠؛ المقريزي، اتعاظ الحنفا،ج٢،ص٢٣٥؛صالح رمضان حسن،مقاومة الخلافة العباسية،ص١١٣.

[٨٢٨] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص٢٠٤.

[٨٢٩] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٣٨٨؛ ابوشامه،تراجم رجال القرنين،ص١٧٨؛ابن كثير،البداية والنهاية،ج١٢،ص١٩٦.

[٨٣٠] النسوي،سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي،ص٣٢٠؛أبو الفضائل الحموي،التاريخ المنصوري،ص١١٤؛ابوشامه،نزهة المقلتين في سيرة الدولتين،ص٦٤,ص٨٠.

وێرانبوون و سامانی ئاژەڵ لەناوچوو، دانیشتوان سکالآیان گەیاندە خەلیفە المستنصربالله (٦٢٣-٦٤٠ك/١٢٢٦-١٢٤٢ز) و سەلجوقیەکانی ڕۆم ، تاتکایان بۆ لە جلال الدین منکبرتی بکەن، کە دەستبەرداری ئابلۆقەی سەر شارەکە بێ[٨٣١]، تا دواجار سوڵتان علاءالدین کیقباژ یەکەم (٦١٧-٦٣٤ك/١٢٢٠-١٢٣٦ز)ی سەلجوقیەکانی ڕۆم شارەکەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بڕیاری لە سەر ئاوەدانکردنەوەو چاککردنەوەی هەندێ لە پرۆژە ئاودێریەکانداو جوتیارانی گەڕاندەوە گوندەکان و هەندێ هاوکاری ماڵی پێدان[٨٣٢].

هێرش و پەلامارەکانی مەغۆلیش گرانی و قاتوقڕی زۆریان بەدوای خۆیاندا هێناوە، بەتایبەت بەهۆی ئابلۆقەو گەمارۆی سەر شارو قەڵاکان کە بەهۆیەوە خەڵکێکی زۆر لەناوچوون هەروەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، وەلەسایەی فەرمانڕەوایی ئیلخانیدا زۆرجار بەهۆی سیاسەتی زۆردارانەو فەرامۆشکردنی کاروباری ئابووری، گرانی ڕووی لە وڵات کردووەو نرخی بەروبوومە پێویستەکان چەند قات زیادی کردووە[٨٣٣]، کە زۆر جار دانیشتوان نەیانتوانیوە بەداهاتی ڕۆژانەیان بژێوییان دابین بکەن و ناچار بوون منداڵەکانیان بفرۆشن، وەك ئەو گرانیەی لە سۆنگەی ئەو بارودۆخەوە ناوچەکانی دیاربکر و سنجارو موسڵ و ماردین و میافارقین و جزیرەی ئیبن عومەر و هەولێری گرتەوە[٨٣٤].

---

[٨٣١] الجويني،تاريخ جهانگشای،ج٢،ص٧٨.

[٨٣٢] ابوالفضائل الحموي،التاريخ المنصوري،ص٢٥٥"مؤلف مجهول،اخبار السلاجقه الروم،ص٢٢٤"حكيم البابيري، مدينة خلاط، ص٢٠٩.

[٨٣٣] اليونيني، ذيل مرأة الزمان، مج٢، ج١، ص٣٧٦، ص٤٣٦؛وليد مصطفى نجم،الاوضاع الاقتصادية،ص٦٣.

[٨٣٤] ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص٢٥٨" ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٤١.

## چوارەم/ شوێنەواری دێ:

کۆی ئەو کارەساتانەی کە بەسەر کوردستاندا هاتووە، شوێنەواری خراپیان بەسەر ئاستی ئاوەدانی شارو گوندەکاندا بەجێهێشتووە، بەجۆرێك بەدەیان گوند بەهۆی ئەو نەهامەتیەی لەسەر دەستی سوپای هێزە داگیرکەرەکان بەسەریان هاتووە دانیشتوانی کۆچیانکردووە، ئیدی بوونە کەلاوەو وێران بوون[٨٣٥]، یان زۆرجار بەهۆی لەناوچوون و کەمبوونەوەی ڕێژەی جوتیاران خۆیان ولاّت بووەتە کەلاوە[٨٣٦]، بۆ نموونە تا سەرەتاکانی سەدەی (شەشەمی کۆچی/دوازدەیەمی زایینی) تەنها لە ناوچەی میافارقین (٢٦٥) گوند هەبووە[٨٣٧]، کە هەر وەك (ابن جبیر) لە وەسفی ئەو ناوچانەدا کە لە ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) سەردانی کردوون ئاماژەی بەوەداوە، کە بەروبوومی کشتوکاڵیان زۆر بووەو بە باخ و بیستان و ئاوەدانی زۆر بەناوبانگ بوون[٨٣٨]، بەلاّم بەهۆی ئەو بارودۆخە سەربازیەی بەسەر کوردستان بەگشتی و ناوچەکانی جزیرەدا هات بە تایبەت زۆربەی گوندەکان وێرانبوون و چالاکی کشتوکاڵی یەکی کەوت و داهات و بەروبوومی کشتوکاڵی بەڕادەیەکی زۆر کەمی کرد، وەك گوندەکانی دەوروبەری سنجار کە بەهۆی کوشتاری مەغۆلەوە زوربەی جوتیاران زەویوزاری خۆیان بەجێهێشتوو بۆ سنجار و شارەکانی دی کۆچیانکرد[٨٣٩]، ئەوە سەرباری ئەوەی دواتریش ئەو ناوچانە بوونە شانۆی ململانێی نێوان مەغۆلەکان و مەمالیك لە نیوەی دووەمی سەدەی

---

[٨٣٥] بدري محمد فهد، العامة ببغداد، ص٩١؛ فائزة محمد عزت، الحياة الإجتماعية، ص٥٥.

[٨٣٦] ابو الفضائل الحموي، التاريخ المنصوري، ص١١٤.

[٨٣٧] الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص٢٨٣-٢٨٤.

[٨٣٨] رحلة ابن جبير، ص ص١٨٧-١٨٨.

[٨٣٩] موسى مصطفى الهسنياني،سنجار،ص١٣٠.

(٧ك/١٣ز)[٨٤٠]، كه لەگەڵ هەر پەلامارو پاشەكشەكردنێك بە ناوچەكەدا كارەساتی گەورەیان بەسەر دانیشتواندا هێناوە، بۆ نموونە ساڵی (٦٩٨ك/١٢٩٨ ز) هێزێكی سەربازی مەمالیك لە شامەوە پەلاماری شاری ماردینی دا،گوندەكانی دەوروبەریان تالآنكرد و زیانی زۆریان بە جوتیاران گەیاندووە[٨٤١].

ئەمەش هۆكارێك بووە بۆ كۆچی خەڵك بەرەو ناوچەكانی دەوروبەر، یانیش بەشێكی زۆر لەخەڵكی گوندەكان ڕوویان لەشارەكان كردووە، هەندێ جار شەڕو ئاژاوە ناوخۆیەكانیش لەم بارەیەوە شوێنەواری خراپیان لێكەوتۆتەوە، وەك ئەو ئاژاوەیەی لەنێوان كوردەكان و توركمانەكان ساڵی (٥٨١ك/١١٨٥ز) لە ناوچەكانی دەوروبەری دیاربكر ڕوویدا، كە بەهۆی ستەم وكوشتاری توركمانەكان زۆر لە گوندنشینەكان ناچاربوون بەرەو شارەكان ڕەو بكەن[٨٤٢]، هەموو ئەو كارەساتانەش سەرئەنجام بوونەتە هۆی جیاوازی دابەشبوونی دانیشتوان و گەورەبوونی هەندێ شار لەسەر حیسابی گوندەكان، ڕەنگە شاری ماردین نموونەیەكی ئەو شارانەبێت، كە بەهۆی هێرشەكانی مەغۆل و وێرانكردنی گوندەكانی دەوروبەری بە ناچاری جوتیاران بەرەو شارەكە ڕەویانكرد، بەو هۆیەشەوە ژمارەی دانیشتوانی زیادی كردووە[٨٤٣]، لەو جۆرە بارودۆخانەشدا دەكرێت كێشەی كۆمەڵایەتی و ئابووری جۆراوجۆر لەناو دانیشتواندا سەریهەڵدابێت.

لەلایەكی تریشەوە هەندێ شاری دی بەرەو وێرانی و پوكانەوە چوون، بۆ نموونە شارێكی وەك هەولێر لە چارەكی یەكەمی سەدەی (٧ك) شارێكی گەورەو دەوڵەمەند و

---

[٨٤٠] عماد الدين خليل، الإمارات الأرتقية، ص٤٣٧، ص٤٤١.

[٨٤١] ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص٣٣٧.

[٨٤٢] مؤلف المجهول،تاريخ الرهاوي،ج٢،ص٢٢٥.

[٨٤٣] عماد الدين خليل، الإمارات الأرتقية، ص ص٤٤١-٤٤٢.

ژمارەی دانیشتوانیشی زۆر بووە[٨٤٤]، بەڵام (ابو الفداء)(م.لە٧٣٤ك/١٣٣٣ز) لە سەرەتاکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی بەشارێکی تەواو وێرانە ناوی بردووە[٨٤٥]، وەشارێکی وەك حلوان هەر لەو ماوەیەدا بۆتە شارێکی وێرانەو تەواو پوکاوەتەوە[٨٤٦]، ئەگەر سەرنج لەسەر چاوەکەی (حمدالله المستوفی )(م.لە٧٥٠ك/١٣٤٩ز)ش بدەین لە باسی ژمارەیەك لە شار و گوندەکانی کوردستاندا بە کاول بوو وێرانە ناوی بردوون[٨٤٧]، بێگومان ئەمانەش هەموو شوێنەواری خراپی لەشکرکێشی هێزە داگیرکەرەکان دەسەلمێنن، کە کوژران و ئاوارەبوونی دانیشتوانی کوردستانی لێکەوتۆتەوە و تاستی گوزەران زۆر دابەزیوە، داهات و بەروبومیش زۆر کەمی کردووە، بە تایبەت لە سەدەی (٧ك/١٣ز)دا، هەروەك سەرچاوەیەکیش هۆکارەکەی بۆ کوشتار و کاولکاری مەغۆل و کۆچکردنی خەڵك بۆ ناوچەکانی دەرەوەی عێراق گێڕاوەتەوە[٨٤٨].

---

[٨٤٤] یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص١٣٨؛محسن محمد حسین،اربیل فی العهد الاتابکی،ص٢٢١.

[٨٤٥] تقویم البلدان، ص٤١٣؛ وە بڕوانە: علی عادل حسین، أربیل،ص٥٩.

[٨٤٦] القزویني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص٣٥٧.

[٨٤٧] بۆنموونە بڕوانە: نزهة القلوب، ص٦٣، ص٦٤، ص٦٦، ص٧١.

[٨٤٨] العمری، مسالك الأبصار،ج٣،ص٢٠٥.

## باسی دووەم/ شوێنەوارەکان لە سەر بازرگانی:

ئەگەر بازرگـانی بریتـی بێـت لـە کـرداری کـڕین و فرۆشـتنی کـاڵا و بەرووبوومـە جۆراوجۆرەکان و بەمـەستی پڕکردنەوەی پێویـستیەکان و بەدەسـتهێنانی ڕێژەیـەك لـە قازانج ئەنجام بدرێت[849]، ئەوا ئەو چـالاکییە پێویـستی بـە ڕەخـساندنی بارودۆخێـك هەیە، کە تیایدا بازاڕێك هـەبێت بـۆ سـاغکردنەوەی کاڵاکـان و سـەلامەتی کاروانـە بازرگانییەکان دەسـتەبەر کرابێـت و لەگـەڵ سیـستەمێکی نـەختی، کـە ئـاڵوگۆڕی بازرگانی ئاسان بکات، کە هەموو ئەمانەش لـە بـارودۆخێکی سیاسـی سـەقامگیردا دەستەبەر دەبن، مادام بازرگـانیش پەیوەندییـەکی بـەهێزی بـە بـارودۆخی سیاسـی و ئاسایشی وڵاتەوە هـەبێت، دەشـێ هـەر گۆڕانکارییـەك بەسـەر ئـەم لایەنـەدا بێـت، شوێنەوار و کاریگەریشی بەسەر چالاکی بازرگانیدا لێبکەوێتەوە.

## یەکەم/ کاریگەری ڕەوشی سیاسی وسەربازی لەسەر بازرگانی:

لە ڕاستیدا پێگەی جوگرافی کوردستان بایەخێکی گرنگی بازرگانی هەبووەو بە درێژایی مێژووش ئەو گرنگییەی پاراستووە، بە جۆرێك ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوای جیهـانی ئیسلامی بەیەکەوە بەستۆتەوەو دەروازەی تێپەڕبوونی زۆر لە ڕێگا بازرگانیەکان بـووە، ئەوە سەرباری دەوڵەمەندی بە بەرووبوومە کشتوکاڵیەکان و سەرچاوەکانی تری داهـات، کە زیاد لە پێویستی دانیشتوان بوون و لەڕێگای بازاڕە ناوخۆیی و دەرەکیەکانەوە سـاغ دەکرانەوە[850]، لەبەر ئەوە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بازرگانی بـە هـەردوو جۆرەکەیـەوە

---

[849] ابن خلدون، مقدمة، ص٤٢٨؛ الجرجاني، التعريفات،ص٥٥.

[850] بۆ زانیـاری لەسـەر بـازاڕی شـارە کوردیـەکان بڕوانـە: فرهـاد حـاجي عبـوش، المدينـة الكرديـة، ص ص١٧٣-١٩٢.

(ناوخۆیی و دەرەکی) پێشکەوتنی دیاری بەخۆیەوە بینیوە، لەو نێوەندەدا پێویستە ڕۆڵی میرنشینە کوردیەکان لەبەرچاو بگیرێت، کە بایەخی زۆریان بە پاراستنی ڕێگا بازرگانیەکان و دابینکردنی خزمەتگوزارییە پێویستەکان داوە، دەرکیشیان بە گرنگی ئەم پیشەیە کردووە وەك سەرچاوەیەکی داهاتیان و دەستەبەرکردنی پێویستیەکان بۆ دانیشتوان، بۆ نموونە میرەکانی (میرنشینی حسنویهی) گرنگی زۆری بە پاراستنی ڕێگاکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان داوەو پارەیەکی زۆریشی بۆ خانەو گەرماو و پێویستیەکانی تر خەرجکردووە[٨٥١]، لە سنووری قەڵەمڕەوی میرنشینی مەڕوانیشدا لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەکی بازرگانی بوژانەوەی دیاری بە خۆیەوە بینیوە[٨٥٢]، بەجۆرێك کە بازرگانێك تەنها لە ڕۆژێکدا پێنج سەد دیناری قازانج کردووە[٨٥٣]، لە سەرچاوەیەکی دیشدا هاتووە کە لە شاری میافارقین و لەژێر سێبەری فەرمانڕەوای میر نصرالدولەدا، بازرگانێك بیست هەزار دیناری قازانج کردووە![٨٥٤]، هەرچەندە زیادەڕۆیی لە گێڕانەوەی دووەمیاندا هەیە، بەڵام بەڵگەیە لەسەر گەشەکردنی ئەم لایەنەو بەرزی ئاستی گوزەرانی دانیشتوان[٨٥٥].

هەرچی ڕۆڵی میرنشینەکانی ڕەوادی و شەدادیشە، ئەوا سەرباری گرنگی پێگەی جوگرافی هەرێمەکان ئازربیجان و ئاران و دەوڵەمەندییان بە بەروبوومە کشتوکاڵی و گەرموگوڕی بازاڕەکان تیایاندا[٨٥٦]، میرەکانیش ڕۆڵی دیاریان لە پاراستنی سەلامەتی

---

[٨٥١] بروانە: الروذراوري، ذيل تجارب الأمم، ج٦، ص١٧٦؛ ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص ٢٧٢.

[٨٥٢] عبدالسلام الماردينى،تاريخ ماردين،ص٤٤؛ عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ج٢، ص٢٢١.

[٨٥٣] الفارقي،تاريخ الفارقي،ص١٦٧.

[٨٥٤] ابن حمدون،التذكرة الحمدونية،ج٢،ص٩٠.

[٨٥٥] الفارقي،تاريخ الفارقي،ص١٦٦.

[٨٥٦] ابن حوقل، صورة الأرض، ص ص٢٨٨-٢٨٩.

کاروانە بازرگانیەکاندا بینیوە[857]، هەندێ لە ئەتابکیەکانیش لەم بارەیەوە ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە، لەوانە ئەتابکیەی سنجار (٥٢١-٦١٧ك/١١٢٧-١٢٢٠ز) کە هەڵسا بەهاندانی بازرگانی و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی بازرگانەکان و ڕەفتارو هەڵسوکەوتی شیاو لەگەڵیاندا[858]، وە لەسەردەمی ئەتابکیەی هەولێر (٥٢٢-٦٣٠ك/١١٢٨-١٢٣٢ز)یشدا ژیانی ئابووری بەگشتی و کەرتی بازرگانی بەتایبەت لە هەولێر، کە دوکان و بازاری زۆری هەبووە، پێشکەوتنی دیاری بەخۆوە بینیووە[859]، ئەرتەقیەکانیش بایەخێکی زۆریان بەم لایەنە داوە[860].

هەموو ئەو نموونانەی کە بەکورتی ئاماژەیان پێکرا، گرنگی سیاسەتی ئابووری میرەکان و سەقامگیری باروودۆخی سیاسی دەردەخات، کە چالاکی بازرگانی و گەرموگوڕی بازاڕەکانی پێوەبەند بووە، بەڵام ئەم لایەنەش وەك هەر لایەنێکی دی بەهۆی پرۆسەی لەشکرکێشی هێزە دەرەکیەکان کاری تێکراوەو کاریگەری و شوێنەواریان بەسەریەوە بەجێهێشتووە، زۆرجار لەبری ئەوەی ڕێگاکان دەروازەی تێپەڕبوونی کاروانە بازرگانیەکان بووبن، بەپێچەوانەوە بوونەتە ڕێڕەوی تێپەڕبوونی لەشکری هێزە داگیرکەرەکان و تێکدانی باروودۆخی ئارامی ناوچەکەو لەچالاکی خستن و کزکردنی چالاکی بازرگانی، لەبەرئەوە بەهەر شێوەیەك لەشێوەکان ئەم لایەنەش کەوتۆتە ژێر کاریگەری لەشکرکێشی هێزە داگیرکەرەکانەوە.

ئەو باروودۆخە سیاسیەی کە هەر لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی هاتە ئاراوە، بەهۆی لەشکرکێشی

---

[857] کوثر اسماعیل، الحیاة الإقتصادیة والإجتماعیة، ص٦٣.

[858] ابن شداد، الاعلاق الخطیرة، ج٣، ق١، ص١٩٣.

[859] یاقوت الحموی،معجم البلدان،ج١،ص١٣٨؛ ابن عبدالحق البغدادی،مراصد الاطلاع،ج١،ص٥١؛ محسن محمد، اربیل ، ص٢٤٠.

[860] بۆ زانیاری لەمبارەیەوە بگەڕێوە: عمادالدین خلیل، الإمارات الأرتقیة، ص٤٤٦.

زەیاریەکان بۆ سەرناوچەکانی هەردوو هەرێمی فارس و چیاکان، کاریگەری خراپی کردە سەر چالاکی بازرگانی، بەتایبەت ئەوان بە پیادەکردنی سیاسەتی بەرەوا زانینی دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی خەڵك، زیانێکی زۆریان بە ژێرخانی ئابووری شارە کوردنشینە گەیاندووە[٨٦١]، وە لەگەڵ داگیرکردنی هەرشارێکدا دوکان و بازارەکانیان تالآن دەکرد و دانیشتوانیش لە ترسی ژیانیان وازیان لە کرداری کڕین و فرۆشتن هێناوە، بەپێی ئەوەی کە (ابن الجوزي) وتویەتی، هەرشوێنێك دەستیان بەسەردا دەگرت کاروبارەکان پەکیان کەوتووە[٨٦٢]، دەبێت بازرگانیش لە چالاکی کەوتبێت، ئەوەی کە زیاتریش بارودۆخی ئارامی ناوچەکەی شێواند لەشکرکێشی بوەیهیەکان بۆ سەر بەغدا بوو، دواتریش سەرهەڵدانی شەڕی نێوانیان لەگەڵ حەمدانیەکانی موسڵ، بەسەرنجدان لەو ڕووداوانەش واپێدەچێت کە بازرگانی ناوخۆ بەپلەی یەك زیانی زۆری پێکەوتبێت، بە پچڕانی پەیوەندی نێوان شارەکان و ئەو ئابلۆقە ئابوورییەش، کە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٦ز) ناصرالدولەی حەمدانی خستیە سەر ڕۆژئاوای شاری بەغدا، کە لەژێر دەستی معز الدوله وخەلیفە المطیع دابوو، وە ڕێگەی گرت لە بازرگانەکان بەناردنی کاڵاکانیان بەتایبەتیش بەروبوومی کشتوکاڵی وەك گەنم و جۆ بۆ بەغدا، کە بازارێکی گرنگی ساغکردنەوەی بەرهەمی زۆری شارەکانی جزیرەبوو، بەمەش جیاوازییەکی زۆر لەنرخی گەنم لەنێوان بەغداو موسڵ و دەوروبەری هاتە ئاراوە[٨٦٣]، ئەوەی کە زیانی زیاتری بە دانیشتوان و کەرتی بازرگانی گەیاند بڕیاری قەدەغەکردن و مامەڵەکردنی ناصرالدوله بەو دینارەی کە ناوی خەلیفە المطیع ی لەسەر بوو،

---

[٨٦١] المسعودي، مروج الذهب،ج٤،ص٣٤٠؛ ابن الأثير،الكامل،ج٦،ص٧٥٨؛ العمري،مسالك الابصار،ج٢٦،ص١١٣.

[٨٦٢] المنتظم،ج٦،ص٢٤١؛ وەبڕوانە: نیشتمان بشیر، الأحوال الإجتماعية،ص٤٣.

[٨٦٣] مسكويه،تجارب الأمم،ج٥،ص٢٧٩؛ ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص١٦١.

گێڕانەوەی دیناری کۆنی سەردەمی خەلیفە المتقی (م.لە٣٣٣ك/٩٤٥ز) بوو[٨٦٤]، درێژەکێشانی شەڕی نێوانیان و دواتر هێرشی عضدالدولة بۆ سەر شارەکانی جزیرەو دانانی ئابلۆقە لە سەریان و سەرئەنجام دەست بەسەرداگرتنیان[٨٦٥]، ناکرێت شوێنەواری خراپی لەسەر چالاکی بازرگانی لێنەکەوتبێتەوە، ئەوە سەرباری پەلاماردان و دەستگرتنی بەسەر شارەکانی هەرێمی چیاکاندا.

کەرتی بازرگانی وەك سەرجەم لایەنەکانی دی بەهۆی شالاوی غوزەکانەوە زۆرترین زیانی پێگەیشت، ئەویش بەگرتنەبەری شێوازی داپڵۆسین و تالانکردنی خەڵك زیانی زۆریان بە ئابووری ناوچە کوردنشینەکان گەیاند، بەتایبەت بەداگیرکردن و قۆرخکردنی ڕێگاکان بۆ کۆچ و ڕەوی خۆیان بڵاوبوونەوەیان بەهەرێمەکاندا، لەبری تێپەڕبوونی کاروانە بازرگانیەکان، ئەوە سەرباری دروستکردنی ڕەوشێکی نائارام و هەڵسان بەکاری دزی و ڕێگری[٨٦٦]، هەڵمەتەکانی سەلجوقیەکانیش بۆ سەر شارەکانی همدان و حلوان و خانقین شوێنەواری خراپیان لەسەر بازرگانی لێکەوتەوە، چونکە هەر ئەو ڕێگا بازرگانییەی نێوان بەغداو خۆراسان بوو کە بەکاریان هێنا بەمەبەستی تێپەڕاندنی لەشکری بە ژمارە زۆرو داگیرکردنی شارەکان کە ترسناکترین دیمەنی کاولکارییان ئەنجامدا[٨٦٧].

ئەو بارودۆخە سیاسیەش کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچی/سێزدەهەمی زاینی ناوچەکەی پێدا تێپەڕی کاریگەری خراپی کردە سەر پێشکەوتنی ئابووری و لە

---

[٨٦٤] مسكويه،تجارب الأمم،ج٥،ص٢٧٩؛ الهمذاني،تكملة تاريخ الطبري،ص٣٥٧؛ابن الجوزي،المنتظم، ج٦،ص٣٤٥.

[٨٦٥] مسكويه، تجارب الأمم،ج٥، ص ص٤٤٠-٤٤١؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١١، ص ص١٠٦-١٠٧.

[٨٦٦] ابن العبرى، تاريخ الزمان، ص٨٩،ص٩٣؛ ابن خلدون، العبر،ج٤،ص ص٣١١-٣١٢.

[٨٦٧] ابن الأثير،الكامل،ج٨،ص٥٣، ص٥٧؛ قحطان الحديثي،طريق خوراسان،ص١٤.

جوڵەخستنی چالاکی بازرگانی، بەهۆی هەڵمەتە سەربازییەکانی خوارزمیەکان بۆ سەر کوردستان و پەکخستنی ڕێگاکانی بازرگانی و تالآنکردن و کوشتنی بازرگانان[٨٦٨]، زۆرجاریش بەهۆی گرتنی ڕێگاکان پەکی بازرگانیان دەخست و کارەساتی مرۆیشی بەدوای خۆیدا دەهێنا[٨٦٩]، بەتایبەت کوشتنی بازرگانەکانی مەغۆل و دەستبەسەرداگرتنی کەلوپەلە گرانبەهاکانیان، کە هۆکاری ڕاستەوخۆی هێرشی جنگیزخانیش بوو بۆ سەر دەوڵەتی خوارزمی[٨٧٠]، کاریگەری خراپیشی کردە سەر بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، هێرشەکانی مەغۆلیش خراپترین شوێنەواریان لەسەر ئەم لایەنە بەجێهێشتووە، ئەوان تەنها ترس و تۆقاندنیان لەسەر ڕێگای کاروانە بازرگانییەکان بلاو نەدەکردەوە، بەڵکو بوونە مایەی هەڕەشە لە ژیانی بازرگانانیش، بۆ نموونە ساڵی(٦٣٣ك/١٢٣٥ز) لە سنجار پەلاماری کاروانێکی بازرگانی گەورەیان داو دەستیان بەسەرکالاکانیاندا گرتوو بازرگانەکانیشیان کوشت کە ژمارەیان (٤٧٠) بازرگان بوو[٨٧١]، کە ئەمەش ژمارەیەکی زۆرە کە لەو سەردەمەدا بازرگانیان بەیەکەوە کردووە، بەم شێوەیە پەیوەندی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی بەتایبەت لە ڕێگای خۆراسانەوە پچڕا و بەشێك لەو گوندو شارۆچکانەی سەر ڕێگاکە کە وەك وێستگەی بازرگانی وابوون وێرانبوون[٨٧٢]، پەرەسەندنی مەترسیش وایکرد کە بازرگانان نەتوانن بەو ڕێگایەدا هاتووچۆ بکەن، جگە لە چەند بازرگانێك کە لەگەڵ

---

[٨٦٨] ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢،ص ١٩٦؛ آكو برهان محمد، التجارة والنظم المالية، ص١١٠.

[٨٦٩] بۆ نموونە بڕوانە: ابوشامه،تراجم رجال القرنين،ص١٧٨؛ حمدالله مستوفي،تاريخ گزيده،ص ص٥٨١-٥٨٢.

[٨٧٠] ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٣٣٦؛ النسوي، سيرة جلال الدين منكبرتي، ص٨٧؛ الدياربكري، تاريخ الخميس،مج٢، ص٣٦٨؛ عصام الدين عبدالرؤوف،بلادالجزيرة،ص١٩٧.

[٨٧١] ابن العبري، تاريخ الزمان، ص٢٨٢.

[٨٧٢] لسترنج،بلدان الخلافة الشرقية،ص٨٤؛ قحطان الحديثي،طريق خوراسان،ص ص١٤-١٥.

مەغۆل تێکەڵبوون و سەر بەئەوان بوون، کە دواتر مەغۆل سودیان لە کاری بازرگانی ئەوانیش بۆ مەبەستی هەواڵگری و سوسەکاری و گواستنەوەی هەواڵ و زانیاری لەسەر توانستە سەربازییەکانی دەوڵەتی عەبباسی وەرگرت، لەبەرامبەریشدا لەکاتی هێرشی مەغۆل تەنها ماڵ و سامانی ئەو ڕێژە کەمە لە بازرگانان لە تاڵانکاریەکانیان پارێزراو بوو[٨٧٣]، پیادەکردنی سیاسەتی دانانی ئابلۆقەی ئابووری لەسەر شارەکان، کە بەتایبەت ئەم دوو هێزەی دوایی پەیڕەویان کرد، نەك هەر چالاکی بازرگانی پەکخستووە، بەڵکو کارەساتی مرۆیی گەورەشیان خولقاندووە[٨٧٤]، کە بونەتە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی و کاڵا جۆربەجۆرەکانی دی و بەرزبوونەوەی نرخیان، لەبەرامبەریشدا هێزی شت پێکرینی دراو کەم بۆتەوە و هەڵاوسانی ئابووری (هەڵاوسانی نرخی دراو بەمانای ئێستا) لێکەوتۆتەوە[٨٧٥]، وەك ئەوەی کە بەهۆی درێژەکێشانی ئابلۆقەدانی سەر شاری خلاط ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٨ز) لەلایەن خوارزمیەکانەوە هاتە ئاراوە، ئەوەبوو نرخی کاڵاکان زیادیکرد و درهەم و دینار زەبوون بوون[٨٧٦]، وە هێزی شت پێکرینیان زۆر دابەزی، ئەمەش کارەساتەکەی زیاترکرد.

### دووەم/ کاریگەری سیاسەتی ئابووری هێزەکان:

لەڕاستیدا بەتەنها لەشکرکێشییەکان شوێنیان لەسەر بازرگانی دانەنا، بەڵکو ئەو سیاسەتە ئابوورییەش کە هێزە داگیرکەرەکان دوای جێگیرکردنی دەسەڵاتیان پیادەیان کرد، کاریگەری نەرێنی و هەندێ جاریش ئەرێن لەسەری گەرموگوڕی

---

[٨٧٣] ابن كثير، البداية والنهاية،ج١٢،ص٢٧٤؛ وليد مصطفى نجم، الأوضاع الاقتصادية، ص٨٤.

[٨٧٤] بۆ نموونە بڕوانە: النسوي،سيرة جلال الدين منكبرتي، ص٣٢٥؛ الهمذاني،جامع التواريخ، ج٢،ق١،ص٢٩٨؛ ابن خلدون، العبر، ج٥، ص١٦٥.

[٨٧٥] سوادي عبد محمد،الاحوال الاجتماعية والاقتصادية،ص٣٣٥.

[٨٧٦] النسوي،سيرة جلال الدين منكبريتي،ص٣٢٠؛ ابوشامه، نزهة المقلتين في سيرة الدولتين,ص٨٠.

بازرگانی و گۆڕینی ئاڕاستەی کاروانەکان و نرخ و داواکاری و خواستی خەڵك هەبووە، بەتایبەتیش ئەو باج و مەکۆسانەی کە دەخرانە سەر بازاڕەکان و کاڵا جۆراوجۆرەکان[٨٧٧]، کە ئەویش بە گوێرەی سیاسەتی میر و سوڵتانەکان و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕاوە، لەم بارەیەوە میەکانی بوەیهی زیادەڕۆیی زۆریان کردو زۆرجار باجەکانیان سنووری ئاییني تێپەڕاندووە، سەرچاوەیەك ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە باجەکان زیادەڕۆییان تێدا کراوەو لەسەر شانی دانیشتوان گران بوون[٨٧٨]، لەوانە عضدالدولة سەرباری پەسنی زۆری مێژوونووسان بۆ هەندێ لە خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکانی، بەڵام بڕیاری زیادکردنی باجەکانی سەر کاڵا ناوخۆیی و دەرەکیەکانی لە عێراقدا، ئەم کارەشی بەیەکێك لە کارە خراپەکانی دانراوە[٨٧٩].

لە سەردەمی سەلجوقیەکانیشدا بەگوێرەی ئەوەی کە ملکشاه ساڵی (٤٧٩ك/١٠٨٦ز) بڕیاری لابردنی ئەو باجەنەی سەر کەلوپەل و بازاڕەکانی دا لە عێراق و خراسان دا[٨٨٠]، کە پێشتر بە شێوەیەکی زۆردارانە لەسەر بازرگانی ناوخۆو دەرەکی دانرابوون و سەرچاوەیەکی سەرەکی داهاتی دەوڵەتیان پێکدەهێنا، دوای ئەم سوڵتانەش باجەکانی مەکۆس لەسەر بازاڕەکان دانرانەوە، تا سەردەمی سوڵتان محمد کە ساڵی (٥٠١ك/١١٠٧ز) بڕیاری لابردنی دا[٨٨١]، هەر بەردەوامی هەبوو، دەردەکەوێ کە چەندێتی ڕێژەی باجەکان بە پێی سیاسەتی سوڵتانەکان گۆڕانی

---

[٨٧٧] وامان بەباش زانی کە باجی سەر بازرگانی جیاکەینەوە لە هی کشتوکاڵ، بۆیە لێرەدا باسکراوە.

[٨٧٨] المقدسي، احسن التقاسيم، ص١٢١.

[٨٧٩] الروذراوري، ذيل تجارب الأمم، ج٦، ص٢٨؛ ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص٣٩١؛ حسين منيمنة، تاريخ الدولة البويهية، ص٣٩٣.

[٨٨٠] ابن القلانسي، ذيل تاريخ الدمشق، ص١١٨؛ حسين علي المسرى، تجارة العراق في العصر العباسي، نشر جامعة الكويت، (الكويت:١٩٨٢م)،ص١٤٨.

[٨٨١] ابن القلانسي، ذيل تاريخ الدمشق، ص١٦٢؛ النويري، نهاية الارب،ج٢٦،ص٢١٢.

بەسەردا هاتووە، باجەکانی سەردەمی مەغۆلیش بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی پێش خۆیان بەرێژە زیاتر و هەمەجۆرتریش بوون، ئەوان(تمغا)[882]یان لە بازرگانی ناوخۆی شارەکانیش وەردەگرت[883].

هەموو ئەمانەش بۆ سەر گەرموگوڕی بازاڕەکان و ناچوونیەکی لە خواست و خستنە ڕوودا ڕۆڵیان هەبووە، چونکە وەك گۆڕانێکی ڕاستەوانە لەگەڵ زیادکردنی باج نرخی کاڵاکان بەرزبۆتەوەو بە پێچەوانەشەوە هێزی شت پێ کڕینی دراو و خواستی خەڵك کەم بۆتەوە، ئەمەش کاریگەری کردۆتە سەر لەدەستدانی متمانەی بازرگانەکان بە بازاڕو داخستنی کۆگاکانیان و زۆرجاریش سەری کێشاوە بۆ گرانی[884]، ئەو سیاسەتە نەشیاوەی هێزەکان شوێنەواری خراپی لەسەر چالاکی بازرگانی لێکەوتەوە، چونکە ئەوان بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی و توانای شتکڕینی خەڵك یارییان بە زیادو کەمکردنی باجەکان کردووە، ئەوەی گرنگیشە لە بازرگانیدا تێبینی بکرێت، هاوسەنگڕاگرتنی نێوان خواست و نرخە[885]، کە ئەمەش تارادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری سیاسەتی دەوڵەتدایە، ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنجە وەك شوێنەوارێکی خراپی لەشکرکێشییەکان، ئەوەیە کە کورد لە داهاتی ئەو باجە زۆرو زەبەندانەی لە بازرگانی دەستکەوتوون بێبەش بووە، بەتایبەت دوای ڕووخانی میرنشینەکان، بەڵکو چۆتە خەزێنەی هێزە زاڵبووەکانی ناوچەکە و لە بەرژەوەندی ئەواندا خەرجکراوە.

---

[882] تمغا (Tamgha): زاراوەیەکی مەغۆلییە بەمانای باجی سەر کاڵا بازرگانیەکان دێت، آن لمبتن تاریخ میانه ایران، ص٣٩٩.

[883] جعفر حسین خصباك، العراق في عهد المغول الإلخانيين، ص١١٣؛ علی عادل حسین، أربل،ص ص٢٥٢-٢٥٣.

[884] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص ص٢٨٨-٢٨٩؛ فهمي سعد، العامة في بغداد، ص٢٧٨.

[885] آكو برهان محمد، التجارة والنظم المالية، ص ص١٦٨-١٦٩.

## سێیەم/ پەرەسەندنی چالاکی ڕێگری:

ئەو بارودۆخەی لەژێر سایەی هێزە داگیرکەرەکان و ئاژاوەو شەڕە ناوخۆییەکانیش هاتە ئاراوە، بەجۆرێکی دی شوێنکاری خراپیان بەسەر ئەم لایەنە بەجێهێشتووە، کە بەهۆی ئەوانەوە بارودۆخێکی نائارام هاتە ئاراوە و تیایدا چالاکی گروپە ڕێگرو ئاژاوەگێڕەگان هەڵکوتانە سەر بازاڕو کاروانەکان و بەتاڵانبردنی سامانی بازرگانان، کەوەك کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری دژی بارودۆخی داسەپاوی ژێرسایەی هێزە داگیرکەرەکان لەناو کۆمەڵگەدا سەریانهەڵداوە[886]، کوردستان لە چالاکیەکانی ئەو جۆرە گروپانە پارێزراو نەبوو، وەك تاڵانکاریەکانی گروپی (عیاریەکان)[887]، کە لەگەڵ خراپبوونی هەر بارودۆخێکدا چالاکی ئەمانەو مەترسییان لەسەر ژیان و سامانی خەڵك زیاتر دەبوو، زیادبوونی ئەو مەترسیانەش بەهۆی ئەوەوەبوو کە ئەو گروپە تەنها ڕەگەزو مەزهەبێکی دیاریکراو نەچوونە پاڵی، بەڵکو لەڕەگەزی جیاوازی وەك عەرەب و کورد و خەڵکی شارەکان لە سوننەو شیعەی تێدابوو[888]، جگەلەوەش ببوو بە پەناگەی هەموو ئەو کەسانەی کەکاریان بریتی بوو لە دزی و ڕێگری و ئاژاوەگێڕی، کە چالاکیەکانیان بەیەکەوە بەسترابۆوەو وەك تۆڕێکی کارا بەناوچە

---

[886] مەبەستی ئەو گروپانە زیاتر بەتاڵانبردن ودەستخستنی سامان بووە، بۆیە پێمان وابووە زیاتر لێرەدا شایەنە باسیان بکرێت.

[887] العیارون (زۆرگەرۆکەکان): کۆمەڵەیەکی ئاژاوەگێڕی چالاك بوون و بەناوی جیاجیای وەك (شطار و ذعار ولصوص)یش ناسرابوون، سەرەتای دەرکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی (دووەم)ی کۆچی، وەسەرچاوەی ترس و دڵەڕاوکێ بوون بۆ سەر دانیشتوان،مەڵبەندی زۆرترین چالاکیەکانیشیان بەغدابوو، بۆ نموونە بڕوانە: ابن الجوزی،المنتظم،ج٧،ص ص٧٤-٧٥؛ ابوالهجاء،تاریخ ابن ابوالهجاء،ص١٧٣، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: بدري محمد فهد،العامة ببغداد في القرن الخامس الهجري،ص٢٦٨.

[888] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الجوزي،المنتظم،ج٧،ص٢٢٠،ج٨،ص٧٨،ص٨٨.

جیاجیاکاندا بڵاوبوونەوەو سنووری چالاکیەکانیان فراوانبوو، ژیانی ئەو گروپە لەسەر دزی و تاڵانکاری وەستابوو، بۆیە بەردەوام پەلاماری دوکان و بازاڕو سەروەت و سامانی خەڵکیان دەدا، بۆ کۆکردنەوەی زانیاریش لە میانەی چالاکیەکانیاندا سوسەکاریان بەکاردەهێناو زۆرجاریش بۆ ئەو بوارە پشتیان بەئافرەت دەبەست[889]، دوای وەرگرتنی زانیاری پەلاماری شوێنی ئامانجەکەیان دەداو تاڵانیان دەکرد یان دەیانسوتاند و سڵیشیان لە کوشتنی خەڵك نەدەکردەوە، بۆ نموونە ساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز) دوای بیستنی هەواڵی مردنی سوڵتان طغرل بك ئاژاوەیەکی گەورەیان لە شاری همدان نایەوە و خەڵکێکی زۆر و حاکمی سەربازی(شحنە)ی شارەکەشیان کوشت[890]، (ابن الأثیر)یش لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی ئەو ساڵەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە چالاکی و ئاژاوەگێڕیەکانی ئەم گروپە زۆر زیادی کردووەو دانیشتوان خۆیان بەرگرییان کردووەو ڕووبەڕوویان بوونەتەوە[891]، ئەمەش ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە عەیاریەکان و گروپە ئاژاوەگێڕیەکانی دی دیارنەمانی سوڵتان و لاوازیی دەسەڵاتی بەرپرسی شاریان لە پاراستنی ژیان و سامانی خەڵك بەدەرفەت وەرگرتووەو چالاکیەکانیان زیادکردووە، لەم بارودۆخەشدا دانیشتوان ناچاربوون خۆیان ببنە پارێزەری ژیان و سامانیان، کەواتە دەبێت کوردستان زیانی زۆری بەرکەوتبێت، بەتایبەت دوای ڕووخانی میرنشینەکان و پەراوێزخستنی پاراستنی ناوچە کوردیەکان لەلایەن سەلجوقیەکانەوە شەڕو ململانێی ناوخۆ سەریهەڵداوە، ئەمەش کاریگەری و شوێنەواری خراپی کردۆتە سەر ئاسایشی مرۆڤی کوردو ژێرخانی ئابووری کوردستان، بەتایبەت ناوچەکانی هەرێمی چیاکان و

---

[889] ابن الجوزي،المنتظم،ج١٠،ص٦٩؛بدري محمد فهد،العامة ببغداد،ص٣٠٢.

[890] ابن الجوزي،المنتظم،ج٨،ص٢٣١؛نيشتمان بشير،الأحوال الإجتماعية،ص١٠٨.

[891] الكامل،ج٨،ص١٨٤.

ڕۆژئاوای هەرێمەکە، پێگە جوگرافیەکەشی دەرفەتی ئەوەی پێداوە کە ببێتە پەناگە بۆ کۆبوونەوەو چالاکیەکانی ئەو جۆرە گروپانە.

هەندێ جاریش دەستەو مالّباتە خێڵەکیەکان ڕۆڵی خراپیان بینیوە، بۆ نموونە کوردە شازنجانەکان ساڵی (٣٢٩ك/٩٤٠ز) هەڵیان کوتایە سەر کاروانێکی بازرگانی سەر ڕێگای خۆراسان و دەستیان بەسەر کەلوپەلەکانیدا گرت کە نرخەکەیان سێ هەزار دینار بوو[٨٩٢]، پەرەسەندنی مەترسی ئەم جۆرە گروپانە لەسەر بازرگانی و شوێنەوارە خراپەکانیان وایخواست کە ویلایەتی تایبەت بە پاراستنی ڕێگاکان دابمەزرێت، وەك ویلایەتی پاراستنی ڕێگای خۆراسان و ئەهواز و جزیرەو کوفە[٨٩٣]، لە ڕاستیدا شەڕو شۆڕی زۆریش دۆخەکەی تێکدابوو تەنها بە هاوکاری خەڵکی ناوچەکە دەتوانرا ڕێگا بازرگانیەکان بپارێزرێن، هەربۆیە ئەرکی پاراستنی ڕێگای خۆراسان لەلایەن بوەیهیەکانەوە بە (ابو الشوك) کوردی سپێردرا[٨٩٤].

هەرچەندە هەندێ لە میرەکانی بوەیهی هەوڵی پاراستنی ڕێگاکانیاندا، بە توندوتیژی نواندن بەرامبەر گروپە ڕێگرەکان، لەوانەش عضد الدولە کە تارادەیەك لە چالاکی ئەو جۆرە گروپانەی کەمکردەوە[٨٩٥]، بەڵام وادیارە سەرقاڵبوونی میرەکانی بوەیهی بە شەڕە ناوخۆییەکانیان هەلی بۆ زیادبوونی جموجۆڵیان جارێکی دی ڕەخساندووە، لەبەرئەوە ساڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز) ئەم جارە ئەرکی پاراستنی ڕێگای خۆراسانیان بە (ابو الفتح محمد عناز) سپارد[٨٩٦]، وا پێدەچێت لەسەردەمی

---

[٨٩٢] الصولي، أخبار الراضي، ص١٩٢؛ تقي الدين عارف الدوري، عصر أميرة الأمراء، ص٣٢٧.

[٨٩٣] تقي الدين عارف، عصر امرة الأمراء، ص٣٨١.

[٨٩٤] مسكويه، تجارب الأمم،ج٥، ص٣١٢.

[٨٩٥] حسين علي المسرى، تجارة العراق في العصر العباسي، ص١١٩؛ محمد حسين الزبيدي، العراق في العصر البويهي، ص١٨٥.

[٨٩٦] ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٦١٧.س

سەلجوقیەکانیشدا چالاکی ڕێگرەکان لە ناوچەکەدا سەری هەڵدابێتەوە، بەتایبەت کوردەکانی ناوچەی حلوان لەم بارەیەوە ڕۆڵێکی خراپیان گێڕا، بۆ سنووردانان لە بەردەم خراپەکارەکانیشیان ئەوەبوو سوڵتان الب ارسلان ساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٣ز) هێزێکی نارده سەریان و ئەرکی پاراستنی ڕێگاکەشی بەیەکێك لە سەرکردە سەربازیەکانی سپارد[٨٩٧]، ئەمەش لەگەڵ بەشێك لە کردارەکانیدا دێتەوە، چونکە ئەو سوڵتانە زۆر بایەخی بە بازرگانی و پاراستنی سامانی بازرگانان دەدا[٨٩٨].

هەرێمی جزیرەش پارێزراو نەبوو لە چالاکی دزو ڕێگرەکان، بۆ نموونە ساڵی (٤٥٨ك/١٠٦٦ز) سێسەد دزی ئەرمەنی بە سەرکردایەتی (خزریج) هەڵیان کوتایە سەر کاروانە بازرگانیەکان و چەندین کاری تالآنکاری و جەردەییان ئەنجامدا[٨٩٩]، شەڕە ناوخۆییەکانی سەلجوقیش کاریگەری خراپیان کردە سەر پچڕانی پەیوەندی بازرگانی نێوان هەرێمەکان و نا ئارامی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا، لەو جۆرە بارودۆخەشدا قۆرخکردنی بازاڕو دزی و ڕێگری و هەڵکوتانە سەر دوکان و بازاڕەکان زیادی کردووە، بەتایبەت لەو کاتەنەدا کە لەبەر لاوازی دەسەڵاتی سیاسی نەتوانرابێت پارێزگاری لە کاروانە بازرگانیەکان بکرێت، تا ئەو ڕادەیە مەترسی ڕێگرەکان زیادی کردووە، کە بازرگانەکان نەیانتوانیوە ماوەی نێوان دوو شاری زۆر نزیك بەبێ ئێشکگرو پاسەوانیکردنی کاروانەکانیان ببڕن[٩٠٠]، بۆ نموونە وەك ئەو تالآنکاری و ڕاوو ڕووتیەی تورکمانەکانی جزیرە پێی هەڵسان[٩٠١]، کە بە هۆیەوە زیانی زۆری بۆ سەر ئەم کەرتە لێکەتەوە، هەرچی تایبەتە بە دەستبردنی کوردیش بۆ ئەم کارە هەر وەك توێژەرێك

---

[٨٩٧] الحسيني، زبدة التواريخ، ص٨٧.

[٨٩٨] بروانە: بدرالدين العيني، السيف المهند، ص١٧٣.

[٨٩٩] ابن العبري، تاريخ الزمان، ص١٠٧.

[٩٠٠] عمادالدين خليل، الإمارات الأرتقية، ص٤٥٠.

[٩٠١] الرهاوي مجهول، تاريخ الرهاوي، ج٢،ص٢٢٥.

ئاماژەی کردووە، دەشێ بۆ ویست و گیانی خێڵکی و سەپاندنی هەژموونی خۆیان بەسەر ناوچەکاندا و ملکەچ نەبوون بۆ دەسەڵاتی هێزەکان (ناوەند) لێکبدرێتەوە، یانیش پاڵنەرێکی ئابووری لە پشتیانەوە بووە وەك هەر ڕەگەزێکی دی، بەمەبەستی دەستخستنی داهات ئاسانتر لەوەی لەرێگەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەستیان کەوتووە[902].

سوتاندنی دوکان و بازاڕەکان بەهۆی هێرش و پەلاماری هێزەکان و لە ئەنجامی ئاژاوە ناوخۆییەکاندا، شوێنەوارێکی دی خراپی لەشکرکێشیەکانە، کە کاری لە کەرتی بازرگانی ناوخۆیی کردو و زیانی ماڵی زۆریشی بە دانیشتوان گەیاندووە، وەك سوتاندنی بازاڕی شاری خلاط ساڵی (559ك/1163ز) کە بەهۆیەوە خانووبەرەی زۆری هاولاتیانیش سوتاوە[903]، وە سوتاندنی شاری داقوقا لە ساڵی (622ك/1225ز) لەلایەن جلال الدین منکبرتی و کاولکردنی شارەکە[904]، ئەمانەو چەندان ڕووداوی تری هاوشێوە نموونەی دیارن لەم بوارەدا.

بەشێویەکی گشتی هەموو ئەوانەی ئاماژەیان پێدرا کاریگەری خراپیان کردە سەر سستبوونی بازاڕەکان کەمبوونەوەی کرداری کڕین و فرۆشتن و بەرزبوونەوەی نرخی کالاکان، ناهاوسەنگی ڕەگەزی و کەمبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوانیش شوێنەواری خراپی بۆ سەر ئەم لایەنە لێکەوتۆتەوە[905]، لەلایەکی دی وێرانبوونی ژێرخانی ئابووری و بەتایبەتیش کەمبوونەوەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان وەك دیارترین جۆری هەناردەی کوردستان و بەشداری پێکردنیان لە بواری بازرگانیدا، کاریگەری خراپی کردە سەر

---

[902] حیدر لشکری، الکرد في المعرفة التاریخیة الاسلامیة، ص123.

[903] الفارقي،تاریخ آمد ومیافارقین، الموسوعة الشامیة، ج11،ص284.

[904] ابو شامه، تراجم رجال القرنین السادس والسابع، ص144؛ ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج12، ص196.

[905] اکتمال اسماعیل، الحملات المغولیة وآثارها، ص347.

ئەم کەرتە و نائومێدی و بێ متمانەیی لای بازرگانەکان بەرامبەر بە پیشەکەیان دروستکرد، سەرباری کوشتن و لەناوبردنی زۆرێکیان لەلایەن داگیرکەرانەوە، وەك کوشتنی نزیکەی شەش سەد بازرگان لەشاری ماردین لەلایەن مەغۆلەکانەوە[٩٠٦]، بەشێکیان ناچاربوون لەگەڵ خەڵکی گشتیدا کۆچ بکەن و لە میسر و شام نیشتەجێ بن و بڕیاری نەگەڕانەوەیان دا بۆ زێدی خۆیان[٩٠٧].

گومانیشی تێدانیە کە تێکچوونی بارودۆخی بازرگانی لەلایەنی ئاواکاری و زانستیدا ڕۆڵی نەرێنی بینیوە، چونکە زۆرێك لە بازرگانەکانی کوردستان بە سامانی تایبەتی خۆیان بە دروستکردنی چەندین مزگەوت و تەکیەو فێرگەو کارە خێرخوازیەکانی دیدا، وەك هەڵکەندنی بیرو کارێزو ڕاکێشانی جۆگەی ئاودێری پشکداریان لەپرۆسەی ئاواکاریدا کردووەو ئامادەی بەرچاویشیان هەبووە، بۆ نموونە بازرگانێکی ناوداری وەك (ابوبکر محمد بن جبری) کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە پرۆژەیەکی ئاوی لە شاری میافارقین دروستکردووە[٩٠٨]، (عمر بن أحمد عکرمە البزری)(م.لە ٥٦٠ك/١١٦٤ز)ش لە جزیرەی ئیبن عومەر قوتابخانەیەکی بە ناوی خۆیەوە دروستکرد[٩٠٩]، ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لە بازرگان و دوکانداران وەك مامۆستا ڕۆڵیان لە پێگەیاندن و وتنەوەی وانەی ئایینی بەقوتابیان بینیوە و یارمەتی زۆری ماڵییان پێشکەش بە خوازیارانی زانست و ڕۆشنبیری کردووە[٩١٠]، کەچی ئەو ڕەوشەی هاتەئاراوە وایکرد کە ئیتر کوردان بێبەش بن لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانیان.

---

[٩٠٦] ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج١٣، ص١٣٩؛ اکتمال اسماعیل، الحملات المغولیة وآثارها، ص٣٥١.

[٩٠٧] قادر محمد حسن، اسهامات الکرد، ص٥٤.

[٩٠٨] ابن شداد، الاعلاق الخطیرة، ج٣،ق١،ص٣٦٢؛ ابن حمدون، التذکرة الحمدونیة، ج٢، ص٩١.

[٩٠٩] ابن شداد، الاعلاق الخطیرة، ج٣،ق١،ص٢١٤؛ آکو برهانس محمد،الحیاة العلمیة،ص٨٤.

[٩١٠] بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بگەڕێوە: **ئاکو برهان، التجارە النقم المالیه، ص ص٢١٧-٢٢٢.**

## چوارەم/ بوژانەوەی بازرگانی (کاریگەری ئەرێنی):

لە ڕاستیدا ئەوەی باسی لێکرا هەمووی بەو مانایە نییە کە بەدرێژایی ئەو مێژووە بازرگانی تەنها بەرەو پوکانەوە چووبێت، بەڵکو لەسەردەمی هەندێ لە هێزەکان و بەتایبەت لەکاتی جێگیری بارودۆخی سیاسیدا کاریگەری کردە سەر سەرلەنوێ بوژانەوە و گەشەسەندنی بازرگانی، خواست لەسەر هەندێ کاڵاو کەلوپەلی گرانبەهای بیانی زیادیکردووە و گۆڕینی ئاڕاستەی کاروانە بازرگانیەکانیش گۆرانی بەسەردا هاتووە، ڕەنگە شوێنەوارێکی دی گرنگ لەمبارەیەوە نەمانی بەربەست و سنوورەکان بووبێت، ئەویش بەهۆی سیستەمی یەك دەوڵەتی و کرانەوەی دەرگای تێکەڵاوبوونی زیاتری کەلتوری و فەرهەنگی، کە کاریگەری هەبوو لەسەر بووژانەوەی ژیانی خەڵك و دەرکەوتنی چەندین کەسایەتی و بنەماڵەی بازرگان، کە زۆریان مەودایەکی دووریان بەمەبەستی بازرگانی بڕی و ڕۆڵی دیاریان لە بازرگانی ناوخۆو دەرەکیدا لە کوردستاندا گێڕا[(٩١١)]، ئەمەش بێگومان بۆتە هۆی قەرەباڵغبوونی ڕێگاکان و دەسەڵاتدارانیشی هانداوە کە هەوڵی فەراهەمکردنی زیاتری ئاسایشی ڕێگاوبان و دابینکردنی پێویستیەکان بدەن بۆیان و دەستکەوتی زیاتریش بەهۆی باجی سەر کاروانەکان دەستبخەن.

بەروبوومی کەم بەها کە پێشتر پشکی زۆری لە ئاڵوێری بازرگانیدا هەبوو، دایە کزی و شتی جوانکاری و ناسك و گرانبەها جێی گرتەوە، لەو بوارەشدا زیادبوونی خواست لەسەر کەرەستەکانی وەك حەریر و قوماشی گرانبەهاو بخور و بەهارات و گوڵاو و کافورو بەردە بەنرخەکان و کەلوپەلی جوانکاری ناوماڵ و چەندین کاڵای ناوازەی دی، کە سەرچاوەی سەرەکی هاوردەکردنیان بازاڕەکانی چین و هیند و ناوچەکانی دی

---

(٩١١) آکو برهان محمد، التجارة والنظم المالية، ص١٧٠.

ڕۆژهەڵات بوو، بەتایبەت هیند کەبە بابەتە جوانکاریەکان ناوبانگی دەرکردبوو[٩١٢]، کە لە ڕێگای حەریر (طریق حریر العظیم)[٩١٣] و خۆراسانەوە بۆ کوردستان گوازراونەتەوە[٩١٤]، هەر لەئەنجامی ئەو پەیوەندییە ئابورییەدا، کە دوای لەشکرکێشییەکان دەرفەتی دروستبوونی زیاتری بۆ ڕەخسا، هاوردەکردنی هەندێك لەو بەروبومە ڕووەکیانەی کە لە کوردستان کەم بوون، وەك (برنج و گوێزی هندی و کونجی...) لە ڕۆژهەڵاتەوە زیادیانکرد[٩١٥]، دەکرێت پەروەردەکردن و چاندنی هەندێك لەو ڕووەکانەش لە کوردستاندا بەتایبەتیش برنج کە بەرهەمێکی تەواو ڕۆژهەڵاتی بووە هەر لەو ڕێگەیەوە بڵاو بووبێتەوە، بە تایبەت لە سەردەمی ئیلخانیەکاندا و دوای بەهێزتربوونی پەیوەندی بازرگانی و شارستانی نێوان چین و جیهانی ئیسلامی، بە بەڵگەی ئەوەی کە (ابن بطوطە)ش لە میانەی گەشتەکەیدا بۆ شاری تبریز ئاماژەی بەوە کردووە، کە لەیەکێك لە خەڵوەتگاکانی شارەکەدا چەند جۆر خواردنێك پێشکەش بە میوانەکانی دەکرا، لەوانەش برنج[٩١٦]، سەرچاوەیەکیش لەباسکردنی نرخی

---

[٩١٢] الثعالبي، ثمار القلوب، ص٥٣٣.

[٩١٣] ڕێگای حەریر: بەو ڕێگا بازرگانییە گرنگە دەوترا کە لە چینەوە درێژبۆتەوە بەرەو تورکستان و سەمەرقەند و قەزوین و تبریز تا سنووری شام، بەهۆی گواستنەوەی حەریری چین بەم ڕێگایەدا بەرەو ڕۆژئاوا ئەم ناوەی لێنرا، عباس اقبال، تاریخ المغول، ص٥٥١.

[٩١٤] عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكیة، ج٢،ص٢٢٩؛ آكو برهان، التجارة والنظم المالیة، ص ص١٧٤-١٧٥.

[٩١٥] عمادالدین خلیل، الإمارات الأرتقیة، ص٤٥٢؛ عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستكیة، ج٢،ص٢٢٩.

[٩١٦] رحلة ابن بطوطه، ج١، ص٢٠٨.

کالآکاندا لە شارێکی وەك بەغدا ئاماژەی بە نرخی ئەو بەرهەمەش کردووە[917]، ئەمانەش بەڵگەن لەسەر بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە رووەکانە.

شوێنەوارێکی دی لەشکرکێشی و ململانێی نێوان هێزەکان لەسەر کەرتی بازرگانی بریتی بوو، لە گەرموگوڕتر بوونی بازاڕی چەك و چەکسازی، وەك شمشێر و خەنجەرو تیرو کەوان و زرێ و جۆرەکانی تری چەك[918]، بەتایبەت زۆربوونی خواست لەسەر شمشێری هندی کە بەدروستکردنی ئەم جۆرە چەکە ناوبانگی دەرکردبوو[919]، بەتایبەت جۆرێکیان کە بە(القلعیە)[920]ناسرابوو، بەهۆی ڕەونەقداری و بڕەڕی و بەهێزی ناوبانگێکی زۆری لەوڵاتاندا پەیداکردبوو[921]، وەهەر لەئەنجامی شەڕەکاندا ڕێژەی کۆیلە زیادی کرد، چونکە زۆرێك لەوانەی لە جەنگەکاندا بەدیل دەگیران ڕەوانەی بازاڕەکان دەکران و بەکۆیلە دەفرۆشران ، ئەمەش وایکرد دیاردەی بازرگانی کۆیلە ببێتە دیاردەیەکی باوی چاخەکانی ناوەڕاست، سەرچاوەی سەرەکی ئەو کۆیلانەش بەزۆری ڕۆم و ئەرمەن و خەزەرو صەقلەبیەکان بوون[922]، وەگەڕخستنی سەرمایە لەلایەن میر وسوڵتانەکان بۆ دروستکردنی کۆشك و ڕازاندنەوەیان و گەشەکردنی شێوازەکانی بیناسازی و گەشەی پیشەگەری پێویستی بەدەستی کاری هەرزان بازاڕی کۆیلەکانی زیاتر کرد، بەتایبەت خواستی زۆر لەسەر کڕینی کۆیلە سپی پێستەکان هەبوو، ئەمەش وایکرد نرخیان لە بازاڕەکاندا بەرزبێتەوە، شاری سەمەرقەندیش

---

[917] العمري، مسالك الأبصار، ج٣، ص٢٠٤.

[918] مرتضى راوندى، تاريخ اجتماعى ايران،ج٤،ص٧٧٢؛ محمد حسين الزبيدي،العراق في العصر البويهي،ص١٤٨.

[919] الثعالبي، ثمار القلوب،ص٥٣٣.

[920] القلعيه: شارێکی هند بوو لە سەر سنووری چین، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٤ ، ص٣٨٩ .

[921] ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج ٤،ص٣٨٩.

[922] مؤلف مجهول،حدودالعالم،ص١١٩.

گەورەترین بازاڕی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەبوو[٩٢٣]، وەبایەخدان بە ژیانی رابواردن و خۆشگوزەرانی بازاڕی کەنیزەکەکانیشی گەرموگوڕتر کرد، بەتایبەت کەنیزەکە دەنگ خۆش وجوان وقەشەنگ و دەست ڕەنگینەکان[٩٢٤]، هەلکەوتەی بەشێك لە شارە کەوشەنەکانی کوردستانیش لەگەڵ خانەی شەڕ بوونە دەروازەی گواستنەوەیان بەرەو ناوچەکانی دی .

گەشەکردنی مامەڵەی بازرگانی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ویستی سەرلەنوێ نۆژەنکردنەوەی چەند ڕێگەیەکی کۆنی بازرگانی لای هێزەکان سەریهەڵدا، کە چەند سەدەیەك بوو فەرامۆش کرابوون، وەك ڕێگای ئەنادۆڵ، کە ڕێگایەکی دیاری بازرگانی سەردەمی ڕۆمە بیزەنتیەکان بووە، جارێکی دی سەلجوقیەکان هەڵسان بە چاککردنەوەو دروستکردنی پردو دابینکردنی خزمەتگوزاریەکانی دی بۆ ڕێگاکە، وە بۆ یەکەمجار چەند وێستگەیەکی پشوودانیان (محطات القوافل) بە دووری چەند کاتژمێرێك لەیەکترییەوە بۆ بازرگانەکان دروستکرد، کە بە سوڵتان خان (الخان) ناسرابوون، بۆ پاراستنی ئاسایشی کاروانەکان و گێڕانەوەی بایەخی بازرگانی بۆ ڕێگاکە ڕۆڵی باشیان یاریکرد[٩٢٥]، ئەمە بووە دیاردەیەکی دیاری سەردەمی مەغۆلەکانیش، ئەوانیش بە دروستکردنی چەندین خانە لەسەر ڕێگا سەرەکیەکان، بۆ نمونە لە ناوچەکانی موسڵ و سەر ڕێگاکانی جزیرە[٩٢٦]، وەبە دروستکردنی بازارێکی گەورەتر لەوانی پێشوو بۆ بازرگانیی ئەو پانتاییە فراوانەی کە ڕێگاکەی لە چین و هندەوە بۆ ڕۆژئاوای ئاسیاو

---

[٩٢٣] حسن ابراهیم حسن،تاریخ الاسلام،ج٣،ص ص٤٢٤-٤٢٥؛ذبیح الله صفا،تاریخ ادبیات ایران،ج١،ص١٦٨.

[٩٢٤] عبدالعزیز الدوری،تاریخ العراق الاقتصادی،ص٦٥؛ عبدالله سلیمان الحارثی،الاضاع الحضاریة،ص٤٦١.

[٩٢٥] تامارا رایس، السلاجقة، ص١٢١.

[٩٢٦] ابن بطوطه، رحلة ابن بطوطة،ج١،ص٢١٠.

عێراق تا دەریای ناوەڕاست و لەوێشەوە بۆ ڕۆژئاوا درێژ ببۆوە، لەگەڵ دامەزراندنی چەندین مۆڵگەی بازرگانی لە ڕۆژئاوای ئاسیا لە چوارچێوەی بایەخدانیان بە بازرگانی لەگەڵ ڕۆژئاوادا، بارودۆخی گواستنەوەیان بە ئاراستەی بازرگانیکردن لەگەڵ وڵاتە دوورەکاندا باشترکرد [٩٢٧]، هەر بەو هۆیەشەوە ئاراستەی بەشێك لە کاروانە بازرگانییەکان بەرەو ڕێگەی ئەنادۆڵ گۆڕا[٩٢٨]، بەمەش بایەخی بازرگانیی باکووری کوردستان لە بەیەکگەیاندنی ڕێگاکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا زیادی کرد، بەتایبەت ئەو ڕێگەیەی کە لە ئەرمینیای بچووکەوە بەوان و دیاربکردا تێدەپەڕی بەرەو کەنداوی ئەسکەندەرونەو ڕۆژئاوا[٩٢٩].

گۆڕانی ڕێڕەوی مامەڵەی بازرگانیی عێراق و کوردستان بەرەو ئێران و هیند و چین لەبری شام و میسر کە بەشێك بوون لە قەڵەمڕەوەی دەوڵەتی مەمالیك وەك شوێنەوارێکی دی دێتە بەرچاو، ئەویش بەهۆی ئەو پەیوەندییە دوژمنایەتییەی کە لەنێوان ئیلخانیەکان و مەمالیکدا هەبوو، ئەمەش بایەخی بازرگانی ڕێگا وشکانیەکانی کوردستانی زیاترکرد، بەتایبەت بۆ بەستنەوەی عێراق بەشاری تبریز، کە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی ئیلخانی بوو[٩٣٠]، تا لە سەردەمی سوڵتان ئەحمەد تکودار (٦٨٠-٦٨٣ك/١٢٨١-١٢٨٤ز)دا پەیوەندییەکانی لەگەڵ مەمالیك ئاسایی کردەوەو ڕێکەوتننامەیەکی لەیەکگەیشتن لە نێوانیاندا بەسترا، کە بەهۆیەوە ڕێگاکانی میسر بەڕووی بازرگانەکاندا کرایەوە، ئەجارە بەبێ ترس بەڕێگاکانی موسڵ و بەغدا دا بەرەو شام بەپێچەوانەشەوە تا وڵاتی تەتەر کاروانەکان ڕێگایان دەبڕی[٩٣١]، چەند بازرگانێکی

---

(٩٢٧) حافظ أحمد حمدي، الدولة الخوارزمية،ص٢٩٩؛ یارو سلاڤ کلاچی، شارستانیەتی ئاسیا،ل٤٣٦.

(٩٢٨) وليد مصطفى نجم، الأوضاع الإقتصادية، ص٨٢.

(٩٢٩) عباس اقبال، تاريخ المغول، ص٥٥٢؛ وەبڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢)، ل١٤٨.

(٩٣٠) جعفر حسين خصباك، العراق في العهد المغول الإلخانيين، ص١٣٣.

(٩٣١) ابن العبري، تاريخ الزمان، ص٣٤٤؛ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص٢٩٥.

کوردیش لەوانە بوون کە ڕێگایەکی دووریان بۆ کاروباری بازرگانی بەرەو ڕۆژهەلات بڕی[932]، بەلام ئەو پەیوەندییە درێژەی نەکێشاو بەکوژرانی سولتانی ناوبراو جارێکی دی پەیوەندی بازرگانی نێوان ئیلخانیەکان و مەمالیك گرفتی تێکەوتەوە، لەوەشەوە نائارامی ڕێگاکانی گرتەوەو چالاکی دزو ڕێگرەکانیش زیادی کردەوە، ئەوە سەرباری نەبوونی سیستەمی یەکدراوی لە چوارچێوەی قەلەمڕەوی دەولەتی ئیلخانیدا, کە ئاستەنگی لەبەردەم بازرگانیی دروستکردبوو، تادواتر سولتان (غازان)(٦٩٤-٧٠٣ك/١٢٩٤-١٣٠٣ز) هەنگاوی بۆ چارەسەرکردنی سیستەمی فرە دراوی نا[933].

ئەو پێشکەوتنەی بەسەر بازرگانیدا هات، کاریگەری کردە سەر بوژانەوەی ئاستی گوزەران و زیادبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان، کە سەرئەنجام جەنجالی لە شارەکاندا لێکەوتەوە، لەم بارەیەشەوە وەك شوێنەوارێکی دی ڕۆلی هەندێ شار دەرکەوت، شاری (سولتان ئاباد) نموونەیەکی ئەو شارانەیە کە گەشەکردنێکی دیاری بەخۆوە بینیوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کرا بەمەلبەندی کارگێڕی ویلایەتی کوردستان[934]، لەکاتێکدا هێشتا نیو سەدە بەسەر دروستکردنیدا تێنەپەری بوو[935]، کە (العمری) (م.له٧٤٩ك/١٣٤٨ز) سەرسامی خۆی لەزۆر ڕێژەی دانیشتوانی و بازاڕو بوژانەوەی دەربڕیوە، بەجۆرێك کە سەرنجی خەلکی هەموو لایەکی جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە[936]، هەموو ئەمانەش بەلگەن لەسەر ئاستی گەشەکردن و پێشکەوتنی ئابووری لە ڕۆژهەلاتدا، لەبەرامبەر داتەپینی بارودۆخی ئابووری ڕۆژئاواو نزمی ئاستی

---

(٩٣٢) بڕوانە: علی عادل حسین, أربل,ص٢٤٥.

(٩٣٣) بڕوانە: ابن الفوطی،الحوادث الجامعة،ص٣٣٦.

(٩٣٤) حمد الله مستوفی، نزهة القلوب،ص١٠٧؛ تاریخ گزیده،ص٦٠٧؛ حسن الجاف، الوجیز فی تاریخ ایران، ج٢،ص٢٨١.

(٩٣٥) بەو پێیەی شارەکە سالی (٧٠٥ك/١٣٥٠ز)دروستکراوە، القزوینی،لب التواریخ،ص١٤٦.

(٩٣٦) مسالك الابصار،ج٣،ص١٩٩.

گوزەران و کەمبوونی ڕێژەی دانیشتوان، بۆ نموونە شارێکی وەك پاریس کە گەورەترین و قەرەباڵغترین شاری ئەورووپا بوو لە دووسەدو پەنجا هەزار کەس تێنەپەڕیبوو[٩٣٧]، سەرباری بڵاوبوونەوەی پەتاو نەخۆشی و دواکەوتوویی کەرتی کشتوکاڵ و بازرگانی[٩٣٨].

بەم شێوەیە هەواڵی تام و چێژی ژیان و خۆشگوزەرانی ڕۆژهەڵاتیەکان و دەنگۆی سامانی زۆرو زەبەندی, لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە گەیشتە ڕۆژئاوا، وێناکردنیشی وەك ناوچەیەکی خاوەن سامان و دەوڵەمەند دەرفەتی دایە دەست پاشاکان و کەنیسەی مەسیحی کە بەوپەڕی شەوق وگەرموگوڕی بەهەموو ڕێگایەکدا بچن تا سەرێك لە سەروەت و سامانی ڕۆژهەڵات هەڵکەن و پێی بگەن، بۆ ئەو مەبەستەش هەڵمەتی دۆزینەوە جوگرافیەکانیان دەستپێکرد, ئەویش بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك کە بەئاسانترین شێوە بیانگەیەنێتە ڕۆژهەڵاتی نزیك و هند[٩٣٩]، لە هەوڵەکانیشیاندا بەهرەمەندبوون، چونکە لەماوەیەکی کەمدا بەشی زۆری بازرگانیی دەرەکی تەبریز کەوتە دەست بازرگانە ڕۆژئاواییەکان، تەنانەت هەندێکیان مافی کەشتیوانییان لە دەریای قەزوین بەپشتگیری پاشای یۆنان بەدەستهێنا[٩٤٠]، لە قۆناغەکانی داهاتووشیاندا لە دۆزینەوەی جوگرافی تێپەڕیانکردو پشتیوانی دانیشتوانیشیان بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی باش و بەهێزو هێرشکردنە سەر ئەو ناوچانە مسۆگەر کرد، ئەمەش لەگەڵ بڕوای زۆر لە سیاسەتمەدارو ئایدۆلۆژیستەکان هاتەوە، کە بۆ گفتوگۆ لە بارەی ڕێگا چارەی دەرچوون لە چەقبەستوویی ئەو قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە ئەورووپا لە چاخەکانی ناوەڕاست تێیکەوتبوو، دەستگرتنیان بەسەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بەڕێگا

---

[٩٣٧] يلماز أوزطونا، المدخل الى التاريخ التركي، ص ص٣٧٤.

[٩٣٨] محمد محمد صالح، تاريخ أوربا،مكتبة دار الجاحظ،(بغداد:١٩٨٢م)، ص ص ١٢٠-١٢١.

[٩٣٩] محمد محمد صالح، تاريخ أوربا، ص١٣٩؛ حافظ أحمد حمدي، الدولة الخوارزمية،ص٣٠٣.

[٩٤٠] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص٥٥٣.

چارەدەزانی[941]، لەمەش بەدواوە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی داگیرکاری بیانی دەستیپێکرد،کوردستان لە شوێنەوارەکانی ئەو پرۆسە لەشکرکێشییە بەردەوامەش بێبەش نەبووە.

لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە، کە ئابووری بۆتە پاشکۆی بارگۆڕانە سیاسی و سەربازیەکان و بەقوڵی کەوتۆتە ژێر کاریگەرییانەوە، شوێنەواریشی بەسەر هەلومەرجی بازرگانیدا زۆر دیاربووەو هەمیشە لەیەك ئاستدا نەبووە، بەڵکو بەرزی و نزمی و گەشەکردن و قەیرانیشی تێکەوتووە هەروەك روونمان کردەوە.

---

[941] بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: محمد محمد صالح، تاريخ أوروبا، ص١٤٨ ومابعدها.

## باسی سێیەم/ شوێنەوارەکان لەسەر پیشەگەری و هەندێ شوێنەواری دی:

### أ/ لەسەر پیشەگەری (بواری هونەری):

ڕەوشی ژیانی پیشەوەران و هونەری پیشەگەری وەك لایەنێکی گرنگی شارستانی و پەیوەندی دار بە توانستی هونەری و دەستڕەنگینی مرۆڤ[٩٤٢]، وەرەخسانی زەمینە و هەلومەرجی خستنەگەڕی تواناو شارەزاییەکانی، وەك هەر لایەنێکی دی، بەهۆی پرۆسەی لەشکرکێشی هێزەکان کارتێکراوەو شوێنەواریان لەسەر ئەم لایەنەش بەجێهێشتووە، هەرچەندە لەمبارەیەوە زانیارییەکان دەگمەنن، بەڵام توێژەران بە پشتبەستن بە پاشماوە جیاوازەکانی، بەتایبەت سەردەمی سەلجوقی و ئیلخانی وەك سەرچاوەیەکی دیکۆمێنتی و مادی ئاماژەیان بە پێشکەوتنی ئەم لایەنە کردووەو زۆربەیان ئەرێیانە لێیان ڕوانیوە، کە خۆی لە داهێنان و گۆڕانکاری لە هونەری گڵکاری و کەرەستەکانی بیناسازی وکەلوپەلەکانی جوانکاری و جۆراوجۆری بەرهەمە دەستیەکان و هونەری هەڵکۆڵیندا بینیوەتەوە، ئەمانەو چەند شوێنەوارێکی دی ئابووری وەك دەستبەسەرداگرتنی زێرخانی ئابووری و دیارییە زۆرو گرانبەهاکانی میرەکانی کورد بۆ هێزەکان و کاریگەرییان لەسەر سیستەمی دراوی میرنشینەکان، کە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان شوێن پەنجەیان لەسەر ئابووری کوردستان داناوە، هەموو ئەمانەش دەبنە دوا تەورەی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

لەمێژووی هەر شارێکدا و بەپێی پێویستیەکان جۆری ئەو چالاکیە بۆ پڕکردنەوەیان بەسەرچاوە گیاوە، دانیشتوان تواناو شارەزاییان لەچەند جۆرێك لە پیشە

---

[٩٤٢] الجرجاني، التعريفات، ص١٤٠.

داهەبووە، لەگەڵ پێشکەوتنی ئاستی زانستی و هۆشیاری و گەشەکردنی ئابوریش گۆڕان بەسەر بەرهەم دەستیەکانی مرۆڤیشدا هاتووە، پیشەوەرانیش بە پێی جۆری دروستکراوەکانیان پۆلێن کراون، بۆ نموونە لە زۆربەی شارە کوردیەکان بازاڕی تایبەت بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانیان هەبووە[٩٤٣]، دیاردەیەکی دی کە هەر لەمبارەیەوە بەدی دەکرێت، ئەوە بوو کە هەر شارەو بە پیشەیەك یان زیاتر لە پیشەیەك ناسراوە، بۆ نموونە خلاط بە دروستکردنی قفڵ بە جۆرێك کە لە هیچ شوێنێك وێنەی نەبووە[٩٤٤]، شارەکانی هەرێمی چیاکان بە بەرهەمە سپیاییەکانی وەك پەنیر و ماست[٩٤٥]، ئامەد بە بەرهەمە چنراوەکان[٩٤٦]...هتد.

لەسەردەمی بوەیهیەکان گۆڕانکاری بەسەر جۆرو شێوازەکانی پیشەگەریدا هات، بەتایبەت ئەوان لە دروستکردنی کەلوپەل و پێویستیەکانی ناو ماڵ و بەرهەمە دەستیەکانی دی، ئەویش بە گەڕانەوە بۆ شێوازی کۆنی ئێرانی، بۆ نموونە لەسەر کەلوپەلە دروستکراوەکانی وەك گڵێنەو قاپ... دەستڕەنگین و پیشەوەرانی ئەم بوارە وێنەی ئاژەڵ و باڵندەی خوڕافییان لەسەر نەخش دەکردن، وەك وێنەی ئاژەڵێك کە سەری مرۆڤێکی پێوە دەلکێنرا یان وێنەی جۆرەکانی میوەو گوڵ و درەختیان لەسەر دروستکرابوو[٩٤٧]، هونەری زەخرەفەش بەجۆرێك ڕازێنرابۆوە کە گوزارشتی لە دیاردەکانی ژیان و هێز دەکرد، ئەو زەخرەفەیەش کە بە(جبری) ناسرابوو، بەهەردوو

---

[٩٤٣] فرهاد حاجي عبوش، المدينة الكردية، ص ص١٩٤-١٩٥.

[٩٤٤] القزويني، آثار البلاد، ص٥٢٤.

[٩٤٥] ابن حوقل، صورة الارض،ص٣١٧؛حكيم أحمد خوشناو، الكرد وبلادهم، ص٢٣٢.

[٩٤٦] المقدسي، أحسن التقاسيم، ص١٣١؛ سوادي عبد محمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية، ص٢٧٣.

[٩٤٧] نعمت اسماعيل علام، فنون الشرق الأوسط، ص٨٨؛ خاشع المعاضدي, تاريخ الدويلات العربية والاسلامية,ص٦٦.

شێوازی یەکڕەنگی و ڕەنگاوڕەنگی هەڵدەکەنرا، لەگەڵ بەکارهێنانی ڕێنووسی کوفی لەسەر کەلوپەلە دروستکراوەکان[٩٤٨].

ئەم جۆرە هونەرەش وەك بەشێك لە پیشەی دەستی لە کوردستان بڵاوبۆتەوە، بەتایبەت لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، بە بەڵگەی ئەوەی چەند پارچە گڵێنەیەك لەو ناوچانە دۆزراونەتەوە، کە ڕێنووسی کوفیان لەسەر شێوازی بوەیهی لە سەر نووسراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەردوو میرنشینی حسنویهی و عەنازی، واتە سەدەی (٤-٥ك/١٠-١١ز)، ئەمانەو شێوازەکانی دروستکردنی گۆزەو گڵێنەو کەلوپەلی دی کە پاشماوەی هونەری بویهیەکانن لە کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە[٩٤٩].

هەرچی پیشەی ڕستن و چنین و بەرهەمەکانی دی وەك ڕاخەرو فەرش بوو، لە سەردەمی بوەیهیەکاندا بایەخی زۆری پێدراو پێشکەوتنی دیاری بە خۆوە بینی، دامەزراندنی دیوانێك بۆ سەرپەرشتیکردنی کەلوپەلە چنراوەکانی میر و خەلیفەو بەرپرسان بەناوی (دیوانی گراز) بەڵگەیەکی باشە لەم بارەیەوە[٩٥٠]، کانزاکاری و پیشەی زەڕەنگەری لەوانەبوون کە پێشکەوتنی دیاریان بەسەرداهاتووە، بەهۆی کەڵەکەبوونی سامان لە دەستی میرو خواستی زۆر لەسەریان برەویان پەیداکرد، بۆ ڕازاندنەوەو جوانکاری سودیان لێدەبینراو تەنانەت زێڕ لە دروستکردنی هەندێ کەلوپەلی ناوماڵیش بەکارهات[٩٥١]، وە زیادەڕۆیی کرا لە ڕازاندنەوەی بنمیچی هەندێ لە کۆشکەکانیان بە زێڕ[٩٥٢]، کاریگەری ئەو جۆرە هونەرانەش لە کۆشك و ماڵی میرە

[٩٤٨] نعمت اسماعيل علام، فنون الشرق الأوسط، ص ص٨٨-٨٩؛ محمد حسين الزبيدي، العراق في العصر البويهي، ص١٤٦.

[٩٤٩] حسام الدين نەقشبەندی، شارەزوور، ل٤٨٠.

[٩٥٠] محمد حسين الزبيدي، العراق في العصر البويهي، ص ص١٣٩-١٤٤.

[٩٥١] الصولي، أخبار الراضي، ص١٠١؛ ابن الجوزي، المنتظم، ج٧،ص٧٧.

[٩٥٢] ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص٣١.

کوردیەکاندا دەرکەوتووە[٩٥٣]، بۆ نموونە نصرالدولەی مەڕوانی خاوەنی چەندین پارچە دەفرو گڵێنەو پەرداخ و بلوری و شتی گرانبەهاو نایابی نەخش و نیگار جوان بوو، کە دەسڕەنگێنی و وەستاکاری وایان تێدا کرابوو، لەوان جوانتر نەبینرابوو، لەوانەش مرواریە سورەکەی میر کە هەر لە بوەیهیەکانەوە دەستی کەوتبوو[٩٥٤]، ئەمانەش سەرباری ئەوەی کە ڕادەی پێشکەوتنی پیشەگەری دەردەخەن، هەمیش بایەخدانی میرەکان بە کۆکردنەوەی کەلوپەلە نایاب و گرانبەهاکان دەخەنە ڕوو.

لەسەردەمی سەلجوقیەکان ئەم هونەرە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، بەتایبەت ڕێکسازی و وردەکاری زۆر لە دروستکردنی گۆزەو گڵێنەو سوراحی و کەلوپەلە پێویستەکانی دیدا بەکاردەهات و گۆڕانکاری بە سەر شێوازەکانیدا هێنرا[٩٥٥]، نەخشکردنی وێنەی سەرنجڕاکێش و جیاواز و هەڵکۆڵینی وێنەی وا کە نەخش و نیگارکردنیان لە ئیسلامداو لەلایەن زانایانەوە بە نادروست دانراون[٩٥٦]، برەوی سەند، کاریگەری هونەری و شێوازی سەلجوقی لەسەر پیشەی ڕستن و چنینیش بە دیارکەوت، بەتایبەت جلوبەرگە لە حەریر دروستکراوەکان ستایلێکی تازە بەخۆوە گرت و وێنەی جۆراوجۆریان لەسەر نەخش دەکراو قەدو کەتافەکانیشیان بە زێڕ دەڕازێنرانەوە[٩٥٧]، هەموو ناوچەکانی عێراق و کوردستان کەوتنە ژێرکاریگەری شێوازەکانی هونەری سەلجوقی و شوێنەواریان بەسەر پیشە جۆراوجۆرەکاندا مایەوە، ئەمەش لە دروستکردنی کەلوپەلەکاندا تا ڕۆژگارێکی درێژ، بۆ نموونە لە شارێکی

---

[٩٥٣] الفارقي،تاريخ الفارقي،ص ص١٠٧-١٠٨.

[٩٥٤] الفارقي،تاريخ الفارقي،ص ص٢١٦-٢١٧؛ العمري، مسالك الابصار، ج٢٦، ص٢٥٩.

[٩٥٥] تامارا رامايس، السلاجقة، ص١٩٠؛ حسين أمين، العراق في العصر السلجوقي، ص ص٣١١-٣١٥.

[٩٥٦] ابن الجوزي، المنتظم، ج١٠، ص ص١٤٨-١٤٩.

[٩٥٧] حسين أمين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٣١٨.

وەك دياريكر هەرمابوو[958]، ڕەنگە هونەری بيناسازی لە ديارترين ئەو لايەنانەبێت كە پيشەگەرو دەستڕەنگينانی ئەم بوارە داهێنانيان تێداكردووە، بەتايبەت لە بەكارهێنانی خشتی سووردا بۆ ڕازاندنەوەی ديوارو دروستكردنی زەخرەفەی جياواز پێی، لەگەڵ هەڵكۆڵينی نووسين لەسەر بەردو گەچ و ديوارەكانی ناوەو دەرەوەی كۆشكەكان[959]، هەموو ئەمانەش شوێنەواری جۆراوجۆريان لەسەر لايەنی ئاواكاری كوردستان بەجێهێشتووە[960]، كە تا ئێستاش بەشێك لەو شوێنەوارانە بەدی دەكرێت.

سەبارەت بەكاريگەری مەغۆليش لەسەر پيشەگەری، ئەوا هەر لە سەرەتای شاڵاوەكانيان بۆ سەر جيهانی ئيسلامی سياسەتێكی جياوازيان لە بەرامبەر پيشەوەران و دەستڕەنگينەكان پەيڕەوكردو تەنها توێژێك بوون كە لە كوشتاری مەغۆل ڕزگاريان بوو، وەك بەشێك لە سياسەتی مەغۆل، كە برياريان لە سەر نەكوشتنيان دا لە بەرژەوەندی خۆيان هەرچی پيشەگەر و دەستڕەنگين هەبوو لە هەر شارێكدا كە داگيريان دەكرد، بەنموونەی شاری موسڵ، دەيانگواستنەوە بۆ چين و مەنغۆليا[961]، كە دواجار ئەنجامێكی باشی لە سەر بوژاندنەوەی پيشەگەری لێكەوتەوە، بەتايبەت ئەوان سياسەتی هێنان و بردنی پيشەگەرانيان لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دی پەيڕەو دەكرد[962]، بەمەش پيشەگەرە موسڵمانەكان تێكەڵ بە هونەری جۆراوجۆری چين بوون و كاتێكيش لە سەردەمی ئيلخانيدا گەڕانەوە ناوچەكانيان لە ئێران و كوردستان، لەگەڵ خۆيان ئەو هونەر و شێوازەی لێی بەهرەمەند ببوون گواستيانەوە، بەوەش

---

[958] ئەوليا چەلەبی، سياحەتنامە، ل ل٦١-٦٢.

[959] نعمت اسماعيل علام، فنون الشرق الأوسط، ص١٣٩؛ برنار اوكان، كنوز الاسلامی، ص١١٤.

[960] حسين أمين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي، ص٣٢٠.

[961] الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١،ص٣٣٠؛ سەيد باز ئەلعرينی،مەغۆلەكان، ل١٣٧؛عصام الدين عبدالرؤف، بلادالجزيرة،ص٤٥.

[962] يارو سلاڤ كراچی، شارستانيەتی ئاسيا، ل٢٥٠.

پیشەگەری جارێکی دی دەستی بە بوژانەوە کرد، بەڵام سیمایەکی چینی پێوە دیاربوو، چونکە سەرباری موسڵمانبوونی خانەکانی مەغۆل، بەڵام پەیوەندییان بە فەرهەنگ و رۆشنبیری ئەو هونەرەوە نەپچڕا[٩٦٣].

گرنگترین شوێنەواریش لە سەر پیشەی ڕستن و چنین و هونەری هەڵکۆڵین لەسەر دار و تەختەو بەکارهێنانی زەخرەفەی چینی لە کانزاکاریدا ڕەنگی دایەوە، کاریشی کردە سەر هەموو ناوچەکان لەوانەش کوردستان وەك بەشێك لە دەوڵەتی ئیلخانی نەك هەر ئەم جۆرە هونەرانەی تێدا بڵاو بۆوە، بەڵکو بەهۆی پێگە جوگرافیەکەی کورد رۆڵی گواستنەوەی دیاردە شارستانیەتەکانیشی بۆ گەلانی دی گێڕایەوە[٩٦٤]، زیاتر لەوەش هەریەك لە شارەکانی تبریزو مەراغە و سلطانیە وەك گەورەترین مەڵبەندی هونەری پیشەگەری جۆراوجۆر لەسەر ئاستی دەوڵەتی ئیلخانی دەرکەوتن[٩٦٥]، هەر لە سەردەمی ئەواندا هونەری گلکاری پێشکەوتنی دیاری بەخۆوە بینیوەو شێوازێکی نوێ لەو هونەرە دەکەوت کە بە(میناو) ناسراوە و بریتی بوو لە هەڵکۆڵینی وێنەی جیاواز و ڕەنگاوڕەنگ لەسەر فەخفوری[٩٦٦]، ئەمەو جگە لە پێشکەوتن و گۆڕانکاری لە پیشەگەرییەکانی بواری ئاواکاری و بیناسازی، کە کاریگەرییان کردە سەر دروستکردنی کۆشك و مزگەوتەکانی شارە کوردنشینەکانیش[٩٦٧].

بەسەرنجدان لەوەی باسکرا سەبارەت بەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییانەی بەسەر لایەنە جیاوازەکانی پیشەگەریدا هاتوون، دەردەکەوێت بە بارێکی دیدا کاریگەرییان کردبێتە

---

[٩٦٣] مرتضی راوندی،تاریخ اجتماعی ایران،ج٧،ص٥٥١.

[٩٦٤] کەمال مەزهەر، مێژوو، ل١٢.

[٩٦٥] نعمت اسماعیل علام، فنون الشرق الأوسط،ص ص٢١٩-٢٢٠؛ مرتضی راوندی، تاریخ اجتماعی ایران،ج٧،ص٥٥١.

[٩٦٦] ولبر، ایران، ص ص٧٤-٧٥.

[٩٦٧] نعمت اسماعیل علام، فنون الشرق الأوسط،ص٢٠٩.

سەر پوکانەوەی هەندێ پیشەو بەرهەمی خۆماڵی لە کوردستاندا، بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری شێوازو لایەنە هونەرییەکانی پیشەگەری بێگانە، بە ڕاستیش سادەیی و ساکاری بەرهەمە دەستییەکانی پیشەگەرانی کورد کە لەسەر هەوڵ لێهاتوویی تاکەکەسی وەستابوون(٩٦٨)، بەو سادەییە نەیاندەتوانی بەرگەی پێشکەوتن و تەرزی بێگانە بگرن، بۆیە کەوتنە ژێر کاریگەرییانەوە، بۆچوونی واش لە ئارادایە کە هەر دەستڕەنگین و پیشەگەرە خۆجێییەکان بوون گۆڕانکارییان بەسەر پیشەگەریدا هێنا، بەڵام لەسەر شێوازی بێگانە(٩٦٩)، ئەمەش دەشێ کاریگەری خراپی کردبێتە سەر پیشەگەری لە کوردستاندا و هەندێ پیشەی خۆماڵی شێوازێکی تایبەت بەخۆیان لەدەست دابێت، بەڵام هەندێك بەرهەم ڕەسەنایەتی خۆیان هەر پاراست، کە کورد پێیان بەناوبانگە تا ئەمڕۆش، وەك شاڵ (مەرەز)ی کوردی، کە شارێکی وەك ماردین ناوبانگی پێدەرکردبوو(٩٧٠)، یان بەرهەمەکانی دی سامانی ئاژەڵ وەك ماست و پەنیرو ڕۆن و خوری کە هەرێمی چیاکان پێی بەناوبانگ بوو(٩٧١)، ئەمەو سیاسەتی هەندێ لە هێزەکانیش بەزیادکردنی باج لەسەر پیشەگەرو بەرهەمەکانیان، بە جۆرێك کە زۆرجار ڕێژەکەی لە داهاتەکانیان زیاتر بووە، وەك زیادکردنی باجی سەر پۆشاکی ئاوریشمین لەلایەن صمصام الدولەی بوەیهی ساڵی (٣٧٥ك/٩٨٥ز) کە ناڕەزایی زۆری لێکەوتەوە(٩٧٢)، شوێنەواری خراپی لەسەر ئەم لایەنە بەجێهێشتووە، زۆرجاریش پیشەگەری بەرەو پوکانەوەی بردووە(٩٧٣)، لەلایەکی دیش ڕەنگە بەهۆی سیستەمی یەك

---

(٩٦٨) عمادالدين خليل، الإمارات الأرتقية، ص٤٤٦؛ حكيم أحمد خوشناو، الكرد وبلادهم، ص٢٤١.

(٩٦٩) نعمت اسماعيل علام، فنون الشرق الأوسط،ص١٣٤.

(٩٧٠) ابن بطوطة، رحلة ابن بطوطة،ج١،ص٢١٢؛ لسترنج، البلدان الخلافة الشرقية، ص١٢٦.

(٩٧١) ابن حوقل، صورة الأرض،٣١٧.

(٩٧٢) ابن الأثير،الكامل،ج٧،ص٤١٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام(حوادث٣٥١-٣٨٠هـ)، ص٤٧٧.

(٩٧٣) صالح أحمد العلي، العراق في التاريخ، ص٤٥٣؛ عبدالجبار ناجي والآخرين، الدولة العربية، ص٣٤٩.

دەوڵەتی ئەمانی بەریەستەکان و کرانەوەی دەرگای هەرێمەکان بە ڕووی یەکتردا بۆ بازرگانی و بڵاوبوونەوەی بەرهەمە بیانیەکان، بە شێواز و جۆری جیاواز و زیادبوونی خواست لەسەریان و بەئاسانی بەردەستبوونیان، بەتایبەت بەرهەم ڕۆژهەڵاتیەکان کاریگەری خراپی کردە سەر بەرەو پوکانەوە چوونی بەرهەمە خۆماڵیەکان.

هەموو ئەو گۆڕانکاریانە کاریشیان کردۆتە سەر گەشەکردنی هۆشیاری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی، ڕەنگە ئەمەش لە هەڵگرتنی ئەو نازناوانە بەرجەستە بێت، کە هەندێ لە پیشەگەرانی کورد لە نێو ئەو شارستانیەتەدا لە بری ناوی هۆزو خێڵ بنەماڵە بە پیشەکانیانەوە وەك ئەریتێکی مەدەنی ناوبانگیان پێ دەرکردووە، وەك ئاسنگەر و مسگەر و زێڕنگەر و بەرگ دروو و دارتاش..هتد، بۆ نموونە دەستڕەنگینێکی وەك (ابی بکر عبدالحمید بن عبدالرشید الهمدانی) (مردووە لە٦٣٧ك/١٢٣٩ز) بە ئاسنگەر[٩٧٤]، (جلال الدین علی الماردینی) (مردووە لە ٦٥٨ك/١٢٥٨ز) بە مسگەر ناسراون[٩٧٥]، ئەمانەو چەندین نموونەی دی[٩٧٦]، هەموو ئەمانەش بەڵگەی ئەو شوێنەوارانەن کە بەسەر لایەنی پیشەگەری کوردستاندا هاتوون.

---

[٩٧٤] الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨،ص٤٤.

[٩٧٥] الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٢، ص ص٢١٦-٢١٨.

[٩٧٦] بڕوانە: فرهاد حاجي عبوش، المدينة الكردية، ص ص١٩٨-١٩٩.

## ب/ هەندێ شوێنەواری دی:

### یەکەم/ دەستگرتن بەسەر ژێرخانی ئابووریدا:

جگە لەوانەی پێشتر باسکران لەشکرکێشی هێزە داگیرکەرەکان لە مێژووی دوور و نزیکیاندا چەند شوێنەوارێکی دی خراپیان لە سەر بارودۆخی ئابووری کوردستان بەجێهێشت، ڕەنگە شوێنەواری ئەو زیانانەی کە زۆر جار لە ئەنجامی ئەو دەستکەوتە سەرسوڕهێنەر و کەلوپەلە گرانبەهایانەی لە مەیدانی شەڕو قەڵاو شارەکانی کوردستاندا دەست هێزەکان کەوتوون، هیچیان کەمتر نەبێت لە شوێنەوارە خراپەکانی دی، بۆ نموونە عضدالدولتی بوەیهی لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) لە هێرشەکەیدا بۆ سەر میرنشینی حسنویهی دەستی بەسەر هەرچی گەنجینەو پارەو سامانی میرنشینەکەدا گرت، کە لە قەڵای (سرماج)[٩٧٧] کۆکرابوونەوە، کە لە ژماردن نەدەهات[٩٧٨]، بەوەش میرنشینەکەی پەرپووت کرد، زۆر جاریش شەڕە ناوخۆییەکان هەلی زێڕینیان ڕەخساندووە بۆ هێزەکان تا دەستبگرن بەسەر گەنجینەی لەبن نەهاتووی میرنشینەکاندا، ئەو پارەو زێڕو زیوەی لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١٠ز)(فخر الملك) لە میانەی پڕۆسە لەشکرکێشییەکەی بۆ سەر هیلالی کوڕی بدر لە قەڵای شاپور خواست دەستی بەسەردا گرت، بە بڕو ژمارەو ئاماری جۆراوجۆر خراوەتەڕوو، (ابن الجوزی) ئاماژەی بەوە کردووە کە چواردەهەزار پێستە دیناری زێڕو چل هەزار پێستە لە

---

[٩٧٧] سرماج: قەڵایەکی پتەو و پارێزراوی هەرێمی چیاکان بووە نزیك شاری دینور، لسترنج،بلدان الخلافة الشرقیة،ص٢٢٤.

[٩٧٨] مسکویە، تجارب الأمم،ج٥،ص٤٥٣؛ الروذراوري،ذیل تجارب الأمم،ج٦،ص١١؛جمیل ڕۆژبیانی،مێژوو حسنویهی،ل٥٨.

درهەمی زیو لە قەڵاکەدا هەبووە[٩٧٩]، سەرچاوەیەکی تریش بە چل هەزار کیسە (بدرە) درهەم و چوارسەد کیسە زێڕی داناوە[٩٨٠]، بە پێی خەمڵاندنی (ابن کثیر)یش هەر کیسەیەك دە هەزار درهەمی تێدا بووە[٩٨١]، کەواتە دەبێت نزیکەی چل ملیۆن درهەمی زیوو لە قەڵاکەدا هەبووبێت، بە پێی خەمڵاندنی توێژەرێکیش کە هەر دینارێکی بە پازدە درهەم داناوە، ئەوە دەکاتە نزیکەی (بیست و حەوت) ملیۆن دینار!، ئەمەش پارەیەکی یەکجار زۆرە، بەتایبەت ئەگەر تێبینی بەرزی نرخ و بەهای پارەی ئەوکات بکرێت[٩٨٢]، ئەوە جگە لەو شتومەکە گرانبەهاو سەرنجڕاکێشانەی وەك گەواهیرات و مرواری و جلوبەرگ کاڵای بەنرخ و چەك و شتی دی کە بەچەندین بار بۆ بەغدا گوازرانەوە[٩٨٣]، یەك لەخەسڵەتە دیارەکانی غوزەکانیش دەستبەسەرداگرتنی بەرهەمی کشتوکاڵی و بەتاڵان بردنی سامانی ئاژەڵی دانیشتوان بوو[٩٨٤]، ئەوان لە هێرشەکانیاندا دەستیان لەسامانی ئاژەڵیش نەپاراست و وەك تاڵانی جەنگ دەستیان بەسەرداگرت، وەك بەتاڵان بردنی مەڕو مالات و ئاژەڵەکانی شارەزوورو حلوان و دەوروبەری لە ساڵی (٤٣٨ك/١٠٤٦ز) لە کاتی پەلامارەکانیان بۆ سەر ئەم ناوچانە[٩٨٥].

ئەو دەستکەوت و تاڵانیەش کە سەلجوقیەکان لە کاتی داگیرکردنی هەرناوچەیەکی کوردستاندا دەستیان بەسەردا گرتووە، زۆر لەوە زیاتر بووە، بۆ نموونە

---

[٩٧٩] المنتظم، ج٧، ص٢٧٢.

[٩٨٠] ابن الأثیر،الکامل،ج٧،ص٥٦٥، وە بڕوانە: ابوالهجاء،تاریخ ابن ابوالهجاء،ص١٨٥.

[٩٨١] البدایة والنهایة، ج١١، ص١٥٤.

[٩٨٢] حسام الدین نەقشبەندی، شارەزوور، ل٢٦٥.

[٩٨٣] ابن الأثیر،الکامل،ج٧،ص ٥٦٤؛ محمد جمیل ڕۆژبیانی، میرنشینی حسنویهی، ل٧٣.

[٩٨٤] ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص ص٧٢٠-٧٢٢.

[٩٨٥] ابن الجوزی،المنتظم،ج٨،ص١٣٠؛ابن الأثیر، الکامل، ج٨، ص٥٧.

لەکاتی هێرشی سوڵتان (الب ارسلان)(٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٣-١٠٧٢ز) بۆ سەر میر (ابو العباس فضلونە)ی میرنشینی شوانکارەی کوردی ساڵی (٤٥٨ك/١٠٦٥ز) بەهۆی ئەوەی بەرەنگاری سوپای سوڵتان بوونەوەو ئامادە نەبوون ملکەچی فەرمانەکانی بن[٩٨٦]، سوڵتانی ناوبراو دەستی بەسەر خەزێنەکانی ئەو میرە کوردە لە قەڵای (أصطخر)دا[٩٨٧] گرت، شتی وای لە خەزێنەکانی دەستکەوت کە هەر وەك (الحسینی) ئاماژەی داوە ((نەچاو بینیبووی و نە گوێش بیستبووی))[٩٨٨]، ئەم جۆرە پێداهەڵدانە و خەمڵاندنەش قەبارەو ڕادەی ئەو دەستکەوتە زۆرانە دەردەخات کە مرۆڤ بە بینین و بیستنیان سەرسام بووە، هەر هەمان سوڵتان لە ساڵی (٤٥٩ك/١٠٦٦ز) لە چوارچێوەی پرۆسە فراوانخوازیەکەیدا بۆ دەستبەسەرداگرتنی تەواوی جیهانی ئیسلامی[٩٨٩]، پەلاماری میرنشینی شەدادی لە هەرێمی ئاراندا و سەرباری ئەوەی میر (فضلونی دووەم) (٤٥٩-٤٦٨ك/١٠٦٦-١٠٧٥ز) گوێڕایەڵی و سۆزی بۆ نواند، کلیلی خەزێنەکانیشی پێشکەش بە سوڵتان کرد، هەموو ئەو زەخیرە گرانبەهایانەی کە هەیبوو بە سوڵتانی ناوبراوی بەخشین[٩٩٠].

کاتێك هەواڵی گەنجینەو سامانە ئەفسانەییەکەی مەروانیەکانیش لە ڕێگەی فخرالدولە ی کۆنە وەزیریانەوە بە گوێی (ملکشاه و نظام الملك)ی وەزیری گەیشت، ئەوانی سەوداسەر کرد بۆ دەستبەسەرداگرتنی، لە گرێژە نەچوونی بارودۆخی

---

[٩٨٦] الراوندي، راحة الصدور، ص١٨٨؛ اليزدي،العراضة في الحكاية السلجوقية،ص٤٦؛محمد امين زكي،تاريخ الدول والامارات،ص١٥٣.

[٩٨٧] أصطخر (ئەستەخر): شارۆچکەیەکی بەناوبانگ و خاوەن قەڵایەکی پتەویش بوو، کەوتۆتە باکووری هەرێمی فارس، ياقوت الحموي، معجم البلدان،ج١، ص٢١١.

[٩٨٨] زبدة التواريخ، ص١٠٠.

[٩٨٩] الراوندي، راحة الصدور، ص١٨٨؛ اليزدي، العراضة في الحكاية السلجوقية، ص٤٦.

[٩٩٠] منجم باشي، جامع الدول، ص٢٦٨.

میرنشینەکەش زامنی دەست بەسەرداگرتنی ئەو سەروەت و سامانەی بۆ کـردن، نظـام الملك ئەوەی بە سولتّان ڕاگەیاند کە ئەم ولاتە شێواوەو پارەو پـولێکی بـێ ژمـارو بـێ سنووری لێیە[991]، ئەوەبوو سالّی (٤٧٨ك/١٠٨٥ز) هەر بە سەرکردایەتی فخرالدولە ئاگادارو شارەزا بەگەنجینەو خەزێنەکان هێرش کرایە سەر میرنشینی مـەڕوانی، تـوانی دەست بگرێت بەسەر گەنجینەکانی میایەتی و سەروەت و سامان و شـتومەکە سـەرنج ڕاکێش و گرانبەها لە زێڕ و زیو و گەواهێراتی مەڕوانی[992]، ئەو شتە ناوازانـەی کـە ژیانی میانی مەڕوانی لە سەردەمێکی پڕ لـە شـکۆمەندی و گەورەیـدا نیـشان دەداو چەندین سـالّ بـە شـێوەی چـیرۆکی سەرسـامکەر هـەوالّی زێـڕو زیـوو حەرامـسەرای شاهانەیان بە جیهانی ئیـسلامی و دەرەوەی ئـەو جیهانـەش بـەخش ببـوو، کـە دیـارە دەستکەوتەکان ئەوەندە زۆر بـوون لـە ئـەژمار نـەهاتوون، بـە بەڵگـەی ئـەوەی دوای تێپەڕبوونی پازدە سالّ بەسەر ئەم ڕووداوە دا و لـە سـالّی(٤٩٣ك/١٠٩٩ز)دا کاتێـك سـولتّانی سـەلجوقی برکیـاروق(٤٨٥-٤٩٨ك/١٠٩٢-١١٠٤ز) تووشـی تەنگـژەی ئابووری هات، داوای لە(عمدالدولە ی کـوڕی فخرالدولـە)ی وەزیـری کـرد ئـەو مـالّ وسامانەی لە دیاربکر و جزیرە لە سەردەمی سولتّان ملکشاە دا لەگەلّ باوکی دەستیان بەسەردا گرتبوو بۆی بگێڕێتەوە[993]، ئەوەبوو عمدالدولە دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سالە واش بڕی سەدوشەش هەزار دیناری بۆ برکیاروق گێڕایەوە[994]، ئـەوەش جێگـای گومـان کردن نییە، چونکە کوردستان ولاتێکە بە هۆی ئاوهـەواو بازرگـانی بەسـەرو سامـان و دەولّەمەند بووە، میرنشینەکانیش بە گشتی لە ڕێگەی بـاج و خەراجـەوە بـە

---

[991] فارقی،مێژووی میافارقین، ل١١٨.

[992] ابـن الجـوزي، المنـتظم، ج٩، ص١٤؛ ابـن واصـل،مفرج الكـروب،ج١،ص ص١١-١٢؛ ابـو الفـداء، المختصر في أخبار البشر،ج٢، ص٩.

[993] ابن الجوزي، المنتظم، ج٩،ص١١٢.

[994] ابن الجوزي، المنتظم، ج٩، ص١١٢؛ ابن الأثير،الكامل،ج٨، ص٤٣٤.

درێژایی چەند ساڵ سامانێکی زۆریان بۆ ڕۆژی ڕەش وەسەریەك ناوە، کە دواجار هێزە داگیرکەرەکان دەستیان بەسەردا گرت، بەمەش زیانێکی گەورەیان بە ژێرخانی ئابووری کوردستان گەیاندووە، چونکە بۆ خزمەتی دانیشتوان و بوژاندنەوەی کوردستان خەرجیان نەکردووە.

ئەو داهات و سامانەش کە خوارزمیەکان لە میانەی پرۆسەی داگیرکاری سەر کوردستان وەك تالآنی جەنگ دەستیان بەسەرداگرت، هێندە زۆربوو کەڕەنگە نەتوانرێت لەبەرزۆری و چەندبارە بوونەوەی پرۆسەکە ئاماژە بە بڕو ژمارەو جۆرەکانی بکرێت و بەوردی بخرێنە ڕوو، ، کاریگەری و شوێنەواری ئەو ڕەوشەش ئەوەندە خراپ بووە، کە هەر وەك سەرچاوەیەك ئاماژەی داوە، ئەوان هەرچی کەلوپەل هەبوو وەك تالآنی جەنگ دەستیان بەسەرداگرت و نەك تەنها شتێکیان لە سەر زەوی بەجێ نەهێشت، بەڵکو ئەوەش لە ناخیدا حەشاردرابوو و دەستیان بەسەردا گرت و وڵاتیان کردە کەلاوە[٩٩٥]، وەك تالآنکردنی شاری دقوقا ساڵی(٦٢٢ك/١٢٢٥ز)هەروەك(ابن الأثیر)کە هاوسەردەمی ڕووداوەکانە سەرباری باسکردنی ئەو تالآنکردن ونەهامەتیانەی بەسەر شارەکەیاندا هێناوە، باسی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی شارەکە دەگێڕێتەوە کە لە سەر دەستی خوارزمیەکان نەك هەر سامانەکەیان بەتالآنبردوە، بەڵکو ئەندامانی خێزانەکەشی لەناوچوون و خۆشی ئاوارەی شام بووە[٩٩٦]، وە هەمدان و شارە کوردنشینەکانی هەرێمی ئازربیجان و ئەرمینیاش لەسەر دەستی هەمان هێز تووشی تالآنکردنی زۆربوونەوە[٩٩٧]، (الراوندی) زیاتر لەوەش ئاماژەی داوە، کە دەڵێ: ((تەنانەت کەڵەشێرێکیشیان لە دوای خۆیان بەجێ نەهێشت کە سادەترین نیشانەی

---

[٩٩٥] الراوندي ، راحة الصدور، ص٥٥٢.

[٩٩٦] الكامل،ج١٠،ص ص٣٨٩-٣٩٠.

[٩٩٧] بڕوانە :ابن الأثير،الكامل،ج١٠،ص٣٩٤؛ابن كثير،البداية والنهاية،مج٦،ج١٢،ص١٩٦،ص٢١٣؛امین زکی،خلاصە،مج١،ل ل١٤٦-١٤٧.

ئاوەدانییە ))[998]، هەرچەندە ڕەنگە زیادەڕۆیی لەگێڕانەوەکەیدا هەبێ، بەڵام ڕادەی کاریگەری خراپ و وێرانکاری خوارزمیەکان دەردەخات لە کوردستاندا، بەم هۆیەشەوە لە ماوەیەکی کەمدا سامانێکی بێشوماریان کۆکردەوە[999].

تاڵانکردن و دەستبەسەرداگرتن بەشێك بوو لە نەریت و سرووشتی لەشکرکێشی مەغۆلیش[1000]، وەك تاڵانکردنی ماردین و نصیبین شارەکانی دی هەرێمی جزیرە، کەماڵ و سامانی لە ژمارە نەهاتووی دانیشتوانیان بەتاڵانبرد[1001]، وە بەتاڵانبردنی داهات و سامانی دانیشتوانی هەولێر و دەوروبەری و شارەکانی دی هەرێمی چیاکان لەکاتی هێرشەکانیان بۆسەر ئەو ناوچانە[1002]، بە تایبەت دوای داگیرکردنی بەغداو دەستگرتن بە سەر سامان و زێڕو و زیو و پارەی لە هەژمار نەهاتووی پێنج سەدە بە زۆر کۆکراوەی بنەماڵەی عەبباسی[1003]، هۆلاکۆ بڕیاری دروستکردنی خەزێنەیەکی تایبەتی لەسەر چیایەکی نێوان دەریاچەی ورمێ و سلماس دا، هەرچی کەلوپەلی گرانبەهاو زێڕو زیوی دەست بەسەرداگیراو بوو لە وڵاتی گرج و ئەرمینیا و کوردستان و عێراق لەو خەزێنە تایبەتیەدا کۆکرانەوە و بەشێکیشی بۆ مەنغۆلیا نارد[1004].

---

(998) راحة الصدور، ص٥٢٢.

(999) الراوندي، راحة الصدور، ص ص٥٥٢-٥٥٣.

(1000) ابو شامه، تراجم رجال القرنين السادس والسابع، ص١٩٨؛ ادوار بروي، تاريخ الحضارات العام، ص٣٦٤.

(1001) مؤلف مجهول، تاريخ الرهاوي،ج٢،ص٢٦٧؛النويري،نهاية الارب،ج٢٧،ص ص٢٣٤-٢٣٥.

(1002) ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص ص٢٠١-٢٠٢؛الذهبي،العبر،ج٥،ص١٣٢،ص١٣٦؛ابن دقماق،نزهة الانام،ص٨١،ص٨٣.

(1003) نصيرالدين طوسي،ذيل نصيرالدين طوسي،ج٢،ص٢٩٠؛الهمذاني،جامع التواريخ،مج٢،ج١،ص٢٩٢؛ابن خلدون،العبر،ج٥،ص٦٤٢.

(1004) الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٣٠٠.

بەم شێوەیە هەرچی ئەو گەنجینە گرانبەها و پارانەی لە لایەن هێزەکانەو دەستی بەسەردا گیرا، خەزێنەی تایبەتی خۆیان پێ دەوڵەمەند کردو و تفاقی سوپایەکی بەردەوامیشی بۆ مسۆگەر کردن، کە بە هۆیەوە درێژەیان بە پرۆسە سەربازیەکانیاندا، بەمەش زەمینەی زیاتریان بۆ رەخسا بۆ مەیداغوازی و دەستبەسەرداگرتنی ولاتان، لە بری ئەوەی ئەو پارانە بۆ بەکاربردن و دەستاودەستکردن و بنیاتنانی پرۆژەو بوژانەوەی ئابووری خەرج بکرێت، هەر ئەمانەش کاریگەری خراپیان هەبوو بۆ سەر کەمبوونەوەی پارە لە بازارەکان و دابەزینی ئاستی گەشەکردنی ئابووری و لاوازبوونی بازرگانی[١٠٠٥].

لەڕاستیدا جگە لە دەست بەسەرداگرتن و تالانکردن، دیارییە گران بەهاکانیش ببوونە ئەرك بەسەر میرە کوردەکانەوە، کە دەبوو بیدەن بەهەندێ لە هێزەکان، تا وای لێهاتبوو بوونە سەرچاوەیەکی داهات بۆ ئامادەکردنی تفاقی هێزی سەربازی پێیان، ئەگەرچی دیارییەکان ئامرازێك بوون بۆ گوزارشتکردن لە پەیوەندی دۆستایەتی نێوان هێزەکان و لە بۆنەو هەندێ کاتی تایبەتدا دەبەخشران[١٠٠٦]، بەلام بەشێك لەو دیاریانەی کە میرە کوردیەکان بە هێزەکانیان بەخشیوە، لە سنووری ئەو نەریتە دەرچوون و لەژێر کاریگەری جۆرێك لە سانسۆرو زۆرە ملێیدابوون، بە بەلگەی چەند بارەبوونەوەی دیاریەکان و هەندێکیشیان بۆ رەواندنەوەی مەترسی هێرشی هێزەکان بۆ سەریان بەخشراون، لە کاتێکدا دیاری لە کاتی ئاشتی و بە پێی خواست

---

[١٠٠٥] جگە لە سەردەمی ملکشاە کە بەشێکی لەداهات بۆ دروستکردنی قوتابخانەکان خەرجکرد، هۆلاکۆش بەشێکی لەوداهاتە بێژمارە بۆ دروستکردنی روانگەی مەراغە خەرجکردووە، ئەگەرنا کورد کەمترین سودی لەو دەستەکەوتانە کە هەر داهاتی خۆی بووە بینیوە.

[١٠٠٦] ولید مصطفى نجم، الأوضاع الإقتصادية، ص١٥١.

دەبەخشرێت[1007]، لەمبارەیەشەوە کورد لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزەکاندا زیانی لێکەوتووە، بە تایبەت ئەوە لە پەیوەندییەکانی نێوان کورد و سەلجوقیەکاندا تێبینی دەکرێت، وەك ئەو دیارییە گرانبەهاو زۆرانەی کە نصرالدولەی مەروانی بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەوایی بە سەلجوقیەکانی بەخشیوە، کە بەهاکەیان بە سەدان هەزار دینار خەمڵێنراوە[1008]، وە ئەو ماڵ و سامانە زۆرەی ساڵی (٤٤٦ك/١٠٥٤ز) هەریەك لە میر (وهسوزانی ڕەوادی و ابو اسواری شەدادی) بە سوڵتان طغرل بك یان بەخشی لەکاتی کشانی بەرەو ناوچەکانی ئازربیجان و ئاران[1009]، ئەمانەو چەندین نموونەی دی کە بە ڕێژەی زیاد و لە کاتی جیاوازدا بۆ سوڵتانە سەلجوقیەکان کراونەتە دیاری[1010].

هەموو ئەمانەش کاریگەری خراپیان کردۆتەسەر چارەنووس و دوارۆژی سیاسی و ئابووری میرنشینەکان و گوزەرانی دانیشتوان، چونکە سەرچاوەی بەشێکی زۆری کۆکردنەوەی ئەو دیاری و خەلاَتانە خەڵکی کوردستان بووە، بەمەش ئەرکێکی گران و بەردەوامیان لە سەر شان بووە، لە دیارترین ئەنجامە خراپەکانی ئەو نەریتەش نابوتبوونی خەزێنەی میرنشینەکان بوو، لە نموونەی میرنشینی مەڕوانی، بەهۆی ئەو دیارییە زۆرانەی کە نصرالدولە بەخشینی لە دیدارێکدا بە باڵوێزی سوڵتان (طغرل

---

[1007] ئاڵوگۆڕکردنی نامەو دیاری لەو جۆرە لە نێوان میرەکوردیەکان و بوەیهیەکانیشدا هەبووە، لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش و هاوکاریکردنی سیاسی و سەربازی یەکتری و بەستنی ئاشتینامەی نێوانیان، بۆ زانیاری لەمبارەیەوە بگەڕێوە: قادر محمد حسن، الإمارات الكردية، ص٨٠

[1008] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الجوزي، المنتظم، ج٨، ص٢٢٣؛ ابن العبري، تاريخ الزمان، ص ص٩٧-١٠١؛ ابن خلدون، العبر، ج٤، ص٣٨٣؛ عبدالسلام الماردينى،تاريخ ماردين،ص٤٣.

[1009] ابن الأثير،الكامل،ج٨، ص١١٦؛ ابو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج١، ص٥٢٨.

[1010] بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە، نیشتمان بەشیر، کوردو سەلجوقیەکان، ل٢٢٠.

بك)ی ڕاگەیاند کە شتێکی لەلا نەماوە بۆ سوڵتان بشێت[١٠١١]، ئەگەر ئەمە سیاسەتێکیش بووبێت بۆ خۆدەربازکردن لە داواکارییە زۆرەکانی نوێنەری سوڵتان، بەڵام بە دیوێکی دیدا لاوازبوونی خەزێنەکانی دەگەیاند لەوکاتەدا، ڕەنگە کاریگەری ئەو ڕەوشەش لە سەردەمی میر نظام الدین (٤٥٣-٤٧٢ك/١٠٦١-١٠٧٩ز) زیاتر بووبێت، چونکە کاتێك سوڵتان الب ارسلان ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) داوای پارمەتی لەمیری ناوبراو کرد، بڕی پارەی پێویستی نەبوو کە وەك دیاری پێشکەشی بکات، کە بڕەکەی سەدهەزار دینار بوو، بۆیە لە خەڵك کۆی کردەوە[١٠١٢]، دەشگونجێت میرەکانی مەڕوانی لە خەزێنەی بنەماڵەکەیان دیاریەکانیان نەبەخشیبن، بەڵکو لە خەڵك کۆیان کردبێتەوە، وەك تاکتیکێك بۆ ئەوەی هەندێ جار سوڵتانەکان بیانبەخشن، ئەو کارەی میر نظام الدین دەکرێت بەڵگەیەك بێت لەمبارەیەوە، چونکە سوڵتان بەخشی و بڕیاری گێرانەوە ئەو کەلوپەلە سادانەشیدا کە لە جوتیاران وەرگیابوون بۆ تەواوکردنی بڕی پارەی داواکراو[١٠١٣].

بەم شێوەیە ئەم جۆرە دیارییانە بوونە دیاردەیەك کە لە هەر بارودۆخێکدا سەلجوقیەکان داوای ماڵ و سامانیان لە میرە کوردەکان دەکرد، بەمەش ئەرکی سەرشانیان قورستربوو[١٠١٤]، سەرباری شوێنەوارە نابووریەکان کاریگەری کردە سەر لاوازبوونی دەسەڵاتی سیاسیشیان، بەم شێوەیە هەموو ئەو گۆڕانکاریە بەردەوامانەی بەسەر شێوازی کارگێڕی و سیاسەتی هێزەکاندا هاتووە، سەرباری شەڕو نابلۆقە بەردەوامەکانی سەرشارەکان و باجە جیاوازەکان و دیاری و بەرتیلەکان بۆ دوورخستنەوەی ئاگری شەڕ کاریگەری خراپیان کردۆتە سەرباری ژیانی خەڵك و

---

[١٠١١] ابن العبري، تاريخ الزمان، ص٩٧.

[١٠١٢] الفارقي، تاريخ الفارقي،ص ص١٨٧-١٨٨؛ ألاصفهاني،تاريخ دولة ال سلجوق،ص ص٢٠٥-٢٠٦.

[١٠١٣] البنداري،تاريخ دولة ال سلجوق،ص٣٩؛الدواداري،كنز الدرر،ص٣٩١.

[١٠١٤] نیشتمان بەشیر، کوردوسەلجوقیەکان، ل١٨٧.

ژێرخانی ئابووری کوردستان و بەرەو داڕوخانی بردووە[١٠١٥]، ستەم و چەوسانەوەو نزمی ئاستی گوزەران و هەژاری دانیشتوانیش لـە تایبەتمەندییـەکانی ئـەو جـۆرە بارودۆخـە بوون[١٠١٦].

## دووەم/ بڵاوبوونەوەی دراوی بێگانە:

شوێنەوارێکی دی ئابووری لەشکرکێشیەکان بڵاوبوونـەوەی دراوی هەنـدێ لـەهێزە داگیرکەرەکانی لە کوردستان کردۆتە دیاردەیەکی ناسراو(ئەمری واقیع)، جا چ بە هۆی پەیوەندی و مامەڵەی بازرگانییـەوە بووبێـت، یـان سیاسـەتی ئـابووری هێزەکـان وای خواستووە بۆئەوەی سیستەمی نەختی خۆیان بەسـەر ناوچـە داگیرکراوەکانـدا پایـەدارو پتەوبکەن، یەکێکیش لەو ڕێبازانەی بۆ ئەنجامدانی ئـەو تێڕوانینـە گرتیانەبـەر ڕەواج پێدانی سیستەمی یەك دراوی بوو لە سەرانسەری قەڵەمڕەوییان، وەك دینـاری بـویهی سەردەمی رکن الدولە کە بە(الرکنیە) ناسراوە و بە شێوەیەکی بەربڵاو لـە کوردسـتان بڵاوبۆتەوەو مامەڵەی پێکـراوە[١٠١٧]، وە دراوی سـەلجوقی کـە لەسـەر شـێوازی دراوی عەبباسی لێدەدراو هەمیشە لە پاڵ ناوی خەلیفە ناوی سوڵتانی فەرمانڕەوای لە سـەر نەخشکراوە[١٠١٨]، لەسەرانسەری قەڵەمڕەوییان تا سنووری قەفقاسیا بڵاو بۆتەوە[١٠١٩]، هەندێ جاریش لەکاتی سەرهەڵدانی کێشەو گرفتی داراییـدا هـەوڵی لێـدانی دراوی تازەو پەیڕەوکردنی سیستەمی یەك دراویان داوە، وەك ئەو هـەنگاوەی سـوڵتان (طغـرل

---

[١٠١٥] عماد الدين خليل، الإمارات الأرتقية، ص ص٤٠٣-٤٠٤؛ ص٤٣٧.

[١٠١٦] الفارقي،تاريخ الفارقي،ص٢٠٤.

[١٠١٧] آكو برهان، التجارة والنظم المالية، ص ص٢٦٧-٢٦٨.

[١٠١٨] المقريزي،النقود الاسلامية،ص٢٠٨؛ محمد عبدالعظيم، السلاجقة، ص١٣٨.

[١٠١٩] تامارا رايس، السلاجقة، ص١٣٣.

کوڕی محمد)(٥٢٦-٥٢٧ك/١١٣١-١١٣٢ز) نـای بـۆ مامەڵـەکردن و یەکخستنی دراوی هەموو عێراق و خوراسان[١٠٢٠].

لەسەردەمی ئیلخانیەکانیشدا سەرباری پەیڕەوکردنی ئەم سیاسـەتە، شـێوەو بـەهاو نرخی دراوەکان بە پێی کـات لـە گۆڕانـدابووە[١٠٢١]، کـە ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ناجێگیری بارودۆخی سیاسی و ئابووری بەتایبەت ئەم کێشەیە هەرێمی جزیرەی گرتەوە، بەهۆی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان مەمالیك و مەغۆلەکان، کە زیانی زۆریـشی بـە ژێرخانی ئابووری هەرێمەکە گەیاندووە[١٠٢٢]، ئـەوەی جێگـای سـەرنجە لـەو ماوەیـەدا زیادبوونی مامەڵەی بازرگانییە بە درهەمی زیوو فلسی مس و کەمبوونەوەی دینـاری زێڕە[١٠٢٣]، کە دەکرێت هۆکارەکەی بۆ کەمبوونەوەی ڕێـژەی زێـڕ لـە ناوچـەکەداو بـۆ تالآنکردن و دەستبەسەرداگرتنی لەلایەن مەغۆلەکانـەوە بگەڕێتـەوە، بەتایبـەت کـە هۆلاکۆ بڕیاری گواستنەوەی هەرچـی بـڕی زێـڕە بـۆ ئازربیجانـدا[١٠٢٤]، وەبـەهۆی نـا جێگیری بارودۆخی بازاڕو ناچوونیەکی دراو و گۆڕینی شێوازو بـەهای ئـاڵوێری بـەپێی نرخی زێڕ لەبازاڕدا و لێدانی دراوی تازە، خەڵك زیـانی زۆریـان لێکـەوتووە و هەنـدێ جاریش سەریکێشاوە بۆ بەرزبوونەوەی بەهای شـمەك و کـاڵا پێویـستیەکان، کارەسـاتی مرۆیشی لەدوای خۆی خولقاندووە[١٠٢٥]، ئیلخانیەکان لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی ئـەو

---

[١٠٢٠] البنداري،تاريخ دولة ال سلجوق،ص ص١٤٩-١٥٠.

[١٠٢١] ئیلخانیەکان لە هەریەك لە موصڵ و هەولێر سنجارو ماردین سکەیان لێداوە، بە قـەبارەو بـەهای جیاواز لە نرخی زێڕو زیو، بڕوانە: علاء محمود خليل، المغول في الموصـل، ص ص١٩٠-١٩١؛علـي عـادل حسين، أربيل،ص٢٦١.

[١٠٢٢] علاء محمود خليل، المغول في الموصل، ص١٨٩.

[١٠٢٣] ابن الفوطي، الحوادث الجامعة،ص٢٩٨.

[١٠٢٤] الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١،ص٣٠٠.

[١٠٢٥] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص ص٣٠٦-٣٠٧.

گرفتانە بڕیاری یەکخستنی دراویانداوە، بۆ چەسپاندنی ئەو سیستەمەش شێوازێکی ناچاری و زۆرەملێی گیرایە بەر، تەنانەت هەڕەشەی کوشتنیان لە هەر کەسێك کرد کە لە سەرانسەری وڵاتدا مامەڵە بەو دراوە نەکات، کە دراوێکی کاغەزی شێوە لاکێشەیی و بە (چاو) ناسرابوو، لە ساڵی (٦٩٣ك/١٢٩٣ز) لە تبریز لێدراوە[١٠٢٦]، سوڵتان غازانیش هەنگاوێکی گرنگی لەم بارەیەوە نا، لەپێناو بوژانەوەی ئابووری و یەکخستنی دراو و ڕێگرتن لە ئەگەری فێڵکردن و تەزویرکردن و کارکردن بە یەکجۆرە دراو لە سنووری قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیلخانیدا[١٠٢٧]، بۆ ئەم مەبەستەش ساڵی (٦٩٨ك/١٢٩٨ز) بڕیاری لە سەر لێدانی درهەمی زێڕو زیودا، بەهاوسەنگکردنی بەهاو نرخ و کێشی لەگەڵ زێڕ لە بازاڕدا، لەو هەنگاوەشی خەڵك بەهرەمەندبوو[١٠٢٨]، دەشێ بەشێك لەو گۆڕانکاریانەش کوردستانی گرتبێتەوەو سود و زیانەکانی بەرکەوتبێت، لەبەرئەوەی بەشێك بووە لە سنوری قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە.

هەروەها دراوی سامانیەکان و فاتمیەکانیش لە کوردستان بڵاوبۆتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە چەند دینارێکی ئەو هێزانە لەلایەن لیژنەیەکی شوێنەوارناسی ساڵی (١٩٧٣ز) لە ناوچەی (یاسین تەپە)ی دەشتی شارەزوور دۆزراوەتەوە، کە لە کیسەیەکدا هەڵگیرابوون و بری پەنجاوچوار دیناری فاتمی و دوو دیناری سامانی و دینارێکی بوەیهی و پێنج دیناری سەلجوقی و حەوت دیناری عەبباسی تێدابووە، توێژەرێکیش ئەمە بۆ پەیوەندی سیاسی و دارایی نێوان میرنشینەکانی حسنویهی و عنازی لەگەڵ ئەو هێزانە و پێویستی دانیشتوان بە دراوی بێگانە بۆ مامەڵەی ڕۆژانەیان

---

[١٠٢٦] ابن الفوطي،الحوادث الجامعة،ص ص٣٢٤-٣٢٥؛المقريزي،النقود الاسلامية،ص ص٢٧٦-٢٧٧؛القزويني،لب التواريخ،ص١٤٤.

[١٠٢٧] ابن الفوطي، الحوادث الجامعة،ص٣٣٦؛جعفر حسين خصباك، العراق في عهد المغول الإلخانيين، ص١٢٣.

[١٠٢٨] ابن الفوطي، الحوادث الجامعة، ص٣٣٦؛كارل بركلمان،تاريخ الشعوب الاسلامية،ص٣٩٢.

گێڕاوەتەوە[١٠٢٩]، لە پاڵ ئەمانەدا دەبێت ڕۆڵی لەشکرکێشییەکان لەبەرچاوبگرێت هەروەك ئاماژەماندا، کە هۆکارێکی دی بڵاوبوونەوەی دراوەکانیان بوون، بەهەر جۆرێك بێت کاریگەری ڕووداوەکان بەسەر بارودۆخی ئابووری کوردستانەوە دەردەخات.

بەهەرحاڵ هێزە داگیرکەرەکان بە گرتنەبەری میکانیزمی جیاواز بوونە میراتگری کورد لەسەر حیسابی خەڵك میرو سوڵتانەکان و کەسانی دەربار و داروودەستەی خۆیان لە سامانی زۆرو زەبەندی کوردستان بەهرەمەند بوون و سودیان بینیووە، زۆری و جۆراوجۆری باجەکان و دیاری و بەرتیلەکانیش بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانیان و ئامادەکردنی تفاقی سوپاکانیان باری سەر شانی خەڵکیان قورسترکردووە و بایەخ بەچاککردنی بارودۆخیشیان نەدراوە، هەموو ئەمانەش ڕسکاوی لەشکرکێشی هێزە داگیرکەرەکان بوو.

---

(١٠٢٩) اسماعيل حسين حجارة،النقود المكتشفة في ياسين تپه، مجلة مسكوكات،(بغداد:١٩٧٥)،العددالسادس،ص ص٧٢-٨٤؛قادر محمد حسن، الإمارات الكردية، ص١٦٥.

# بەرئەنجام

لێکۆڵینەوە لە لەشکرکێشیەکان وشرۆڤەکردنی ئەو ڕوداو پێشهاتە جۆراو جۆرانەی کەلەبەرئەنجامیان کەوتونەتەوە، بەچەند ئەنجامێکیان گەیاندین، کەلەچەند خاڵێکدا کورتیان دەکەینەوە.

١-هەڵکەوتەی جوگرافی وسروشتی پڕ خێر و بێری کوردستان، فاکتەرێکی سەرنج ڕاکێش بووە بۆ هێزەکان، کەلەهەوڵی دەست بەسەرداگرتنی دابن.

٢-بارودۆخی داسەپاوی ژێر دەسەڵاتی عەبباسی، زەمینەی بۆ هەندێ لەهێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی رەخساند، کەدەرفەت لەو بارودۆخە وەربگرن وشێوە سەربەخۆی خۆیان ڕابگەیەنن، دواتریش بیری فراوانخوازی وای لێکردن هەوڵی داگیرکردنی ناوچەکانی دەورروبەریان لەوانەش کوردستان و تا بەغداش بدەن، کەواتە ئەو بارودۆخە داگیرکاریەی بەسەر کورد هاتووە، لەسەرێنی تەنها هۆکارێکەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو چەند فاکتەرێکی جۆراوجۆری ڕاستەوخۆو ناراستەوخۆ لەپشت دروستبونیدا هەبووە، لەخراپی ڕەوشی ئابووری هەندێ لەهێزەکان ونەبونی دەرفەتی کار و تێکچونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی, هەوڵدان بۆ رزگاربون لەو بارودۆخە بیری داگیرکردنی وڵاتانی لادروستکردن.

٣-ئەو بارودۆخە سیاسیەی کەلەدەرئەنجامی پراکتیزەکردنی بیری سیاسی هێزەکان هاتە ئاراوە، لەپیادەکرنی بیرۆکەی(سێبەری خوا وسوڵتانی سەر هەموو جیهان ...), سەرهەڵدانی هەندێ دیاردەو مۆدێلی سیاسی بەدوای خۆیدا هێنا، کەهەندێ جار بۆ کورد سود بەخش وهەندێ جاریش کارەساتیان خولقاندوە.

٤-هەلومەرجی دوای لەشکرکێشیەکان، بەتایبەتیش بوەیهیەکان، دەرفەتی وای دروستکرد کەهێزە خۆجێیەکان فۆرمی حوکمڕانیان لەدەسەڵاتێکی خێڵەکیەوە بگۆڕن بۆ سیاسی و لەچوارچێوەی میرنشینددا بەرجەستەی بکەن، لەوێشەوە هەندێ لەبنەماڵە خێڵەکیەکانی کورد بۆیەکەم جار وەك دەوڵەتۆکە لەسەرچاوەکاندا ئاماژەیان پێکراوە.

٥-سەرنەکەوتنی میرنشینە کوردیەکان لە بەرگریکردن لەدەسەڵاتی شێوەسەربەخۆی خۆیان وکەوتنە ژێر کاریگەری هەژموونی سەربازی هێزە بێگانەکان، نایەکگرتوویی ونەبوونی هەستی یەکێتی وبێ نەخشەیی میرە کوردەکان نیشاندەدات، بەخوگرتویشیان لە پەیڕەوکردنی هەندێ نەریتی سەربازی چارەنوسیانی بەرەو لەناوچوون برد.

٦-ڕەوشی سەربازی خولقاوی ناو کوردستان، بەتەنها ئاسایشی مرۆڤی کوردی نەخستۆتە مەترسیەوە، بەڵکو شوێنکاری نەرێنی لەسەر دەرونیشیان داناوە، ئەوەش لەخۆشەویستیان بۆ شەڕ وپەرەدان بەگیانی جەنگاوەری وقوڵبوونەوەی پەیوەندی دوژمنایەتی خێڵەکی بەدیاردەکەوێت، کەتائێستاشی لەگەڵدابێت بەقوڵی ڕەگی بەنێو گۆمەڵگەدا چۆتە خوارەوە.

٧-هێزە داگیرکەرەکان بەوئالیەت وئامرازە جۆراوجۆرانەی بۆ سەپاندنی ئیرادەی خۆیان گرتبویانەبەر، لەلایەك کوشتن وئاوارەکردن وکاولکردنی ماڵ وحاڵی خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەی لێکەوتەوە، لەلایەکی دیش بۆتە هۆی کۆچی سەدان هۆزومالّباتی ڕەگەزی بێگانە بۆ ناوچە کوردنشینەکان، بەجۆرێك دیموگرافیای هەندێ شاریان بەتەواوی گۆڕیوە.

٨-هاتنی بێگانەکان وتێکەڵبونیشیان بەکورد، بەرکەوتنێکی کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە، ڕەنگدانەوەی ئەویش بەسەر داب ونەریت وکەلتورو زمانی کوردیەوە دیارە، ناوێتە بوونی بیروتوانای هەردولاش هەل ومەرجێکی هێناوەتە ئاراوە، کەتیایدا زانست وزانیاری پێشکەوتن وگۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەکردنەوەی قوتابخانەکانی(نڤامیە)ش یەکەم شێوازی زانستی بە فۆرمێکی نوێ لەکوردستان سەریهەڵدا.

٩-هەرچی ململانێ ی ئایینی ومەزهەبیشە ڕۆڵی لەکەوتنە ژێرکاریگەری کورد هەبوو بۆ ڕێباوەڕی هەندێ لـەهێزەکان، ئەمـەش لەبڵاوبونـەوەی مەزهـەبی(شـیعە)لەچـەند ناوچەیەکی کوردستان وبەشافیعی مانەوەی زۆرینەی کورد کەبەکاریگـەری کردنـەوەی قوتابخانەکانی(نڤامیە)دەزانرێت، دەردەکەوێت.

١٠-دەکرێ سەرهەڵدان وگەشەکرنی سۆفیزمی کـوردیش پەیوەندیـەکی بـەهێزی بـەو بارودۆخـە داسـەپاوە کۆمـەڵایـەتی وئابوریـەوە هـەبوبێ، کەلـەژێر سـایەی هێـزە داگیرکەرەکان هاتە ئاراوە، ئەویش وەك نارەزایـەك بەرامبـەر بەرۆچـونی دەسـەڵاتداران بەژیانی ئارەزوبازی وشەڕ وململانێ ئایینی ومەزهەبیەکان، بەگرتنەبەری ئەو ڕێگایـە وبۆخۆدوورە پەرێزگرتن لەوڕەوشە سۆفیەکان ویستیان ژیانی هەژاری و دونیا نەویستی هەڵبژێرن.

١١-ژیـانی ئـابوریش بەپرۆسـەی لەشکرکێـشیەکان وئـەو پێـشهاتانەی دوای لەشکرکێشیەکان هاتە ئاراوە کاری تێکرا، گوێنەدانی هێزەکان بەباری گوزەرانی خەڵك وتێکدانی پڕۆژەکـان وزیـادکردنی بـاج وسـەرانە وپـەرەدان بەلەشکرسـازی دەرەبـەگی لەلایەن داگیرکارانەوە, ڕۆڵی هەبووە لەپـەرەگرتن وگەشـەکردنی مێژوویانـەی ڕژێمـی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا، زیانی زۆریشی بەژێرخانی ئابووری کوردستان گەیاندووە.

١٢-کەمبونەوەی دەستی کارو پەرەسەندنی هەژاری وناهەمواری ژیان زۆر جـار سـەری کێشاوە بۆ برسیەتی وقـاتوقڕی، کـەوەك بـەهێزترین دوژمنـی شـاراوەی مـرۆڤ سـەری دەرهێناوە وتەنگی بەژیان هەڵچنیوە، ئەمەش کوردی خستۆتە ژێرباری کرێ گرتـەیی وهەندێ جاریش بۆ کاری ڕێگری وتالانکاری.

١٣-سەرباری کاریگەری خراپیان لەسەر بازرگانی، بەڵام لەگەڵ جێگیربوونی بارودۆخی گشتیدا ونەمانی بەربەست وپەیڕەوکردنی سیـستەمی یـەك دەوڵـەتی، کـاری هێنـان وبردنی کاڵاکانی لەنێوان ناوچە دوور مەوداکاندا ئاسانکردوە، لەم بارەیەشەوە بازرگانی

گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەشێکی بڵاوبونەوەی دراوی بێگانەش لە کوردستاندا لەسەرڕێنی ئەو گۆڕانکاریانەوە بووە.

١٤-پیشەگەریش وەك هەر لایەنێکی دی کەوتۆتە ژێر کاریگەری لەشکرکێشیەکان وپێشەوەچونی دیاری لەسەر تەرزی بێگانە بەخۆوە بینیووە،لەداوێنیشیدا پیشە دەستیە خۆمالّیەکان بەرەو پوکانەوە چوون.

# لیستی سەرچاوەکان

*قورئانی پیرۆز.

**یەکەم/ سەرچاوە ڕەسەنەکان :**

**أ- بەزمانی عەرەبی :**


**ابـن الاثـير** :عزالـدين ابـي الحـسن علـى بـن ابـي الكـرم محمـد بـن محمـد الشيباني(ت٦٣٠ه/١٢٣٢م).

-التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية(بالموصل) ،تحقيق عبداالقادر احمد طليمات نلتزم الطبع والنشر دار الكتب الحديثة

القاهرة ،مكتبة مثنى،(بغداد:١٩٦٣).

-الكامل في التاريخ، حققه واعتنى به عمر عبدالسلام التدمري ، دار الكتب العربي، (بيروت:٢٠٠٦).

**الادريسي** :محمد بن محمد بن عبدالله بن ادرسي(ت٥٦٠ه/١١٦٥م).

-نزهة المشتاق في اختراق الافاق ،مكتبة الثقافة الدينية،(القاهرة:٢٠٠٢).

**الاربلي** :عبدالرحمن سنبط قنيتو(ت٧١٧ه/١٣١٧م).

-خلاصة الذهب المسبوك مختصر من سيرالملوك،وقف على طبعه وتصحيحه مكي سيدجاسم ،مكتبة

المثنى،(بغداد :دت).

**الازدي** :شيخ ابي زكريا يزيد بن محمد بن اياس (ت٣٣٤ه/٩٤٥م).

-تاريخ الموصل،تحقيق وتكملة احمدعبدالله محمود ،دار الكتب العلمية،(بيروت:١٩٧١).

**الاصفهاني** :عمادالدين محمد بن محمدبن حامد(ت٥٩٧ه/١٢٠٠م).

-تاريخ دولة ال سلجوق،قراه وقدم له يحيى مراد ،دار الكتب العلمية،(بيروت:١٤٢٥ه/٢٠٠٤م).

**ايليا برشينايا**(ت٤٣٧ه/١٠٤٥م).

-تاريخ ايليا برشينايا ،عربه وقدم له وعلق عليه يوسف حبي ،(بغداد:١٩٧٥).

**ابن بطوطة**:محمد بن عبدالله بن ابراهيم اللواتي الطنجي(ت٧٧٩ه/١٣٧٧م).

-رحلة ابن بطوطة المسماة تحفة النظار في غرائب الامصار وعجائب الاسفار،اعتنى به وراجعه درويش الجويدي ،المكتبة العصرية ،(بيروت:٢٠٠٧).

**البغدادي** :الامام ابومنصور عبدالقاهر بن طاهر بن محمد(ت٤٢٩ه/١٠٣٧م).

-الفرق بين الفرق،تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد،دار الطلائع ،(القاهرة:٢٠٠٥).

**البنداري** :الفتح علي بن محمد البنداري الاصفهاني(ت ٦٤٣ه/١٢٤٥م).

-تاريخ دولة ال سلجوق ،دار الافاق جديدة ،ط٢،(بيروت:١٩٧٨م).

**ابن تغري بردي** :جمال الدين ابي المحاسن يوسف بن تغريبردي الاتابكي (ت٨٧٤ه/١٤٧٠م)

-النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة،مكتبة دار الكتب المصرية ،(القاهرة:١٩٣٥).

**الثعالبي**:ابومنصور عبدالملك بن محمد بن اسماعيل(ت٤٢٩ه/١٠٣٧م).

-ثمار القلوب في المضاف والمنسوب ،تحقيق محمد ابو فضل ابراهيم،دار النهضة المصرية ،(القاهرة:١٩٦٥).

**ابن جبير** :ابي الحسن محمدبن احمد بن جبير الكناني الاندلسي(ت٦١٤ه/١٢١٧م).

-رحلة ابن جبير،تحقيق ابراهيم شمس الدين ،دار الكتب العلمية ،(بيروت:٢٠٠٣).

**الجرجاني**:على بن محمد بن على الحسينى(ت٨١٦ه/١٤١٣م).

-التعريفات،مكتبة لبنان،(بيروت:١٩٨٥).

**ابن الجوزي** :الإمام ابي الفرج عبدالرحمن بن علي ابن محمد بن علي (ت٥٩٧ه/١٢٠٠م).

-المنتظم في تاريخ الملوك والامم ،مطبعة دائرة المعارف العثمانية،حيدراباد ،(دكن:١٣٥٩ه).
**الجويني** :عطاء ملك،(ت٦٨١ه/١٢٨٢م).
-تاريخ فاتح العالم جهانطشاي،ترجمة محمد التونجي ،دار الملاح للطباعة والنشر،(دم:١٩٨٥م).
**الحسيني**:صدرالدين ابوالحسن علي بن ناصر الحسيني،(ت بعد٦٢٢ه/١٢٢٥م).
-زبدة التواريخ اخبار الامراء والملوك السلجوقية ،تحقيق محمدنورالدين،دار اقراء،(بيروت:١٩٨٦م).
**ابن حمدون** :محمد بن الحسين بن علي(ت٥٦٢ه/١١٦٧م).
-التذكرة الحمدونية ،تحقيق احسان عباس وبكر عباس ،دار صادر،(بيروت:١٩٩٦م).
**الحموي** :ابي الفضائل محمد بن علي بن نظيف(ت٦٤٤ه/١٢٤٦م).
-التاريخ المنصوري تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان ،عني بنشره وتحقيق ابوالعيد دودو،مراجعة عدنان
درويش ،مطبعة حجاز ،(دمشق:١٩٨١م).
**ابن حوقل**: ابي القاسم النصيبي(ت٣٦٧ه/٩٧٧م).
-صورة الارض ،منشورات دار مكتبة الحياة ،(بيروت:١٩٧٩م).
**ابن خلدون**:ابوزيد عبدالرحمن بن خلدون(ت٨٠٨ه/١٤٠٥م).
-المقدمة ،دار الذهبية ،(القاهرة :دت).
-تاريخ ابن خلدون المسمى كتاب العبر وديوان المبتداء والخبر في ايام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي
السلطان الاكبر ،دارالكتب العلمية ،(بيروت:١٩٧١م).
**ابن خلكان**:ابي العباس شمس الدين احمدبن محمدبن ابي بكر(ت٦٨١ه/١٢٨٢م).

-وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان،تقديم محمدعبدالرحمن المرعشلي،اعدفهارسها رياض عبدالله عبدال هادي ،دار
احيا التراث العربي ،(بيروت:١٩٩٧م).
**ابن دحية** : عمر بن ابي علي حسن بن علي معروف بذي النسبين دحية والحسين(ت٦٣٣ه/١٢٣٥م).
-كتاب النبراس في تاريخ خلفاء بني العباس ،صححه وعلق عليه عباس عزاوي ،مطبعة المعارف ،(بغداد:١٩٤٦م).
**ابن دقماق**:صارم الدين ابراهيم محمدبن ايدمر العلائي(ت٨٠٩ه/١٤٠٦م).
-نزهة الانام في تاريخ الاسلام ،تحقيق سمير طباره ،المكتبة العصرية ،(بيروت:دت).
**الدواداري**:ابوبكر بن عبدالله بن ايبك(ت٧٣٦ه/١٣٣٥م).
-كنز الدرر وجامع الغررة الدرر المضيئة في اخبار الدولة الفاطمية،ج٦،تحقيق صلاح الدين منجد،(القاهرة:١٩٦١م).
**الديار بكري** :حسين بن محمد حسن ،(ت٩٩٠ه/١٥٨٢م).
-تاريخ الخميس في احوال انفس النفيس،مؤسسة الشعبان ،(بيروت:دت).
**الذهبي**:الامام شمس الدين ابي عبدالله محمد بن احمد بن عثمان الذهبي(ت٧٤٨ه/١٣٤٧م).
-تاريخ الاسلام ووفيات المشاهر والاعلام،تحقيق عمر عبدالسلام تدمرى،دار الكاتب العربى،(بيروت:٢٠٠٣م).
-دول الاسلام،حققه وعلق عليه حسن اسماعيل مروة ،قراه وقدم له محمود الارناؤط،دارصادر،(بيروت:١٩٩٩م).
-العبر في خبر من غبر ،تحقيق صلاح الدين منجد،مطبعة حكومة الكويت،(الكويت:١٩٦٦).
**الراوندي** :محمدبن علي بن سليمان الراوندي(ت٦٠٣ه/١٣٠٧م).

-راحة الصدور وآية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية ،نقله الى العربية ابراهيم امين الشورابي ،عبدالمنعيم
محمدحسنين،فؤاد عبدالمعطي الصياد ،دار القلم ،(القاهرة :١٩٦٠م).
ابن رسته:ابي علي احمدبن عمر(ت٣١٠ه/٩٢٢م).
-الاعلاق النفيسة ،دار احياء التراث العربي،(بيروت:دت).
الروذراوري:ابي شجاع محمد الحسين بن محمد بن عبدالله(ت٤٤٨ه/١٠٥٦م).
-ذيل تجارب الامم ،ملحق بكتاب(تجارب الامم) ،دار الكتب العلمية ،(بيروت: ٢٠٠٣).
الرهاوي المجهول(ت٦٣٢ه/١٢٣٤م).
-تاريخ الرهاوي المجهول،عربه ووضع حواشيه الاب البير ابونا ،مطبعة شفيق ،(بغداد:١٩٨٦).
سبط ابن الجوزي:شمس الدين ابي المظفر يوسف قزاوغلي بن عبدالله البغدادي(ت٦٥٤ه/١٢٥٦م).
-مراة الزمان في تاريخ الاعيان الحقبة(٣٤٥-٤٤٧ه) ،دراسة وتحقيق جنان جليل محمد الهموندي ،الدار الوطنية,(بغداد:١٩٩٠).
السبكي:تاج الدين ابي النصر عبدالوهاب بن عبدالكافي(ت٧٧١ه/١٣٧٠م).
-طبقات الشافعية الكبرى ،تحقيق مصطفى عبدالاقادر احمد عطا ،دار الكتب العلمية ،(بيروت:١٩٩٩).
السهروردي:شهاب الدين ابى حفص عمر بن محمد(ت٦٣٢ه/١٢٣٤م).
عوارف المعارف،ضبطه وصححه محمدعبدالعزيز الخالدى،دار الكتب العمية،(بيروت:٢٠٠٥).
السيوطي:الامام جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر(ت٩١١ه/١٥٠٥م).
-تاريخ الخلفاء،حققه وقدم له الشيخ قاسم الشماعي الرفاعي،الشيخ محمدالعثماني شركة دار الارقم بن ابي الارقم،(دمشق:دت).

ابو شامة :شهاب الدين ابي محمدعبدالرحمن بن اسماعيل المعروف بابي شامة الدمشقي(ت٦٦٥ه/١٢٦٦م).
-تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف بالذيل على الروضتين،عرف الكتاب وترجم للمؤلف وصححه محمد زاهد بن الحسن الكوثري، ،دار الجيل،(بيروت:دت).
-الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية ،تحقيق محمد حلمي محمداحمد،ج١ ق١ ،مطبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر ،(القاهرة:١٩٥٦).
-نزهة المقلتين فى السيرة الدولتين العلائية والجلالية،تحقيق وتقديم سهيل زكار،دار التكوين،(دمشق:٢٠٠٨م).
ابن شداد :بهاء الدين ابو المحاسن يوسف بن رافع(ت٦٣٢ه/١٢٣٢م).
-النوادرالسلطانيةوالمحاسن اليوسفية(سيرة صلاح الدين),تحقيق محمدحسني مصطفى،دارالقلم العربي، (حلب:٢٠٠١م).
ابن شداد:عزالدين محمد بن علي،(ت٦٨٤ه/١٢٨٥م).
-الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة ،ج٣ ق١ ،تحقيق يحيى عبادة ،وزارة الثقافة والارشادالقومي،(دمشق:١٩٧٨).
الشيرازي:المؤيد فى الدين هبة الله بن موسى بن داود (٤٧٠ه/١٠٧٨م).
-ديوان المؤيدالدين داعى الدعاة،تقديم وتحقيق محمد كامل حسين،دارالكاتب المصرى،(القاهرة:١٩٤٩)
-سيرة المؤيد فى الدين ،تحقيق محمد كامل حسين،دارالكاتب المصرى،(القاهرة:١٩٤٩م).
الصابي:ابي الحسين هلال بن محسن بن ابراهيم(ت٤٤٨ه/١٠٥٦م).
-تاريخ الصابي،ج٨ ،ملحق بكتاب( تجارب الامم) ،دارالكتب العلمية،(بيروت:٢٠٠٣).
-رسوم دار الخلافة،تحقيق ميخائيل عواد ،مطبعة العانى،(بغداد:١٩٦٤).
الصفدي :صلاح الدين خليل بن ايبك(ت٧٦٤ه/١٣٦٢م).

-الوافي بالوفيات ،تحقيق واعتناء به احمد الارناؤط و تركي مصطفى،دار احياء التراث العربي ،(بيروت:٢٠٠٠).

**الصولي** :ابي بكر محمد بن يحيى(ت ٣٣٥هـ/٩٤٦م).

-اخبار الراضي بالله و المتقي لله اوتاريخ الدولة العباسية من سنة ٣٢٢-٣٣٣،عني بنشره ج.هيورث.دن،دار المسيرة ،(بيروت:١٩٧٩).

**الطرطوشي** :ابي بكر بن وليد الفهري(ت٥٢٠هـ/١١٢٦م).

-سراج الملوك ،حققه محمد فتحي ابوبكر،تقديم محمد شوقي ضيف ،دار المصرية اللبنانية،(د.م:٢٠٠٦).

**ابن الطقطقي**:محمد بن علي طباطبا(ت٧٠٩هـ/١٣٠٩م).

-الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية,راجعه محمدعوض وعلي جارم بك,مطبعة معارف،ط٢،(مصر:دت).

**ابن عبدالحق** :صيف الدين عبدالمؤمن بن عبدالحق البغدادي(ت٧٣٩هـ/١٣٣٨م).

-مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة والبقاع،تحقيق علي محمدالبجاوي،دار احياء الكتب العربية،(د٠م:١٩٥٤).

**ابن العبري** :ابي فرج جمال الدين(ت٦٨٥هـ/١٢٨٦م).

-تاريخ الزمان،نقله الى العربية الاب اسحق ارملة ،قدم له جان موريس فييه ،دار مشرق،ط٢،(بيروت:١٩٨٦).

-تاريخ مختصر الدول ،وقف على تصحيحه الاب انطون صالحاني اليسوعي ،دار الرائد اللبناني ،ط٢،(دم:١٩٩٤).

**ابن العديم** :كمال الدين ابي القاسم عمر بن احمد(ن٦٦٠هـ/١٢٦٢م).

-بغية الطلب في تاريخ الحلب ،عني بنشره وعلق عليه عل سويم،مطبعةالجمعية التاريخية التركية ،(انقرة:١٩٧٦).

**ابن عرب شاه**:احمدبن محمد(ت٨٥٤هـ/١٤٥٠م):

-فاكهة الخلفاء ومفاكهة الظرفاء،في دير الاباء الدومنكيين،(الموصل:١٨٦٩).
ابن العماد الحنبلي :ابي الفلاح عبدالحي بن العماد (ت١٠٨٩هـ/١٦٧٨م).
-شذرات الذهب في اخبار من ذهب،دارالكتب العلمية(بيروت:د.ت).
ابن العمراني :محمدبن علي بن محمد،(ت في حدود ٥٨٠هـ/١١٨٤م).
-الانباء في تاريخ الخلفاء ،تحقيق قاسم السامرائي،(لايدن:د.ت).
العمري :شهاب الدين احمد بن فظل الله (ت٧٤٩هـ/١٣٤٨م).
-مسالك الابصار في ممالك الامصار ،السفر الثالث ممالك الشرق الاسلامي والترك ومصر والشام والحجاز،تحقيق احمد عبدالقادر الشاذلي ،المجمع الثقافي ،(ابوظبي:٢٠٠٣).
-مسالك الابصار في ممالك الامصار ،تاريخ العالم الاسلامي في العصر العباسي ،السفر السادس والعشرون،تحقيق حمزة احمد عباس، (ابوظبي:٢٠٠٥).
العيني :بدرالدين محمود (ت٨٥٥هـ/١٤٥١م).
-السيف المهند في سيرة الملك مؤيد،حققه وقدم له فهيم محمد شلتوت،راجعه محمد مصطفى زيادة ،دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، (القاهرة :١٩٦٦-١٩٦٧م).
-عقد الجمان في تاريخ اهل الزمان(عصرالسلاطين المالك)،حققه ووضع حواشيه محمدمحمدامين،الهيئة العامة المصرية للكتاب، (القاهرة:١٩٨٧).
الفارقي :احمدبن يوسف علي بن الازرق(٥٧٢هـ/١١٧٦م).
-تاريخ الفارقي،حققه وقدم له بدوي عبدالطيف،راجعه محمد شفيق غربال،الهيئة العامة لشؤن الطابع الاميرية, (القاهرة:١٩٧٩).
-تاريخ امد وميافارقين،تحقيق سهيل زكار ،الموسوعة الشامية في تاريخ الحروب الصليبية،ج١١،(دمشق:١٩٩٦).
ابي الفداء: عماد الدين اسماعيل بن علي بن محمود ابن عمر شاهنشاه بن ايوب(ت٧٣٢هـ/١٣٣١م).

